کەریمی حیسامی

# لە بیرەوەرییەکانم

١٩٧٩ - ١٩٨٣

بەرگی حەفتەم

ستۆکهۆلم ١٩٩٣

کەریمی حیسامی

# لـــــە

# بیرەوەرییەکانـــم

## ١٩٧٩ - ١٩٨٣

بەرگی حەفتەم

ISBN 91-630-1215-4

ستۆکهۆلم ١٩٩٣

# گەرانەوەی نوینەرانی دەوڵەت بۆ وتووێژ

دوای شەری سێ مانگە کاتێ گەراینەوە مەهاباد، دەفتەری تەشکیلاتی مەهابادمان هێنا شەقامی سولەیمانی موعینی، خانووی شیخ محمد معصوم. ئەم شیخە (مقدس و مەعسومە) کە لە بنەماڵەی شیخەکانی بیارە و خانەداتی نەقشبەندی و گۆیا مەرکەز و کانگای ئیسلامەتی و دین و پەروەری و عیرفان و خواپەرستی بوو، سەبارەت بە جاسوسی و خزمەتگوزاری ڕێژیمی پەهلەوی و هاوکاری لەگەڵ ساواک نەیتوانیبوو لە مەهاباد بمێنێتەوە و رایکردبوو، مەهابادی بەجێ هێشتبوو. خانووەکەی کرا بە دەفتەری ڕێکخراوی حیزبی دێموکرات و بنکەی پێشمەرگەی حیزب.

راپەراندنی کاروباری کۆمەلایەتی ناوچەی مەهاباد و نێو شاریش بە کردەوە کەوتە سەر شانی تەشکیلاتی مەهاباد. شەر لە کوردستان وێستا بوو، بەڵام دیار بوو حکومەت لێرە و لەوێ هەر خەریکی ئاژاوەوە بوو. هێزە سیاسیەکانی کوردستانیش لە جیاتی یەکیتی و ساخ بوونەوە لە سەر هەڵوێست و تاکتیکی یەکگرتوو. لە جیاتی لیکدانەوەی بابەتی بارو دۆخی وڵات و هەڵسەنگاندنی هێزەکان خەریکی دەم بە دمە و خۆرانان بوون. کۆمەڵە و چریک پێیان لەسەر ئەوە دادەگرت کە لە جیاتی ناوهێنانی (دەستەی نوینەرایەتی خەڵکی کورد) لە وتووێژدا ناوی ڕێکخراوەکانیان ببردرێ. حکومەتیش ئامادە نەبوو لەگەڵ چریک و کۆمەڵە وتووێژ بکات.

لە کۆبوونەوەیەکدا لە ماڵی مامۆستا شیخ عیزالدین، دوای باسیکی زۆر کە کۆمەڵە نەدەچوە ژێر باری ئەوە کە ناوی حیزبەکان لە وتوێژدا نەبرێ، دوکتور قاسملو بە جیددی رایگەیاند و گوتی: «ئەگەر ئەوە ئیمزا نەکەن کە لە وتووێژدا نابێ ناوی حیزبەکان ببرێ و تەنیا ناوی «دەستەی نوێنەرایەتی خەلکی کورد» بهێنرێ، نێوانمان تێک دەچێ و ئیمە بە تەنیا لەگەڵ دەوڵەت وتوویژ دەکەین».

مامۆستا کەتا ئەو دەم پشتی کۆمەڵە و چریکی دەگرت گوتی: «لام وایە دەبێ ئیمزا بکرێ».

پاشان مامۆستاو دوکتور قاسملو نوێنەرانی چریک و کۆمەڵە ئیمزایان کرد کە لە وتو وێژدا تەنیا دەبێ ناوی «دەستەی نوێنەرایەتی خەڵکی کورد» بیت و ناوی حیزبەکان نەیە.

رۆژی ١/١٢/٧٩ دەستەی نوێنەرایەتی حکومەت هاتەوە مەهاباد، ئەمجارە ٣ سەربازی «کلاو سەوز» یان لەگەڵ خۆ هێنابوو. ئەم کلاو سەوزانە لەسەردەمی رژێمی شادا لەسەر شکل و شێوەی کلاوسەوزانی ئەمریکایی دامەزرابوون کە لەشەری ویتنامدا ناویان بلاو کرابۆوە.

نوێنەرانی حکومەت هەوەڵ رۆژ چوونە شورای مەهاباد، سەردانی مامۆستا مەلا رەحیمی عەباسی و مەلا عەولای ماوەراتی.

رۆژی ١٢/١٢/١٩٧٩ لە سالۆنی فەرمانداری مەهاباد کۆبوونەوەی دەستەی نوێنەرایەتی خەلکی کورد لەگەڵ دەستەی نوێنەرایەتی حکومەتی کۆماری ئیسلامی دەست پێکرا.

دەستەی نوێنەرایەتی دەولەت بریتی بوو لە: سەباغیان، مەهەندیس سەحابی، داریوش فروهەر. دەستەی نوێنەرایەتی خەڵکی کورد بریتی بوون لە مەلا شیخ عیزالدین سەرۆکی دەستەی نوێنەرایەتی، لە حیزبی دیموکرات دوکتور قاسملو(وەک وتە وێژی دەستەی نوێنەرایەتی)، غەنی

بلوریان و کەریمی حیسامی و لە کۆمەڵەو چریکیش هەر یەکەی دوو کەس. بەشداری کۆبوونەوەی وتووێژ بوون.

لە سەرەتا مو هە ندیس سەحابی خۆیانی ناساند و بەخێرهاتنی کردو داوای سەرکەوتنی کرد بۆ وتووێژ.

مامۆستا شیخ عیزالدین وەک سەرۆکی دەستەی نوێنەرایەتی خەڵکی کورد، بە پێچەوانەی بریارو ئیمزاو رێک کەوتن کە دەبوایە ناوی حیزبەکان نەهێنێ دوای بەخێرهێنانیان گوتی:

«ئەوە ئاغای دوکتور قاسملوە ریزەری دەستەی نوێنەرایەتی خەڵکی کورد، ئەوە غەنی بلوریان و ئەوەش کەریمی حیسامی‌یە لە حیزبی دیموکراتی کوردستان. ئەوانەش فلان و فلان لە کۆمەڵە و چریک»

ئیمە واقمان ورما. باتی چی؟ مامۆستا بۆ وای کرد؟ ئیمزاو بریاری دوو رۆژبەر چی لێهات. حەبەساین. ئەمە تێکداتێکی بە ئانقەست و حیسابکراو و لە ژێر پێنانی هەموو ئوسول و بریارو رێک کەوتنێک بوو.

دوای فەرمایشتەکانی مەلا شیخ عیزالدین سەباغیان دەفتەرەکەی بەردەستی پێچایەوەو گوتی: «ئیمە لەگەڵ کۆمەڵەو چریک دانانیشین و وتووێژ ناکەین».

کۆبوونەوە لەسایەی سەری مامۆستا شیخ عیزالدینەوە تێکچوو. دوای چەند رۆژ بۆ شی کردنەوەو لێکۆڵینەوەی ئەنجامی تێکچوونی وتووێژ لە ماڵی مو هە ندیس ئاریا لە گوێکتەپە کە ببووە بنکەو بارەگای دوکتور قاسملو، کۆبوونەوەیەکی گەورە بە بەشداری چریک و کۆمەڵەو حیزبی دیموکرات پێک هات و لام وایە ئاغای سادق وەزیریش بەشداری کردبوو. لەو کۆبوونەوەیەدا من بە توندی رەخنەم لە مامۆستا گرت و گوتم: «ئیوە بە ئانقەست وتووێژتان تێکدا. ئیوە دەتانەوێ لە سەر حیسابی کوشتارو دەربەدەری و ماڵ ویرانی خەڵک ببنە قارەمان. کۆمەڵەو چریک

مەبەستیان بلاو بوونەوەی ناویانە نەک بەرژەوەندی بزوتنەوەی کوردو وەدەست هێنانی مافی گەلی کورد».

دوای ئەم کۆبوونەوەیە بوو کە مامۆستا دەیگوت: «حیزبی دیموکرات باشە، بەلام تەشکیلاتی مەهابادی حیزبی دیموکرات باش نیە، چونکە کەریمی حیسامی بەرپرسیەتی». مامۆستاو دەفتەرەکەی ئیستاش بۆ کۆمەلانی خەلکیان روون نەکردەوە، بۆچی ئەم ئیمزاو بریارەی پی‌شیل کردو بۆچی و بە قازانجی کی ئەم وتوویژەی تیکدا.؟

هەرچەندە رایەل و پۆی ئەم هەلویست و تیکدانە لە سیلەی چاوی سیاسی و سەرنج دەرەکانی کورد زۆر شاراوە نەبوو. رۆژی ١٩٧٩/١٢/٢، رۆژنامەی ئیتلاعاتی چاپی تاران، گەلالەی خودگەردانی حکومەتی کۆماری ئیسلامی بەم چەشنە بلاو کردەوە کە لە پاشکۆی ئەم بەرگەدا چاپکراوە.

## ئاهەنگی دووی ریبەندان

دووی ریبەندانی سالی ١٩٨٠(١٣٥٨) زۆر وەرۆژی دووی ریبەندانی سالی ١٩٤٦ رۆژی دامەزرانی کۆماری دیموکراتی کوردستان دەچوو. بەو مانایە بەو زستانە ساردو سرە لەسەرانسەری کوردستانەوە خەلک روویان کردبوە مەهاباد. تا پاش ٣٤سال بە ئاشکرا و هەر لە مەیدانی چوارچرادا یادی ئەم رۆژە پیرۆزە بکەنەوە.

گەلیک میوانی دەرەوەی کوردستانیش بەشدار بوون و وتاریان خوێندەوە. بە تایبەت دوکتور عصام بەرپرسی پەیوەندیەکانی دەرەوەی بەرەی دیموکراتی بۆ ئازادی فەلەستین و عەزیز نوینەری ریکخراوی

ئازادیخوازی بەحرەین بەشداریان کردبوو.

لەم کۆبوونەوەدا پاش دوکتور قاسملو، مامۆستا شێخ عیزالدین بە ناوی دەستەی نوێنەرایەتی خەڵکی کورد. عەلی گەلاوێژ بە ناوی نوێنەری حیزبی تودەو نوێنەرانی کۆمەڵەو چریکی فیدایش وتاریاندا.

من بەناوی تەشکیلاتی مەهاباد ئەم وتارەی ژێرەوەم پێشکێش کرد: کە لەسەر شریت تۆمار کراوە.

«خوشک و برایانی بەرێز، هاونیشتمانانی خۆشەویست. لە لایەن رێکخراوی ح.د.ک.ا تەشکیلاتی مەهابادەوە، بە بۆنەی رۆژی مێژوویی دووی ڕێبەندان، رۆژی دامەزرانی کۆماری دیموکراتی کوردستان، پڕ بەدڵ پیرۆزبایتان لێ دەکەم و سوپاستان دەکەم کە بەم زستان و بەم هەوا ساردە لێرە کۆبوونەوە، یادی ئەم رۆژە مێژووییە تازە دەکەنەوە.

سوپاسی مامۆستا شێخ عیزالدین دەکەم کە بەناوی دەستەی نوێنەرایەتی خەڵکی کورد ئەم فەرمایشتە جوانانەی فەرموو. سوپاسی ئەم رێکخراوە دیموکراتیانە دەکەم کە لە چێژنی ح.د.ک. وچێژنی تەواوی گەلی کورد ا بەشدار بوون. سوپاسی ئەو میوانە بەرێزانە دەکەم کە لە نێو شکاکان و لە سنەو مەریوان و سەرانسەری کوردستانەوە، هاتوون و لەم ئاهەنگە مەزنەدا بەشداریان کردووە.

سوپاسی نوێنەری گەلی قارەمانی فەلەستین، بە تایبەت نوێنەری بەرەی دیموکراتی بۆ ئازادی فەلەستین دۆستی گەلی کورد دەکەم کە زەحمەتی کێشاوەو بەشدار بوە.

هاوڕێیانی خۆشەویست مێژوو تیکرار دەبێتەوە. ٣٤ساڵ لەمەوبەر هەر لەو مەیدانەدا گەلی کورد لەسەرانسەری کوردستانەوە بۆ دامەزرانی کۆماری دیموکراتی کوردستان بەشدار ببوون. ئێستاش دەبینین کە جارێکی دیکەش نەک هەر گەلی کورد بەڵکو نوێنەرانی گەلێ دۆستیش لەم

چیژنەدا بەشدارن. ح.د.ک لە ماوەی ئەم ٣٤ساڵەدا رۆڵەی زۆری فیدا کردن بۆ ئەوەی کە ئاواتی گەلی کوردو ئامانجی کۆماری کوردستان وەدی بێنێ. با چاوێک لە نووسراوەکانی پانزدە ساڵ لەمەو پێشی ح.د.ک بکەین.

پانزدە ساڵ لەمەو پێش کومیتەی ناوەندی ح.د.ک. کە بە بۆنەی ٢٥ساڵەی دامەزراتی کۆماری دیموکراتی کوردستانەوە بەیانێکی دەرکردبوو، لەوێدا دەڵێ: ئێمە هیواداریێن کە جارێکی دیکەش هەمورمان لە چوارچرا کۆ بینەوەو جیژنی دووی رێبەندان بگرین. ئەوە پێش بینی کومیتەی مەرکەزی ح.د.ک. بوو کە وا ئێستا وەدی هاتووە.

هاونیشتمانانی بەرێز ئێمە ئەورۆ لە کۆماری ئیسلامی ئێران پشتیوانی دەکەین. چونکە بەراستی ئەگەر فیداکاری رۆڵە بەشەرەفەکانی کورد و پشتیوانی گەلانی ئێران نەبایە، ئێمە نەماندەتوانی ئەورۆ لێرە کۆ بینەوە و ئەم رۆژە جیژن بگرین.

ئەندامانی ح.د.ک لە زیندان و دەربەدەری و لە چیاکانیش لەمەو بەر ئەم رۆژەیان یاد دەکردەوە، بەلام ئێستا نەک هەر ئەندامانی حیزب بەڵکو بە هەزاران کەسی دیکەش کۆبوونەوە بە بۆنەی یادی ئەم رۆژە پیرۆزە وە سلاو بۆ ح.د.ک دنێرین.

نامەوێ بەو سەرمایە پترلەوە وەختتان بگرم، چونکە لەسەر لێکدانەوەی کۆماری دیموکراتی کوردستان دوکتور قاسملو سکرتیری گشتی ح.د.ک بە درێژی قسە دەکا و هەروەها دوێنێ لە مصاحبەی تەلیفزیونیدا ئەوەی پێویست بوو روونی کردەوە. تەنیا دەمەوێ لە لایەن ئەندامانی حیزبەوە پەیمانتان لەگەڵ تازەبکەینەوە کە ح.د.ک هەر وەک رابردوو شان بە شانی هێزە دیموکراتیەکانی کوردستان و سەرانسەری ئێران بۆ پاراستنی کۆماری ئیسلامی خەباتی دژی ئیمپریالیستی بەرێوە دەبار

بۆ وەدەست هێنانی خودموختاری خەباتی خۆی تا سەرکەوتن درێژە پێدەدا.

سڵاو لە گیانی پاکی پێشەوا قازی محەمەد- رێبەری کۆماری دیموکراتی کوردستان.

سڵاو لە گیانی پاکی شەهیدانی کوردستان و سەرانسەری ئێران.

سڵاو لە پێشمەرگە قارەمانەکان کە هەمیشە وەک قەلایەکی نەروخاون بۆ پاراستنی موجودیەتی میللەتی کورد. سوپاستان دەکەم.

دابێکی جوان و قەدیمی کوردەواریە کە میوانداری گەورە و بە کۆمەڵ ساز دەکەن و دۆست و برادەر لە ماڵێک داوەت دەکرێن. بە قسەی خۆش و گۆرانی و گێرانەوە ی سەربردە و تەنانەت باسی سیاسیش کات رادەبوێرن.

جاری وا هەیە ئەو میوانداریانە دۆست و برادەر لێک کۆ دەکەنەوە و دەبنە هۆی ئاشنایەتی و ناسیاری و دۆستایەتی نێوان داوەتکراوەکان.

لە مەهاباد ئەو دابە جوانە زۆر باوە و میوانداری گەورە دەکرێن. بە تایبەتی دوای شۆرشی ئێران و بازاری گەرمی سیاسەت و گەشەی بزووتنەوە، میوانداری ببووە مۆدی رۆژ.

یەک لەو میوانداریە گەورە و خۆشانە، بانگێشتنی هونەرمەندی بەرێز و خۆشەویستی خەڵک، کاک محەمەدی ماملێ بوو.

کاک محەممەدی ماملێ لام وایە پێش دووی رێبەندان بوو، میواندارییەکی گەورەی ساز کرد بوو. پێم وایە پتر لە دووسەد کەس داوەت کرابوو. رێبەری مەزهەبی و سیاسیش (مامۆستا شێخ عزالدین و دوکتور قاسملو) تەشریفیان هەبوو. چەند برادەری دەنگ خۆش و هونەرمەند بەشدار بوون و جاروبار بە ئاهەنگی گۆرانی خۆش مەجلیسەکەیان گەرمتر دەکرد. ئاغای فەیزی نژاد، ئاغای ناهید، کاک

محەمەدی ماملێ خۆی و هتد. فەیزی نژاد سرودیکی ساز کردبور. شیعرەکانی جوان بوون و بەلام هەموو سەربەندی شیعرەکانی دەهاتەوە سەر «قاسملو شیخ عیزالدین» سرودەکەی بە نارازی خۆش خویندەوە و چەپلەی زۆری بۆ لیدراو کە کولْ و کۆی خەلکەکە دامرکا، گوتم: ئاغای فەیزی نژاد بۆ دانانی ئەو سرودە زەحمەتی کیشاوە، بەلام بە لای منەوە سرودیکی باش نیە و من ناتوانم لەگەل ئەو سرودە موافق بم. لە سرودا ناوی ئەشخاص نایە و ئیمە نابێ فەرد پەرستی لە نیو خەلکدا بلاو بکەینەوە. ئەم سرودە هەمووی دیتەوە سەر دوکتور قاسملو و مامۆستا، ئەوەش بۆ سرود نابێ».

خەلکەکە تۆزێ سلْ بوو، نازانم قسەکەم چەندە بە دلی مامۆستای بوو، بەلام دوکتور قاسملو گوتی، قسەی کاک کەریم راستە و لە سرود ناوی ئەفراد ناهینن.

فەیزی نژاد توڕە و نارەحەت بوو: «قەدری هونەرمەند نازانن، هونەرمەند دەشکیننەوە و...... » ئەم جۆرە قسانە. ئەمجار بە جیدی گوتم، وا نیە، قەدری هونەرمەند دەزانین، بەلام مانای وا نیە هەرچی هونەرمەند کردی و بە ناوی هونەر بلاوی کردەوە، جیگای پەسند بێ. بە هەوارەی ماملێ باسەکەمان کۆتایی هات.

## مەسەلەی هەلبژاردنی پارلمان.

حکومەتی کۆماری ئیسلامی بریاری دا کە ١٤ی مارسی ١٩٨٠ هەلبژاردنی پارلمانی لەسەرانسەری ئیران بەرێوە بچێ. کومیتەی ناوەندی بۆ لێکۆلینەوەی بەشدار بوون و یا نەبوون لە هەلبژاردندا کۆ بۆوە و دوای لیکدانەوەی بارو دۆخی ولات هاتە سەر ئەو باوەرە کە پێویستە بەشداری بکەین. دوکتور قاسملو پێشنیاری کرد کە تەشکیلاتی مەهاباد کاندیدای حیزب بۆ نوێنەری مەهاباد لە پارلماندا دیاری بکات. لە تەشکیلاتی مەهاباد غەنی بلوریان و حەمەدەمینی سیراجی و کەریمی حسامی کاندید کرا بوون.

کاتی دەنگ وەرگرتن لە کۆبوونەوەی تەشکیلاتی مەهاباد بە تهێنی بۆ دیاری کردنی کاندیدای مەهاباد نەتیجەی دەنگەکان لە ٢٣ دەنگ بەم جۆرە بور.

کەریمی حسامی ٢١ دەنگ، غەنی بلوریان ١٩ دەنگ، حەمەدەمینی سیراجی ١٥ دەنگ ئەنجامی هەلبژاردنەکە لە کومیتەی ناوەندی بۆ پەسند کردنی یەکجاری باسکرا. دوکتور قاسملو گوتی:

پێشنیارم ئەوەیە کاک کەریم جێگای خۆی بدا بە مامەغەنی. زیندانی دیوە و تەواوی ژیانی لەم رێگایەدا چوە. کاک کەریم با لە نەغەدە و شنۆ ببێتە کاندیدی حیزب. ئەم پێشنیارە پەسندکرا. لەم کۆبوونەوەیە کاندیداکانی حیزب لە سەقز و بۆکان و میاندواو و پیرانشار و ورمێ و سەلماس دیاری کران.

لەو سەرو بەندەدا، واتە دوای شەری سێمانگە و گەرانەوەی بۆ نێو

شار، کومیتەی ناوەندی حیزبی دیموکرات بە کردەوە نەخش و دەورێکی دیاریکراوی نەمابوو، تەنیا ناوی هەبوو. دوکتور قاسملو بارەگاو دام و دەزگای بردبوە گوندی (گوێکتەپە) و لە خانوەکانی شیرکەتی و لە مالی موهەندیس ئاریا دایکوتا بوو. لە جیاتی بە هێز کردنی هیزی نێو خۆو تێکۆشان بۆ یەکێتی هێزەکانی کوردستان، پتر کاتی دەفتەری سیاسی و سکرتێری حیزب بە دیدو بازدید و میوان و پێوەندی لەگەڵ هێزەکانی تاران کە هیچ دەورێکیان لە کوردستاندا نەبوو، بەسەر دەچوو.

دروشمی «کوردستان سەنگەری ئازادی‌یە» بە کردەوە ببوە سەنگەری ئاژاوە و گێرەشێوێنی و تەنانەت هەرکەس. قولە حیزب و ڕێکخراو گروپی سەیر و گێرەشوێن لە تاران و بەشەکانی تری ئێرانەوە ڕایانکردبوو، هەرکەس سازێکی لێدەدا و بە هەوایەک هەڵدەپەری.

ڕاست لەو کاتەدا کە پتەو کردنی ڕیزەکانی حیزبی دیموکرات و کۆکردنەوەی کۆمەلانی خەڵک لە دەوری حیزب و پێکهێنانی یەکیتی و هاوکاری لەگەڵ کۆمەڵە و ئەو هێزانەی کە لە کوردستاندا نەخشیان هەبوو، دەبوایە ببێتە قورسایی و ناوەندی تێکۆشانی کومیتەی ناوەندی ، دوکتور قاسملو کەوتبوە فیکری بەستنی کونگرەی چواری حیزب بۆ ئەوەی کومیتەی ناوەندی لە کەسانی( سەربزێو و ڕەخنەگر و خاوەن بیرو را ) پاک کاتەوە.

کاتێک دوکتور عصام، نوینەری بەرەی دیموکراتی بۆ ئازادی فەلەستین لە مەهاباد بوو ڕۆژێکیان گوتی: «ڕەفیق کەریم، دوکتور قاسملو زۆر باسی بەستنی کۆنگرە دەکا. وەک من هەستم پێکردوە، هەلسورانی تۆ، هاتوروچۆی خەلک و بەڕێوە بردنی کاروباری شارو ناوچە لە لایەن تەشکیلاتی مەهابادەوە، لە شانی دوکتور گران دێت و لە نفوذو هەلسوراتی تۆ نیگەرانە. بۆیە بۆ بەستنی کۆنگرە بە پەلەیە کە خۆی لە

چنگ ئێوە رزگار بکا و کەسانی گوێ لە مستی بە کەیفی خۆی کۆ بکاتەوە... لە بیرت نەچێ، قسەکانی من هەڵگرە.

دوکتور عصام سەفەری کرد، من هێندی دیاری کوردەواریم بۆ نایف حەواتمە و بۆ سەلاح بەدرەالدین ناردو قسەکانیشی وەراست گەران.

## نامەی حیزبی تودەی ئێران

ناکۆکی هێزە سیاسیەکانی ئێران پرشکی گەیشتبوە کوردستانیش و دەیانەویست حیزبی دیمۆکراتیش بخەنە نێو ئەم بەزم و ناتەبایی‌یە. لە کوردستان بیجگە لە وردە دەستەو تاقمی راکردوو لە تاران، ریکخراوی ئیبدابیانی خەلک خاوەنی ریکخراو و لە مەیداندا بوون. کۆمەڵەش کە هێشتا بە دەردی (کۆمونیستی لە گوێن مەنسوری حیکمەت) گرفتار نەبیوو، هێزێکی پیشکەوتوخوازی کورد و خاوەنی نفوذو ریکخراو و تەشکیلات بوو. ئەم دوو ریکخراوە ئەندامی دەستەی نوێنەرایەتی خەلکی کورد بوون و حیزبی دیمۆکراتیش لە سەر هاوکاری ئەوان حیسابی دەکرد. حکومەتی کۆماری ئیسلامیش ئەم دوو هێزەی بە دوژمن دادەنا و هەر وەک باسکرا، ئامادە نەبوو لەگەڵ ئەوان وتوێژ بکا و یا پێوەندی بگرێ.

حیزبی تودەی ئێران کە ببوە مریدی بێ ئەملاو لای ئیمام خومەینی، دەیەویست حیزبی دیموکرات لە هاوکاری ئەم دوو هێزە پەژیوان بکاتەوە و لەم رێگایەوە گۆیا حیزبی دیموکرات و حکومەتی (دژی ئیمپریالیستی) خومەینی لێک نیزیک کاتەوەو لە ئاخریدا بیهێنێتە نێو (بەرەی یەکگرتووی خەڵک) کە بە خەیاڵی رێبەرانی حیزبی تودە دەبوایە لە

حیزبی توودەوە تەواوی ئەو هێزانە پێک بێ، کە بێ ئەملاولا مل بۆ دەسەلاتی ئیسلامی خومەینی رادەکێشن.

لە چوارچێوەی ئەم مەبەستەدا، کەوتبوە کار و تێکۆشان.

ئێوارەیەک دوکتور قاسملو تەلیفونی بۆ کردم و گوتی: «ئەمشەو لە مالی کاک سیامەندی شیخ ئاغایی میوانین. برادەرانی دیکەش دێن. عەلی گەلاوێژ نامەیەکی حیزبی تودەی هێناوە و دەیەوێ لەکن ئەندامانی کومیتەی ناوەندی بیخوێنێتەوە و تەسلیمی بکا. شەو زۆربەی برادەرانی کومیتەی ناوەندی ئامادە بوون و کاک سیامەندیش نان و خوانێکی ئاغایانەی ساز کردبوو. هەردەبوایە واشبێ، خۆ نەیدەویست شوێنەواری رەچەکی ئاغایەتی کوێر کاتەوە.

دوای خواردن و خواردنەوەی تیرو پرو حیسابی، برادەرانی کومیتەی ناوەندی چوونە دیوێکی دیکە و کاک عەلی گەلاوێژ نامەی حیزبی تودەی وەک گوللە بەندی کاک ئەحمەدی شیخ لە باخەلی هێنا دەرو بەو زمانی پاراو دەستی کرد بە خوێندنەوە. نامەکە لە ٢٦ی بەفرانباری ١٣٥٨(١٩٨٠/١/٦) نووسرابوو. پاش تەواو کردنی نامەکەی لە پێش دوکتور قاسملوی دانا.

پێم خۆشبو نامەکە بە دەستەوە بایەو لێرەدا بلاو کرابایەوە و ئیتر پێویست نەبایە من باسی بکەم و هیچی لەسەر بلێم. ئەوەی لە بیرم مابێ ئێوەرۆکی نامەکە پڕ بوو لە پەند و ئامۆژگاری تەسلیم تەلەبانە و رێنوێنی لارێیانە و هاندان بۆ جیا کردنەوەی خەت و رێباز لە هێزەکانی (دژی شورش) و ئاخرەکەشی وادەو بەلێنی بۆ هاوکاری.

نامە خوێنرایەوە. دوکتور قاسملو گوتی: با برادەران نەزەر بدەن. من گوتم: ئەوە نامەکەمان گوێ لێ بوو. دەقەکەشی لای ئێمەیە. لام وایە کومیتەی ناوەندی باسی لەسەر دەکا و بریاری لەسەر دەدا.

غەنی بلوریان زۆر بە توندی هێرشی بردە سەر نامەو سەر رێبەرایەتی حیزبی تودەو گوتی: ئەوە راستەو راست دەخالەتە لە کاروباری ئێمە و ئێمە پێویستیمان بە راوێژکار و مامۆستا نیە.

یەک دوویەکی‌تر لە برادەران هەر ئەم هەڵوێستەیان گرت و ئاخرەکەی دوکتور گوتی: «لام وایە پێشنیاری کاک کەریم بە جێ بوو. کومیتەی ناوەندی باسی لەسەر دەکا و ئەگەر بە پێویستی زانی وەڵامی دەداتەوە.

دوای ئەوە، گەراینەوە بۆ دیوی دانیشتن که یەک دوو میوانی دیکەو خانمێکی ئەڵمانی- مان بە جێ هێشتبوو کە حاجی ئەحمەدی بەناوی رۆژنامە نووسی لەگەڵ خۆی هێنابوو لە مەهاباد دەیسوڕاندەوە.

من دەمزانی کە هەواڵدەر، یا نووسەرو یا یەکی وای ئەڵمانی هاتوە و جاروبار سەری بنکەی پێشمەرگەدەدا و حاجی ئەحمەدی وەک دیپلمانج دەیباو دەیهێنێ، بەڵام نەمدیتبوو. ئەوشەوە لەوێ پرسیاری منی لە دوکتوری کرد و داوای کرد گوتی: «ئەگەر ئینگلیزی دەزانی، دەمەوێ هێندێ پرسیاری لێ بکەم و شەو دەچم لە ماڵی ئەوان دەمێنمەوە.

گوتم: «ئینگلیزی نازانم وبە دەداخەوە مالیشم نیە و خیزانیشم لێرەیە.

کردمانە گاڵتەو خوداو راستان برادەرێکی ئینگلیزی‌زان گوتی: من ئەو زەحمەتە دەکێشم و جێگاو رێگاشم هەیە.

من لەو ماوەیەدا کە گەرابوومەوە بۆ کوردستان و لە مەهاباد خەریکی تێکۆشانی سیاسی بووم، ببوومە سەرباری خەڵک و لە ماڵی وسێن ئاغای ئەحەدی دەژیام و هەروەک لە بەرگی شەش‌دا باسم کردوە، ئەو ماڵە ببوە پەناو پەسیوو ماڵ و جێگای حەسانەوەم. ئێستا خیزانیشم گەرابۆوە و بەڵام دیسان بێ ماڵ و حاڵ بوم و خانووم وە گیر نەدەکەوت.

کاک قادری شەهابی زۆر پیاوانە خانوویەکی دامێ بێ ئەوەی کرێ و ئیجارەم لێ بستێنێ. جارێکی دیکەش دەست و برادەران خانووی دوو

ژووریان بە تەلەفیزیون و فەرش و نوێن و گشت کەل و پە لی پێویست رازاندەوە. لە کانگای دڵەوە سوپاسی هەمووی ئەو دۆست و برادەرانە دەکەمکە بە راستی نەیانهێشت لە پەرداخکردنی دوو خانوان هیچ قورساییم بکەوێتە سەر شانی.

من سەربردەی خۆم دەنووسمەوە و ئەوەی لەبیرم بێ، پاشقولی نادەم. کاتێک هێشتا لە ماڵی وسێن ئاغا بووم، خێزانی مردبوو، خەڵکی زۆر دەهاتنە سەرەخۆشی. رۆژێک زۆر نەخۆشبووم و لە بەرمیوانان جێگا نەبوو راکشێم. ناچاز چوومە ماڵی کاک ئەهای عەتیقی. راکشا بووم و نەخۆش، لە دەرگایان دا. دیتم ئاغای رازی و ئاغای ئاغازادە هاتنە لام. پاش ئەحوالپرسی و چاک و چۆنی و چاخواردنەوە، ئاغازادە گوتی: «تۆ ماشینت نیە. ئەگەر ئیمکانی ماڵیت هەیە، دەتوانم بە بێ نورە ماشینێکت بۆ بێنم. سوپاسی دەکەم، هەلێکی باشبوو. کاک کەمالی شافیعی ناردی ماشینەکەیان هێنا و پارەکەشیان دابوو، لام وایە ٥٨ هەزار تمەن بوو. دوای ماوەیەک کە سەفەری ئورپام دەکرد، ماشینەکەم بە ٩٠ هەزار تمەنی فرۆشتەوە.

## بەرەو کۆنگرەی چوار:

دوای ئاهەنگی دووی رێبەندان بە چەند رۆژ، دوکتور قاسملو لە ئەندامانی کومیتەی ناوەندی گیراوە کە بۆ باس لە سەر ئامادە کردنی کونگرە بچنە گوێکتەپە. دوکتور قاسملو پێشتر بە بێ ئاگاداری کومیتەی ناوەندی.کاک جەلیلی گادانی بۆ چاوە دێری بە سەر کونفرانسەکانی حیزبی‌دا، بۆ هەڵبژاردنی نوێنەرانی کونگرە وەولاتی خستبوو. لە سەر

پێکهاتنی کونگرە کاک حەمەدەمین و کاک ئەمیری قازی و مەلا رەسول و مەلا سمایل دژ بوون و لایان وابوو کە لەم هەل و مەرجەدا هیچ پێویستیەکی ئەوتۆ بۆ بەستنی کۆنگرە لەگۆڕێدا نیە. دوکتور گوتی: «دەفتەری سیاسی بریاری داوە و تازە بەشی زۆری کونفرانسەکانی حیزبیش بەستراون. حەمەدەمین و ئەمیری قازی کە ئەندامی دەفتەری سیاسی بوون، گوتیان ئێمە ئاگامان لە شتێکی وا نیە.

پاشان باسی ئەوە کرا کە بێجگە لەوانەی کە لە کونفرانسدا هەلبژێراون، کەسانی دیکەش بۆ کونگرە بانگ بکرێن. کەسانی ئەوتۆ پێشنیار کران کەتا ئەو دەم هەر ئەندامی حیزب نەبوون وەک: موهەندیس ئاریا، مستەفای هیجری، حوسێنی مەدەنی قادری شەهابی و زۆر کەسی‌تر.

دەبوایە راپۆرتی کومیتەی ناوەندی بنووسرێ و ئامادە بکرێ و پێشتر بدرێ بە ئورگانەکانی حیزبی بیخوێننەوە و باسی لەسەر بکەن و نەزەر بدەن.

بەلام تا رۆژی پێش کونگرە تەنانەت ئەندامانی کومیتەی ناوەندیش چاویان پێ نەکەوت.

رۆژی ١٩٨٠/٣/١ کونفرانسی شارستانی مەهاباد پێک هات.

لە هەموو رێکخراوەکانی سەر بەتەشکیلاتی مەهاباد نوێنەر بەشداریان کردبوو. مامۆستا هێمن بۆ هەوەلجار شیعری «رنوی کوێستانی» خوێندەوە، کونفرانسی هێنابوە هاژان. مەلا غەفوری حافزیش دوو بەستە شیعری نایابی خوێندەوە.

دوکتور قاسملو بە درێژی لەسەر سیاسەتی حیزب قسەی کرد. لە کاتی هەلبژاردندا کە کاندیدا پێشنیار دەکران، دوکتور قاسملو پەروانەی ئەحمەدی کاندید کردو داوای لە کونفرانس کرد کە دەنگی بۆ بدەن. ئەم

هەنگاوەی دوکتور لە کونفرانس رەنگدانەوەیەکی باش نەبوو. پەروانە خۆی کاندید نەکرد و بوو بە هۆی ئەوە کە خۆی و میردەکەی لە حیزب بچنە دەرو لە تیکوشانی سیاسی بکشینەوە.

کونگرەی چوارەمی حیزبی دیموکرات بە بروای من سەرەتای لادان لە ریٔ و شوینی حیزبایەتی و دیموکراسی حیزبی و داتاشینی دیکتاتور بوو. رۆژی ١٣٥٨/١١/٣٠ (١٩٨٠/٢/١٩) سەعاتی ٣ی دوای نیوەرز کرایەوە.

لە پلینومی پیش کونگرەدا، دوکتور قاسملو راپۆرتی کومیتەی ناوەندی هینا کە پیشتر کەس نەیدیتبوو. لە لایەن چەند برادەرەوە رەخنە گیرا، سادقی شەرەفکەندی کە وەک.مشاور بەشدار بوو هەستا زیز بوو، وەدەرکەوت. بە کورتی رەخنە و ئیراد پوش بەسەر کراو چوونە کونگرە.

٣١٠کەس وەک نوینەرو خاوەن دەنگ لە کونگرەدا بەشدار بوون. کە بە گوێرەی بریاری پەسندکراو کە بۆ هەر ١٠٠ ئەندامی حیزبی دەبوایە نوینە رێک بە شداربیٔ ئەوانە نوینەری ٣٠٠٠٠ ئەندامی حیزب بوون. کاک حەمەدەمینی سیراجی لە وتا ری خۆیدا بە هەق گوتی: خۆزیا لە جیاتی ٣٠ هەزار ٣٠٠ ئەندامی بەراستیمان هەبایە.

دوای خویندنەوەی راپۆرتی کومیتەی ناوەندی، من رام‌گەیاندکە ئەو راپۆرتەی بە ناوی کومیتەی ناوەندی‌خوێنرایە وە ، هیچ یەک لە ئەندامانی کومیتەی ناوەندی نەیانخویندۆتەوە. بەلام غەنی بلوریان گوتی : «بەلیٔ ئەوە راپۆرتی کومیتەی ناوەندی بوو».

لە کۆنگرەدا، غەنی بلوریان سەبارەت بە بیست و چەند سال زیندانی بوون نفوذ و ریزیکی زۆری هەبوو، هەرچی گوتبای خەلک بیٔ ئەملاو لا پەسندیان دەکرد. بەلام ئەو فریوی نوینەرایەتی پارلمانی خواردبوو، بەو هیوایە دەچیتە مەجلیس و ئیتر بۆچی سەری خۆی بیشینی؟ لە کۆنگرەدا

چەند جار بە غەنی بلووریانم گوت، تۆ دەتوانی رەوەندی کۆنگرە بخەیە سەر رەوەتیکی ساخ ودیموکراتیانە . بەلاّم ئەو خۆی بۆ کورسی پارلمان ساخ کردبۆوە و بیری لە شتیتر نەدەکردەوە. کاتیک قسە لە کاندیدای کومیتەی ناوەندی دەکرا، دوکتور پیشنیاری کرد بۆ ئەوەی کاتی کۆنگرە نەگیری، با خۆی لەگەلْ مامە غەنی دابنیشن و لەسەر چۆنیەتی و شیوەی کاندید کردن بۆ ئەندامەتی کومیتەی ناوەندی ساخ بنەوە. کونگرە پەسندی کرد. کاتیک گەرانەوە، بریاریاندا بوو کە کومیتەی ناوەندی پیشوو کەس کاندید نەکا و هەر کەس خۆی کاندید بکاو هەموو کەسیش دەتوانی. هەر لەوی کلاّو چووەوە سەری مامە غەنی. دوکتور کلاّوی دووەمی لەسەری هەموو کونگرە نا.

لە هەموو کونگرەکانی دنیا داب وایە، دوای خۆناساندن و دیاری کردنی کاندید، دەست بە دەنگ وەرگرتن و هەلبژاردن بکری. پاش ئەوە کاندیداکان خۆیان ناساند، دوکتور گوتی: «ئیتر درنگ بوە و با دەنگ دان بمینی بۆ سبەی بەیانی. کەس بیری بۆ ئەوە نەدەچوو کە سکرتیری حیزب چ نەخشەیەکی بۆ (دیموکراسی) کیشاوە. بە تایبەت ئاغای سادق وەزیریش لە وتاری خۆیدا، ئەوەندەی تاریفی رینەرایەتی حیزبی دیموکراتی کردبوو، ئیتر خەلْکی کونگرە نەدیتوو، نەخویندەوارو بەسەرداکەوتوو ورِو گیژ ببوون.

بەلاّم دوکتور قاسملو بۆچی پیشنیاری وەدواخستنی هەلبژاردنی کرد؟

ناوبراو، وەک ( رینەریکی لیهاتوی نەترس لە رەخنە و لە بیرو رای موخالیف و باوەر بەخۆ بوو )، شەو هیندی کەسی نوکەر سیفەت و ما ستاوسارد کەرە وە ی بی شەخسیەتی لە خۆ کۆکردبۆوە و ناوی ئەو کەسانەی نووسیبوو کە دەیزانی فەرمانبەردار و بی زەرِن و لە ۳۰۰ نوسخەدا هەر بەو شەوە ماشین وفۆتۆکۆپی کردبوون و دابوویە دەست

نوکەرو دارو دەستەی خۆی. بە یانی کە کۆبوونەوە دەستپێکرا، ئیتر کوتوپڕ تاقمێکی سەر سەری وەژوور کەوتن ودەستیان کرد بە بلاو کردنەوەی وەرەقەی ناوەکان و هەرکەسی پەرە کاغەزێکیان دادەستێ.

خەلکی ئەدیتووی نەزان، گورج دەستیان کرد بە نووسینی ئەم ناوانە کە بەدەستیانەوە بوو. هێندێ لە برادەران دەستیان کرد بە ئیعتراز و رەخنە. بەلام دەبوایە غەنی بلوریان وەدەنگ بێ. ئەویش ناوی لەو تاقمەی دوکتوردا بوو، هەر ئەوەشی دەویست.

بۆ دەوری دووەم دوکتور، سەلیمی بابانزادە و رەحمانی حاجی ئەحمەدی و حەسەنی شتەوی پێشنیار کرد. نەک هەر کەس دەنگی بۆ نەدان، بەلکوو خودا خودایان بوو ناویان بکوژێتەوە. پاش تەواو بوونی هەلبژاردن رۆژ درنگ و کەوتە بەر شەوێ دوکتور پێشنیاری کرد کە شەو درنگە و برادەران هیلاکن و با سبەی دەست بە بژاردنی دەنگەکان بکرێ. ئێمە چەند کەس دژی ئەو پێشنیارە بووین. چوونکە دوای تەواو بوونی دەنگدان دەبێ دەست بکرێ بە بژاردن و نووسین. ئەو خەلکەی لەوێ کۆکرابۆوە نەیدەزانی رێ و شوێنی حیزب و کونگرە چی‌یە. پێشنیاری دوکتور پەسندکرا و صندوقی دەنگەکان کەوتە بەر دەستی پاک و ئەمینی ئەو کەسانەی دوکتور پێشنیاری کردبوون .

کەسانی ئەوتۆ لە سەر لیستەی دوکتور هەلبژێرا بوون کە تا رۆژی کونگرە هەر ئەندامی حیزبیش نەبوون. بۆ نموونە کیژێکی خەلکی گوڵی سندوسیان کردبو بە مشاوری کومیتەی ناوەندی، هەر قەت نەیزانیبوو حیزب و سیاسەت چیە و بەراستی هێشتا لە ژیانیش‌تێ نەگەیشتبوو. بەلام کاتیک کە لە کۆبوونەوەی کومیتەی ناوەندی‌دا پێشنیاریان کردبوو با کەریمی حسامی بە مشاور هەلبژێرین، دوکتور قاسملو گوتبووی: ئەگەر ئەو بێ، ئیتر کۆبوونەوەکانی کومیتەی ناوەندی هەر بە کێشەو دم بە دمە

رۆژ دەبەنە سەر. ئەو دەیویست مەرپ.خودای لە کومیتەی ناوەندی‌دا بن ، و بە کەیفی خۆی ئەوبەرا و بەریان پێ بکا.

کاتێک ئەوەیان بۆ گێرامەوە قسەکانی (سیمون لیس) نووسەری فەرانسەیی-م وەبیر هاتەوە کە دەنووسێ : «حوکمرانە دیکتاتورو سەرە رۆیەکان، کاتێک لە نەمانی دەسەلاتیان ترسیان رێندەکەوێ، بەدگومانی و در دونکی‌یان لێ زیاد دەبێ. کەسانی لێزان و لێهاتو و تێکۆشەر وەلا دەنێن و رۆژ بە رۆژ پتر خواجەی چەرەمسەراو ژن و کەسانی دوورو، نوکەر سیفەت و را راو خوێنڕی لە دەورو بەری خۆ کۆ دەکەنەوە» بەداخەوە دوکتور قاسملو تووشی ئەو نەخۆشیە ببور قەی‌ناکا، ئەوانەی بە فیلێ و لیستە بلاو کردنەوە، کردبوونی بە کومیتەی ناوەندی ئەوە دەنگیان بۆ درابوو، هەرچۆنیک بێ بۆ رێز گرتن لە دەنگی ئەم خەلکە پاکانەی بۆ بکرێ، بەلام ئەوانەی بە ناوی دەفتەرو تەلەفیونچی و بۆ گوێ هەلخستن و بەشی نەئاشکرای (پاراستن) کۆی کردبوونەوە، بۆ سیاسەتمەدارێکی بڕوا بەخۆ نەدەبوو.

چەند رۆژ دوای کونگرەی چوار، رۆژێک مەلا عەولا و جەلیلی گادانی من و کاک حەمەدەمینی سیراجیان بانگ کردو گوتیان دەمانەوێ لە رۆژنامەدا کار بکەن. من گوتم، ئێستا مەسئولی تەشکیلاتی مەهابادم و هەر لە سەرکاری خۆم دەمێنمەوە و لە تەشکیلات دا وەک ئەندامێکی حیزبی کار دەکەم.

کاک حەمەدەمین کە گەلێک پێشتر بڕیاری خوی دابوو لە سەر ئەو باوەرە بوو کە : «ئەفرادی مارکسیست و کومونیست دەبێ لە نێو حیزبی کومونیست دابن». گوتی : من کار ناکەم و دادەنیشم. دیارە چەلیل و مەلا عەولا ئەوەشیان لێ زدیاد کرد کە نابێ دژی حیزب و کومیتەی ناوەندی قسە و تەبلیغاتی بکەن. من گوتم ئێوە کە هەلبژیراوی کونگرەن،

ئیتر هەق نیە لە بیروراو تەبلیغاتی هیچ کەس بترسین. من تا لەو حیزبەدابم، بە گوێرەی پیرەو پرۆگرامی حیزب دەبزوومەوە و هەرچی بە قازانجی حیزبیش بزانم دەیکەم.

قسەی زیادی‌یە. یانی چی لە حیزبی دیموکرات‌دا هەر کەس هەرچی خۆی پێی وابوو قازانجی حیزبە بیکاو بە بێ پرس و فەرمانی دەفتەری سیاسی و یا بەرپرسیک ناو بخواتەوە. ئەوە نابێ. ئەدی کو نگرەی چوار بۆیە نەبەسترابوو کە سکرتیرو کومیتەی ناوەندی لە چنگ ئەم قسەو بەزمانە رزگاریان بێ؟

بۆ ئەوەی بە یەکجاری حیزبەکە ساخ بێتەوە، بە گوێرەی یاسای حیزبایەتی دوای کونگرە پێویستە ریکخراوەکانی حیزبیش کۆبوونەوە و کونفرانس بگرن و کومیتە و بەرپرسی تازە هەلبژێرن. بەلام مەسەلەی هەلبژاردنی پارلمان هاتە گۆرێ و هەلبژاردنی تەشکیلاتی مەهاباد وەدواخرا. دوور نیە لەبەر ئەوەش بووبێ کاک جەلیلی گادانی کە کرابوە بەرپرسی تەشکیلاتی حیزب و سەبارەت بە (خەلک ناسین و رابردووی تیکۆشانی لە دیهات) تۆزیک کاری بۆ بکا و بەلکو بتوانن لە هەلبژاردنی تەشکیلات‌دا من هەلنەبژێردرێم.

رۆژی ١٣٥٩/١/١٩(١٩٨٠/٤/٨)کونفرانسی شارستانی مەهاباد بە بەشداری ٥٣ کەس نوێنەری رێکخراوەکانی شارو ناوچەکان پێک هات، جەلیلی گادانی وەک بەرپرسی گشتی تەشکیلات و مامە غەنی وەک ئەندامی دەفتەری سیاسی بۆ چاودێری بە سەر کاری کونفرانس و هەلبژاردندا ئامادە بوون.

لە کونفرانس‌دا وەک بەرپرسی تەشکیلاتی مەهاباد لە راپۆرتی تەشکیلات‌دا بە درێژی لەسەر کەم و کۆری کارەکانی کومیتەی ناوەندی و فروفیلی کاندید کردنی مستەفای هیجری و کردەوەی کومیسیونی

لیکۆلینەوە (بازرسی) و زۆر شتی‌تر قسەم کرد. کاتیک هەلبژاردن دەست پیکرا، لە ٥٣ کەس، ٥٢ کەس بۆ من دەنگی دابوو. ئەمە خۆی وەلامیکی توند بوو بۆ فروفیلی کونگرەی چوار.

رۆژی ١٣٥٩/١/٢٩ (١٩٨٠/٤/١٨) بە تیکرایی دەنگ بە بەرپرسی تەشکیلاتی شارستانی مەهاباد هەلبژیردرام. کومیتەی شارستان بە رپرسی ناوچە و ریکخراوی بەشەکانی مەلبەندی مەهابدی دیاری کرد و دە ست کرا بە کارو دەرکردنی رۆژنامەی پیشەوا.

## هەلبژاردنی پارلمان

وەک باسکرا کومیتەی ناوەندی پیش کۆنگرەی چوار بریاری دابوو کە لە ناوچەی سندوس و شنۆ بۆ نوینەرایەتی پارلمانی ئیران من کاندیدای حیزبی دیموکرات بم. کاک جەلیلی گادانی کرابوو بە پەرپرسی ستادی هەلبژاردن. دیتم لە پر بەیاننامەیەکی دوورو دریژی لەسەر «خەبات و تیکۆشان و شۆرشگیری» کاک مستەفای هیجری نووسیوەو لەناوچەکانی سندوس و شنۆ بە کاندیدای حیزبی ناساندوە. چوومە دەفتەری سیاسی زۆر بە توندی لەم کردەوە ناحەزو دووروویانە رەخنەم گرت. غەنی بلوریان گوتی من ئاگام لیٚ نیەو نازانم بۆچی واکراوە. تۆ کاندیدی حیزبی و بریارمان لەسەر داوە. دوکتور قاسملو گوتی: «ریکخراوەکانی سندوس و شنۆ کاک مستەفایان کاندید کردوە».

تەلیفۆنم کرد بۆ کاک مەلا محەمەدی مراد رەسولی کە بەرپرسی تەشکیلاتی شنۆیە بوو. ناوبراو گوتی: «نامەیەکی دەفتەری سیاسی

هاتوە، نووسراوە :« دەفتەری سیاسی کاک مستەفای هیجری ئەندامی دەفتەری سیاسی کردۆتە کاندیدای شنۆ و نەغەدە، تکایە هەولی بۆ بدەن». بە مەلا محەمەدی رەحمەتیم گوت: «تکایە نوسخەیەکی فۆتۆکۆپی نامەی دەفتەری سیاسیم بۆ بێنە». کاک مەلا محەمەد دوای دوو رۆژ پەیدا بوو نامەکەی فۆتۆکۆپی کردبوو بۆی هێنام. نامە مۆری دەفتەری سیاسی پێوە بوو بێ ئیمزا. رەسم وا بوو نامەکانی دەفتەری سیاسی سکرتێر یا جێگری سکرتێر ئیمزای بکا . دوکتور قاسملو بە بێ ئاگاداری دەفتەری سیاسی ئەو نامەیەی بە مۆری دەفتەری سیاسی و بێ ئیمزا بۆ رێکخراوی شنۆیە ناردبوو. دەقی نامەکە ئێستا لە ولات پارێزراوەو بە داخەوە بە دەستەوە نیە. سەیر ئەوە بوو دوکتور قاسملو برادەرێکی کردبوە کاندیدی حیزبی لە نەغەدەو شنۆ کە تا رۆژی کۆنگرەی چوار ئەندامی حیزب نەبوو. لە دوای شەری نەغەدەش رای کردبوو بە هیچ جور نەیدەوێرا بچێتەوە نەغەدە بە تایبەت بۆ تەبلیغاتی هەڵبژاردن نەیتوانی بەو ناوچەیەشدا تێپەرێ. بەڵام کاک جەلیل لە مەهابادەوە دورر بە دوور تەبلیغاتی بۆ کاندیدای سندووس و شنۆ دەکرد.

لە بەرامبەر ئەو کردەوە ناحەزو فێڵبازانەدا بریارمدا کە لە سندووس و شنۆ وەک سەربەخۆ خۆم کاندید بکەم. من لەم ناوچەیە رابردووی پر لە شانازی،خەباتم هەبوو. لە سەر مافی زەحمەتکێشان لەگەڵ دەرەبەگ و سەرۆک عەشیرەت و ژاندارم وەدەنگ هاتبووم لەسەر خەباتی سیاسی زیندانی کرابووم، دەرکرابووم هەموو ژیانم تێداچووبوو. قەرەپەباخی سندووسی لە نەغەدەو رادانەو مەحەمەدیار دۆست و ناسیارم بوو ن یارمەتیم دابوون لە کاتی خۆیدا. لە بەرانبەر کاک مستەفای هیجریدا کە کاندیدی حیزب بوو دۆست و برادەری کوردو قەرەپەباخی شنۆو نەغەدەو رادانەو عەجەملیان بەیاننامەیەکیان لە سەر تێکۆشان و خەباتی رابردووی

من نووسیبوو کردبوویانە کاندیدی سندووس و شنۆ بۆ نوێنەرایەتی پارلمانی ئێران. چەند کەس لە برادەرانی کوردو عەجەمی نەغەدەو دۆستەکانی شنۆ بە دێهاتدا گەڕابوون و بە چەشنێکی هەراو بەیاننامەکەیان بڵاو کردبۆوە. لە نەغەدە چوومە فەرمانداری وەک کاندیدی غەیرە حیزبی ناوی خۆم نووسی. بەرنامەی ئینتخاباتی خۆم نووسی‌و بە چەشنێکی هەراو بڵاو کرایەوە. لە نیزیک سێ‌ڕای محەمەدیار لە گوندی دورگە برادەرێکم قاوەخانەی هەبوو. قاوەخانەکەی کەوتبوو نیزیک بازاڕی سەر پردێ و سەر ڕێگای ورمێ، نەغەدە، مەهاباد. بەیاننامەو فیشی تەبلیغاتی کاندیداتوری منی لە چاپخانەکە هەڵاوەسیبوو. پێشمەرگەی بنکەی خەلیفەلیان و مەحەمە شە بە دەستوری بەرپرسی ڕێکخراوی داسەپاوی دوکتور قاسملو (کاک ڕەحمانی حاجی ئەحمەدی) ڕاست بە شێوەی ژاندارمی زەمانی شا چووبوون بەیاننامەو تراکتەکانیان لێ کردبۆوەو بە قاوەچیان گوتبوو: «نابێ ئەم بەیانامانە لە قاوەخانە هەڵاوەسی». ئەوە سەرەتای ئەم دیموکراسیە بوو کە دوکتور قاسملو خەباتی بۆ دەکرد.

من بەرنامەی هەڵبژاردنی خۆم بە درێژی و بە هەراوی چاپکردبوو بڵاو کرابۆوە. بەڵام دەبوایە خۆشم بچمە نێو خەڵک و لە گوندەکان قسەیان بۆ بکەم و ڕوونیان کەمەوە. بۆ ئەم کارو سەفەرو گەڕانە پێویستم بە ماشێن هەبوو. لە باری چاپکردنی فیش و تراکت و نووسین و بڵاوکردنەوە کورەکانی ڕێکخراوی لاوانی حیزبی دیموکرات یارمەتیەکی زۆریان کردو هەمیشە لەگەڵم بوون. بەڵام نە ئەوان ماشێنیان هەبوو، نە منیش دەستم گەیشتبوە تالان و بڕۆی سەربازخانە کە ماشێنم هەبێ. ئەو ماشێنەی نوێنەری کومپانی پەیکانیش وادە ی پێدابووم، هێشتا هەر لەسەر کاغەزو لە تاران بوو.

نامەیەکم بۆ سمایلی ئازەرمیر لە میاندواو نووسی و داوام لێکرد کە ماشینێکم بۆ بنێرێ تا تەواو بوونی هەڵبژاردن لە لام بێ. ئازەرمیر لە وەلامدا نووسیبووی ماشینەکەی لە تەعمیرە، بەلام دوو هەزار تمەنی بۆ ناردبووم کە ماشێنی پێ بە کرێ بگرم. دوایە داوام لە کاک رەحمانی...... کرد ماشێنێکی لەندرێزی بۆ ناردم سوار بووین لەگەڵ دوو برادەری یەکێتی لاوان بەرەو سندووس کەوتینە رێ. لە کن وسوکەندی ماشێن پەکی کەوت و بە هەزار حاڵ گەیاندمانەوە مە هابادو لەگەڵ سوپاس ونمان‌داوە. ناچار خەبەرم نارد بۆ کاک رەسولی دانشمەند کوری کاک سەعدە کە ماشێنم بۆ بنێرێ. کاک رەسول ماشێنی بۆ ناردم. رۆژی ٨٠/٣/٤ لەگەڵ پێشمەرگەیەک و دوو برادەر لە کورەکانی رێکخراوی لاوان سوار بووین بۆ سندووسی. رۆژی بازاری سەرپردێ بوو. خەلکێکی یەکجار زۆر لە بازاری کۆ ببۆوە. دۆست و ناسیاری زۆر لە بازارێ بوون. دەستیان کرد بە بلاو کردنەوەی بەیاننامەو تراکت. پاشان کوردو قەرەپەپاخ کۆببوونەوەو لە راستیدا بازار بوو بە میتینگێک. لەسەر بەرنامەی هەڵبژاردن بە درێژی قسەم کردو داوام لە خەڵک کرد کە یەکێک بۆ مەجلیس بنێرن کە بیناسن و لە خۆیان بێ. لەوێوە چوومە گوندی مەحمەشەی ماڵە مامۆستا حاجی مەلا محەممەدی. حاجی مەلا محەممەد و حاجی مەلا مستەفا بەڵێنیان دا کە لەو گوندانەی دەورو بەری خۆیان خەڵک ئامادە بکەن کە دەنگی بۆ بدەن. پاشان چوومە گوندی خەڵیفەلیان و مەمەلیان و قەرەقەساپ. هەموویانم دەناسی، دۆست و جیرانی قەدیم بوون. گومانم نەبوو لە من زیاتر بۆ هیچ کەسی‌تر دەنگ نادەن. لە مەحمەش چوومە بنکەی پێشمەرگە و لەسەر لابردنی بەیاننامەو تراکت لە قاوەخانەی دورگە پرسیارم لێکردن. بەرپرسی لق گوتی: «لە لایەن تەشکیلاتی نەغەدەوە پێمان ئەسپێراوە کە نەهێلین بیجگە لە بەیاننامەی

حیزب نووسراوەی کەسی‌تر بلاو بیتەوە». قسەم بۆ پێشمەرگەکان کردو روونم کردنەوە کە ئەوان نابێ نەخشی ژاندارمیان هەبێ. رۆژی دوایی کە دەچوومە نەغەدە لە گوندی دورگەی تەرکەونان لامدا. چەند برادەری قەرەپەپاخم لەوێ هەبوون کە ساڵەکانی دەورانی حکومەتی موسەدیق لە کێشەی لەگەڵ ئاغاکان یارمەتیم دابوون و لە نێو خەڵکدا دەسەلاتیان هەبوو. ئەوان بەڵێنیان‌دا کە دەنگی خەڵکی ئێرە تەنیا بۆ تۆ دەدرێ. دەبوایە بچمە مەحمەدیار، شوێنەواری شەری نەغەدەو دوژمنایەتی کوردو عەجەم هەر مابوو. برینەکان ساریژ نەببوون. ئەو برادەرانەی لەگەڵم بوون لە چوونی نێو عەجەمان دەترسان و گوتیان: مەحمەدیار بنکەی ئەرتەش و پاسدارانی لی‌یە با نەچین. بە تایبەت کە پێشمەرگەی چەکداریشم لەگەڵ بوو. گوتم من کە بریارم داوە لەم بوارەدا خەبات بکەم، ئیتر نابێ بترسێم. بە تایبەت دەبێ عەجەمەکانی سندووسی حاڵی بکەم کە بۆ دۆستایەتی کوردو عەجەم لە سندووسی تێدەکۆشم. لەو براتوورکانەی گوندی دورگە دووکەس لەگەڵم سوار بوون و چووینە مەحمەدیار. لە پێشدا یەکسەر چوومە ئیدارەی پاسداران. گوتم: من کاندیدای هەڵبژاردنی پارلمانم، دەمەوێ بەیاننامەو شوعارو تراکتی هەڵبژاردن و بەرنامەی کاری خۆم بلاو بکەمەوە. گوتیان: تۆ سەربەستی تەبلیغاتی هەڵبژاردن ئازادە. لە نێو بازار دەستمان کرد بە لە دیواردانی تراکت و بەیاننامە. لە پر کابرایەکی زەلام ئامێزی پێداکردم و دەستی کرد بە ماچ و بەخێر هێنان. نەمناسی تەنیا بە سەیر کردنی قەلافەت و بالای زەلامی وازم هێنا. گوتی: «ئەوە نامناسی؟ من قاسم خانی برازای حاسبە خانمی ژنی شێخ جەلالی دەریەندیم» زۆر بە خێرایی «شریتی عومری رابردوو وەکو خەو هاتە بەرچاوم». هەموو شتێکم لێکدایەوە پرسیاری حاسبەخانم کرد. گوتی: لە ورمێ‌یە. پاشان گوتی " بیستوومە خۆت

کاندید کردووە، ئیمە بە هەموو توانا‌وە هەوڵت بۆ دەدەین، ئیستاش خەڵک کۆ دەکەمەوە. قاسم خان بە نێو بازاڕیدا گەڕاو خەڵکێکی زۆری لە مەیدانەکەی نێو دووکانان کۆ کردەوەو لە سەر رابردوو و ناسیاری من قسەی کرد. پاشان خۆم بە زمانی ئازەری بەرنامەی نوێنەرایەتی خۆم بە درێژی بۆ خەڵک روونکردەوە. بۆ نانی نیوەرۆ داوەتی کردین. لە گوندەکانی ڕادانەو عەجەملیان و زولماباد مەشەدی حەسەن قولی کە دۆست و برادەرێکی کۆن و دڵسۆز بوو، لە بەرگی شەشی بیرەوەریەکانمدا یادی بەخێری کراوە کاری کردبوو، بەیاننامەکانی بلاو کردبۆوە. لەوێوە چوومە نەغەدە. لە نەغەدە لە دەبیرستان قسەم بۆ لاوەکان کرد. لە مزگەوتی نەغەدە بە درێژی بەرنامەی هەڵبژاردنی خۆم روون کردەوەو رامگەیاند کە من کاندیدی حیزبی دیموکرات نیم. تەنیا بە پاڵد ان بە خەبات و تێکۆشانی رابردووم و پشتیوانی خەڵک خۆم کاندید کردووە. وتارەکانم برادەران لەسەر شریت تۆماریان دەکردو بلاویان دەکردەوە. من لەم ناوچانە باش ناسرابووم لە خۆشەویستی و ئیحترامی خۆم هیچ گومانم نەبوو. بەلام ئیستا بەرەیەکی تازە پێگەیشتوو لە گوندەکان هاتبوە مەیدان کە ئاگاداری ژیانی رابردووم نەبوون و منیش هیوایەکی زۆرم بەم وچە و بەرەی تازە پێگەیشتوو بوو، ئیستاش بۆ دوارۆژی خەباتی گەلی کورد هەر هیوام بەوانە. بەرنامەی هەڵبژاردنی خۆم لەم چەند خاڵەی خوارەوەدا بە درێژی بۆ خەڵک روون دەکردەوە:

١- خەبات بۆ ناساندنی مافی نەتەوایەتی گەلی کورد لە چوارچێوەی بەرنامەی ٢٦مادەیی دەستەی نوێنەرایەتی خەڵکی کورد.

٢- خەبات بۆ نەهێشتنی شوێنەواری شومی شەڕی نەغەدەو بژاردنی خەسارو زیانی کوردەکان و گێرانەوەیان بۆ سەر شوێن و جێگای خۆیان.

٣- خەبات بۆ پێکهێنانی شورای هاوبەشی کوردو عەجەم لە ناوچەی

سندووسی.

٤- خەبات بۆ بەجێ گەیاندنی تەواوی ئیسلاحاتی زەوی.

٥- خەبات بۆ ناساندنی هەڵگیرسێنەرانی شەری نەغەدەو سزادانیان.

٦- خەبات بۆ بە رەسمی ناسینی خوێندن و نووسین بە زمانی کوردی لەگەڵ دانانی مەدرەسەکان لە لادێدا.

کاتێک لە مزگەوتی نەغەدە وتارم دەدا دوای ئاخافتنم هێندێ پرسیار کران، برادەرێکی ئەندامی کۆمەڵە دەستی هەڵبری و گوتی: «کاک کەریم تۆ کە هێندە باسی زەحمەتکێشان دەکەی ئەدی بۆچی خۆت ئەو چاکەت و پاتۆلە جوانەت لەبەر دایە؟»

برادەر راستی دەکرد کاک مەنافی شافعی دەستێک قوماشی زۆر جوانی بۆ دوکتور قاسملو و بۆ من ناردبوو. کاک ئەحمەدی سالح بۆکانیش بە دل بۆی درویبووم. بەڵام ئەو برادەرە وا حاڵی کرابوو کە ئەوەی باسی زەحمەتکێشان دەکا نابێ چاکەت و پاتۆلی جوانی هەبێ. ئەوەش سەردەمێک تەبلیغاتی عەوامفریوانەی چەپی خوار لە ئێران و رەنگە لە جێگای دیکەش کردبووی بە باو.

لە سندووس لە گوندەکانی بالغچی، دەربەند، خنخنە، قەلاتان، ئارنێ، حەلبوکزیکان، یونسلیان و دیلانچەرخ لە سەر بەرنامەی هەڵبژاردن و رابردووی ژیان و تێکۆشانی خۆم قسەم کرد.

پاش تەواو بوونی گوندەکانی سندووسی چوومە شنۆیە. رۆژی جومعە لە بلیندگۆی مزگەوت بانگیان کرد کە کاک کەریمی حیسامی لە سەر بەرنامەی هەڵبژاردن قسەدەکا. پێش منیش مەلا عەولای سەرباز کە نوێنەر و کاندیدی مامۆستا مەلا شێخ عیزالدین بوو، ناویشی لەو کتێبی هەشت هەزار ساواکی‌دا بلاو بۆوە لە شنۆیە قسەی کردبوو، خەڵک لێیان لە هەلا دابوو. دوای نوێژی جومعەی مامۆستا مەلا عەبدولا ی حیسامی

لەسەر خەبات و تێکۆشان و رابردووی من باسێکی درێژی کردو رایگەیاند: مەلاکانی شنۆ لە کاک کەریمی حیسامی بۆ هەڵبژاردنی پارلمان پشتیوانی دەکەن. مەلا عەبدولا بەرپرسی یەکێتی مەلایانی ناوچەی شنۆ بوو، نامەیەکم بۆ ئەحمەد بەگی کوری تەهای هەرکی نووسی لە دەشتە بێل. هێندێ چاوپێکەوتنی رابردووی سالەکانی ٤٩-٥٠م وەبیر هێنابۆوە. ئەحمەد بەگ لە وەلامدا پشتیوانی خۆی راگەیاندبوو. نووسیبووی: دلنیا بە لە دەشتە بێل بۆ کەسی دیکە دەنگ نادرێ.

لە شنۆیە یەکێ لە برادەرانی رێکخراوی لاوانم ناردەوە مەهاباد کە هێندێ تراکت و بەیاننامە بێنێ. لە رێگا لە نیزیک گوندی قەلاتان ماشینەکەی وەرگەرابوو. خۆشی کە ماشینی داژوا شان و سنگی ئەزێتی دیبوو. خەبەریان هێنا کە برادەر کەوتوە. چوومە قەلاتان، تراکتۆری برایم ئاغام وەرگرتوو ماشینەکەم ناردەوە مەهاباد. کاک کەمالی شافعی دابووی بە تعمیرگا و زۆر باش راستیان کردبۆوە.

لە شنۆیە سەید یونسی کوری سەید محەمەدی بالاگیری بە خۆیو ماشینێکی زۆر ساز هاتوو گوتی: لە ئیختیاری تۆدام تا کارت تەواو دەبێ. مەلا عەولای کوری حاجی مەلا خالید و شیخ قادری نەوەی شیخی بورهانی و سەید قادری کوری حاجی سەید مستەفای بالاگیری لەگەلم سوار بوون لە گوندەکانی نەلیوان، نالیاوێ، حەسەن نووران، دێ شەمس، دێ گورجێ، نەلۆس، چەپەراوێ، شێخان و سینگان لە سەر بەرنامەی هەلبژاردن و تێکۆشانی رابردووم خەلکم روونکردەوە. بێجگە لە خەلک هەموو مەلاکانی ئەو گوندانە بەلێنیان دا کە پشتیوانیم لێ بکەن. کاتێک چوومە گوندی دێ شەمسێ کاک نەبی قادری کە ئەو دەم بەرپرسی یەکیتی لاوانی شنۆیە بوو ئەویش هاتبووە ئەم گوندەو لاوی گوندەکانی دەوروبەری هەموو کۆ کردبۆوە. هەلکەوتێکی باش بوو. وتارەکەی من

کارێکی زۆری کردە سەر ئەو لاوانەی کە کاک نەبی کۆی کردبوونەوە. لەویش ڕام گەیاند کە من کاندیدی حیزب نیم و بە پشتیوانی خەڵک هاتوومە مەیدانی هەڵبژاردن. هێشتا بڵاوەیان نەکردبوو کە زۆر کەس لە لاوانی کاک نەبی هاتنە لام و بەڵێنیان دا کە هەر لە ئێستاوە بۆ کۆکردنەوەی دەنگ بۆ تۆ وەکار دەکەوین.

من گومانم لەوەدا نەمابوو کەلەم خەباتەدا سەر دەکەوم. چونکە کاندیدی حیزب مستەفای هیجری نەیدەبوێرا بچێتەوە،نەغەدەو نەکەس دەیناسی. لەنێو عەجەمان سێ کەس خۆیان کاندید کردبوو کوردەکان دەنگیان بۆ نەدەدان. یەک لەمەلاعەجەمەکان کەخۆی کاندید کردبوو، مەشهەدی حەسەنقوڵی برادەرمی ناردبوو کەماشێنێکی پەیکانی دەدەمێ بەقازانجی من بکشێتەوە. لەماڵی ماموستا مەلاساڵحی ڕەحمەتی بووین،مەشهەدی هات و پەیامی کابرای گەیاند. ماموستا یادی بەخێربێ،فەرمووی پێی بڵێ، ژنەکەشی بداتێ ناکشێتە وە.

ڕێبەرایەتی حیزبی دیموکرات دەیزانی لەو هەڵبژاردنەدا سەردەکەوم و کاندیدی حیزب لەحەوا دەمێنێتەوە، غەنی بلوریانیان قورمیش کرد کەدەست بەکار بێ. لەشنۆیەبووم، نامەیەکی بەپەلەی مامەغەنیم بۆهات. نووسیبووی:«تکایە بۆکارێکی زۆرپێویست وەرەوە مەهاباد» .سەبارەت بە نووسراوەی مامەغەنی گەرامەوە مەهابادو تەلەفونم بۆکرد گوتم ئەوەهاتوومەوە، وابەپەلە چکارێکت هەیە؟

گوتی کوڕە ئەو سەگبابانە هەراسانیان کردووم، خۆیان گوێنکیان کردوەو دەیانەوێ بەمنی بشۆنەوە. وەرە تکات لێدەکەم خۆت لەم بەزمە بکێشەوە،جەهەنە م بزانین ئەوان چدەکەن . »

گوتم مامەغەنی تازەدەزانی کەتۆیان کردۆتە بەرپرسی گووشوتنەوەی خۆیان. باکومیتەی ناوەندی کۆبێتەوە، منیش دێم قسەیان لە گەڵ دەکەم،

جانەوەدەم بڕیار دەدەم. شەوی دوایی چەندکەس لە ئەندامانی کومیتەی ناوەندی و دەفتەری سیاسی لەماڵی سەیدرەسوڵی رەحمەتی کۆبیوونەوە، بانگیان کردم. دەستیان کرد بە زمانلوسی و شیرەپارانەوە کە :« خۆت دەزانی لەبارودۆخێکی ناسکدایین و دابەشبوونی دەنگەکان بەزیانی ئێمە تەواو دەبێ، ئەوەتا تکامان لەماموستا مەلارەحیمی عەبباسیش کردوە کە لەکاندیدای مەهاباد بکشیتەوە و ئەم شێرە وریویانە. پاش ئەوەی بەتوندی بەسەر ناراستی و فێلبازی نێو حیزبیدا هاتم گوتم :ئێستا کامەتان وەلامی ئەم نامەیە دەدەنەوە کەبەمۆری دەفتەری سیاسی و بێ ئیمزا بۆ تەشکیلاتی شنۆ نووسراوە . دوکتور قاسملو نەهاتبوو،ئەوانیدیکەش تەنیا سەربەردانەوەیان وەلام بوو. گوتم ئەگەر وایە هیچتان ئاگاتان لێ نیە، من لەسەر بڕیاری پێشووی کومیتەی ناوەندی خۆم کاندید کردوەو ناشکشێمەوە. لەبەر ئەوە ی ئێوە درۆتان کردوە و فێلتان کردوەو منیش سەر بۆ فێل و درۆ دانانوێنم. هەستام وەدەر کەوتم .رۆژی دوایی چوومەوە نەغەدە . برادەرێکی ئەندامی چریکی فیدایی خەلک لەفەرمانداری نەغەدەکاری دەکرد. بانگی کردم گوتی:«تیلگرافێکی نهێنی هاتوە، هەلبژاردنی سندوس و شنۆ بۆکاتێکی نادیار وەدوا خراوە .گەرامەوەبۆ مەهاباد. مامەغەنی تەلەفونی کرد و گوتی: «تکات لێدەکەم،گوزەشتت هەبێ و ئەم هەلایە لەکۆل منیش بکەوە .گوتم باشە مامەغەنی لەبەر خاتری تۆ واز دینم. رۆژی ٥٨/٣/١ لەنووسراوەیەکدابۆ کومیتەی ناوەندی رامگەیاند: «بۆ رێز گرتن لەبڕیاری ناهەقی کومیتەی ناوەندی،وە بەلەبەر چاوگرتنی بەرژەوەندی میللەتی کورد بڕیارمدا لەمبارزاتی انتخاباتی بکشێمەوە» .بەبانامەیەکی کورتیشم نووسی و ناردم بۆفەرمانداری نەغەدەو بەخشداری شنۆیە. رۆژی ٥٨/٣/١٤ لەهەلبژاردنی شاری مەهاباد بەچالاکی تا ئێوارە بەسەر سندوقەکاندا

دەگەرا.

دوای تەواو بوونی هەڵبژاردنی پارلمان ،دەبوایە بۆ شورای شار ی مەهابادیش هەڵبژاردن بکریٚ . فەرمانداری مەهاباد لەئاگاداریەکدا رایگەیاند: ئەوانەی بۆ شورای شار خۆ کاندید دەکەن، پێویستە ناوی خۆیان لەفەرمانداری تۆمار بکەن. کومیتەی ناوەندی ،یادەفتەری سیاسی بەدوای هەرای کاندیدی شنۆ ونەغەدە، وەک ئەزموونێکی هاتبێتە دەست، وازی لەدیاریکردنی کاندیدی شورای شاری مەهاباد هێناو رایگەیاند کەتەشکیلاتی مەهاباد کاندیدای شورای شار دیاری بکا . کومیتەی شارستانی مەهاباد، تەشکیلاتی ح.د.ک.ا.رۆژی ٩٨./٣/١٩ بریاریدا ئەم ٧ کەسانەی خوارەوە بۆ شورای شاری مەهاباد کاندید بکا و ناوەکانی نارد بۆ فەرمانداری کەتۆمار بکرێن.ئەم ٧کەسە بریتی بوون لە:

١ . ماموستا مەلا رەحیمی عەبباسی ٢ . کەریمی حسامی . ٣عومەری قازی .٤ محەمەدی عەنتاری ٥. مەلارسولی پێشتماز ٦ . عبدولای شەرەفکەندی ٧ . حوسێنی بەخشی .

## کومیسیونی بازرەسی

لەکونگرەی چواری حیزبی دێموکرات پێشنیار کرا کە کومیسیونی تەفتیش،هەڵبژێردریٚ . لامواپە ٧ کەس هەلبژێردران. ناوی نرا (کومیسیونی بازرەسی)ئەندامانی کومیسیونی بازرەسی،هیچیان رۆژێک لەرۆژان نەکاری حیزبیان کردبوو، ئەرابردووی تێکۆشانی سیاسیان هەبوو تەنانەت هەتا ئەویٚ رۆژیٚ هەر ئەندامی حیزبی دیموکراتیش نەبوون.

هەموویان لە ئیدارەکانی رژێمی پێشووی پاشایەتیدا فەرمانبەر وکارمەندی ئیداران بوون. ئێستا کەهاتبوونە نێو حیزب و ناوی (بازرەس،یا پشکنێر)یان لێ نرابوو، وایان دەزانی وەک مەعموری دەوڵەتی دەبێ دەست لە هەمووشتە لە هەموو کاروبارێکی وەربدەن . کومیسیونی بازرەسی کاری پێراگەیشتنی کەم و کوری رێکخراوەکانی حیزبی و چاوەدێری بەسەر شێوە ی تێکۆشان و بەرێوەچوونی کاروباری حیزبی بوو ئەوان وەخۆ کەوتبوون،قاچاخیان دەگرت، بەتاوانی رۆژنامە [illegible] وە خەڵکیان دەگرت، لە هاتووچۆی خەڵک و ماشینانیان دەکۆڵیەوە.

بەکورتی کاری سیاسی نەبایە، خۆیان دەهەموو شت هە ڵدەقوتاند. چەند نمونەی سەیرم یادداشت کردوون،کە لەسەریان نامەم بۆ کومیتەی ناوەندی نووسیوە :

- مەلامحمدی مەزنە کادرێکی قەدیمی حیزب و ئەندامی تەشکیلاتی مەهاباد، دووکوری پێشمەرگە بوون . ئێوارەیەک لەگوندی دێبزکرەوە دێتە مەهاباد. لەخیابانێ فەتاحی کاویان و دوکتور خسرەوی پێشی دەگرن و دایدەبەزێنن و هەڵیدەپێچن:

. ئەو ماشێنەت لەکوێ بوە؟

. ماشێنی کورەکەمەو پێشمەرگەیە

. ئەو لەکوێی بوە؟

ئێوەو وخەڵکیتر لەکوێ‌یان بوە، ئەویش ئاوا.

دەیهێننەخوارێ و ماشێنی لێ دەستێنن. مەلامحمد هاتە تەشکیلات و هەر ئاوری دێنان. گوتی : . ٢ساڵ پترە ئەندامی حیزبم، ٣ساڵ زیندانی کراوم و منداڵم بە برسیەتی سوڕاونەوە، ئێستا لاپرەسەنی بەسەرداکەوتوو ماشێن لەمن دەستێنن.

تۆزێ هێدیم کردەوەو ناردم ماشێنەکە م بۆ وەرگرتەوە .

ـ جەعفەری قازی ئەندامی چالاکی ڕێکخراوی لاوان، دەچێ ڕۆژنامەیەکی مەردوم دەکرێ و بەدەستیەوە تەماشای دەکا . هەر ئەو دوو مەعمورەی تەفتیش بانگی دەکەنە دەفتەری حیزب و هەزار قسەی پێدەڵێن و بەیت و باوی بۆساز دەکەن .

– تەشکیلاتی شار تەراکتۆری ناردبوولە پیرانشارنەوت بینێ. نووسراوەی تەشکیلاتیشیان پێ دەبێ . موهەندیس ئاریا تووشیان دەبێ و هەڵیاندەپێچێ کەنەوت بۆکوێ دەبەن . تا نامەیەکم بۆ نووسی و سەرکۆنەم کرد.:ناچار ٩٨./٣/١٩ نامەیەکم بۆ کومیتەی ناوەندی نووسی ودەست تێوەردان و کردەوەی شێوە پۆلیسی کومیسیونی بازرەسیم مەحکوم کرد و داوام کرد کە ئایینامەیەک بۆ کومیسیونی بازرەسی دابنێن با وەزیفەی خۆیان بناسن و بزانن کاریان چیە.بەلام ئاوێکی وانەڕژابوو کە بەنامەو ڕەخنە چاری بکرێ.ماکەو مەبەستی ئەم کێرهشێوێنی و هاندانەش ئەوەبوو، تەشکیلاتی مەهاباد،گەورەترین ڕێکخراوی حیزبی دیموکرات ساخ کەنەوە. ساخکردنەوەکەش لەدوو ڕێگایانەوە ئەنجام دەدرا.یەکەم لابردنی من لە تەشکیلاتی شارو یا لانی کەم نەبوونی مەسئولی یەکەم. دووەم تێکدانی ڕێکخراوی لاوان کە چالاکترین ڕێکخراوی حیزب وهاوکاری تە شکیلاتی شار بوو.سەرەڕای تەقەلای زۆر.تاخۆم لە کوردستان مابووم، لەئامانجی یەکەمدا سەرنەکەوتن. بەلام هەڵەی تاقمی حەوتکەسەو بێ تەجروبەیی کورەکانی ڕێکخراوی لاوان بەئاواتی گەیاندن.

## کتێبخانەی پێشەوا.

کابرایەکی بەهایی سەرمایەدارگویا سەریەدام ودەزگای ریژیمی پێشووی پاشایەتی بوو، لەمەهاباد رایکردبوو.دوکانەکەی لەراستە مەیدانی چوارچرا چۆلکرابوو. برادەرانی کومیتەی شار پێشنیاریانکرد کەئەو دوکانە بکەنە کتێبفرۆشی حیزب و برادەرێک سەر پەرشتی بکا. پێشنیارەکە پەسند کرا و برادەرێک دیاری کرا کە وەستاو فەعلە پەیدابکاو ئامادەی بکات.نازانم شەوێک بەچبۆنەیەکەوە لەماڵی سەید عەولای کولیجی دانیشتبووین باسی ساز کردنی ئەو کتێبخانەیە هاتەگۆڕێ، سەید عەولا ٣هەزار تمەنی دامێ، گوتی ئەوە یارمەتی من بۆ سازکردنی ئەو کتێبخانەیە.برادەری دیاریکراو خەریکی سا زکردنی دوکانەکەبوو.رۆژێکیان هات گوتی: ئێمە لەگەڵ ئەو عەلی شەرقییە بێ ناموسە چیکەین؟ ناهێلێ دوکانە کەساز کەین، هەموو رۆژێ دێ خەلکمان لێ کۆدەکاتەوەو دەیکاتە هەرا دلێ ئێوە دوکانی خەڵک داگیر دەکەن. چی دەگەڵ بکەین.؟عەلی شەرقی کابرایەکی سابلاغی بەناومامۆستای مەدرەسەو بە کردەوە ش کلاوچی رذەسپرو حوقەبازو بێشەرەف و دۆستێ نیزیک وگیانی حەسەنی شەرە فی. ساڵی ١٩٥٧ کە تازە لە زیندان ئازاد ببووم خانویەکی پچووکم لە حەسارێکی گرتبوو لەگەڵ دایکم دەژیام ونەدەبوایە لە مەهابادیش بچمەدەرێ.رۆژێک قادراغای ماسوێ هاتە سە ردانم،ئەم عەلی شەرقیەشی لەگەڵبوو کە لەگوندەکەی ئەوان مامۆستای مەدرەسە بوو.باسی قسانکرا، قادراغا

باسی پێشەوا قازی کرد و داخی دەربڕی. ئەو کابرا خۆ فرۆش و بێ ، نامووسە، هەربێ سێو دوو وەک سەک بە پێشەوای وەڕی و قسەی پێگوت. قادراغابە تورەیی بەسەریداهات . من خۆم پێ ڕانەگیرا گوتم هەستە وەدەر کەوە سەگبابی خوێڕی، ماڵی خۆم نەبایە خەراپم پێدەکردی، وەدەرم نا. من لە وڵات چوومەدەرو نەمدیتەوە.کەگەرامەوە بیستم ئە و بێشە رە فە کە مامۆستای گوندی بوە، لە نەخوێندەواری وساویلکەیێ هەمزەی برای قادراغا کەلکی وەرگرتوە، قەباڵەو سەنەدو بەلگەی باغچەو زەویەکانی پێ ئیمزا کردوە و چوە بەناوی خۆی سەبتی کردوون و هەمزاغای فەقیری لە ساجی عەلی داناوە.هەمزاغا رەشورووت مابۆوەو عەلی شەوقیش ببوە خاوەن باغچەو مێشەو زەویو زار. هەمزاغا چوویو لە دادگا شکایەتی کردبوو، بەلام دادگای زەمانی شا. هیچی بۆ نەکرابوو.

کە بووم بەبەرپرسی تە شکیلاتی مەهاباد ،گوندی ماسوودایماویش سەر بەمەهاباد بوون. هەمزاغا هات شکایەتی کرد، مەسەلەکەم لەخەڵکی ماسوودایماو پرسی، کلاو چیەتی عەلی شەوقی وەک رۆژی روناک وابوو.نامەم نووسی بۆ رێکخراوی دایماو کە نەهێڵن ئەو بێشەرە فە بچێتە گوندی و بە هەمزاغاشمان گوت، باغچەو زەویەکانی خۆی بەساحیب کاتەوە. نازانانم دوای ئێمە کێشەکەیان چیبەسەر هات. من ئەوقینەم لەعەلی شەوقی هەرهەبوو، پێشمەرگەم نارد بیگرن، نەیاندیتبۆوە ، ئیتر بەلای کتێبفرۆشیشدا نەهاتبۆوە. دوکان ساز کرا وبرادەرێکمان لێ کردە مە سئول وکتێبی زۆرمان لێدانان.

## وڵات بەرەو شپرزەیی دەچێ.

هەر لەسەرەتای مانگی خاکەلێوەی ٥٩ ـــ مارسی ٩٨. شەڕێکی نارەواوماڵوێرانکەر بەسەر خەڵکەکەماندا سەپێنرا و زیانێکی زۆرمان وێکەوت. .ستوونێکی ئەرتەشی لەتارانەوە دەهات بچێتە سنوور.لە نێوان حیزبی دیموکرات و کۆمەڵە دا ئیختیلاف هەبوو کە ڕێگای بدەن بڕوا ،یا شەڕی لەگەڵ بکەن.حیزبی دیموکرات لە سەر ئەو باوەڕە بووکە مادام ئەرتەش بۆ شەڕ پێشدە ستی نە کردوە،ئێمە لەشەڕدا پێشدەستی ناکەین.پەلام پلانی شەڕسازکردن لە لایەن کاربەدەستانی حکومەت و هێندێ دەستەو گرۆی نێو کوردستان لەوە قوڵتر بوو وابەهاسانی چاری بکرێ. ستون کەوتە بەر پەلاماری پێشمەرگەی کۆمەڵە و شەڕسازبوو، حیزبی دیموکرات بە ناچارتێوە چوو،خەڵکێکی زۆر تووشی کوشتار و ماڵوێرانی بوو، ئەحمەدی عەزیزی مەسئولی تەشکیلاتی سنەو فەرماندە ی هێزی حیزبی دیموکرات برێندار بوون. کورتەی باسی ئەم شەڕەلە لایەکی تری ئەم کتێبە لەزمانی مە لامحمدی جوانڕۆیی دەخوێننەوە.

رۆژی ٩٨./٤/١٧ کومیتەی ناوەندی ح.د.ک.ا.نامەیەکی سەر ناواڵەی بۆخومەینی نووسی. لە نامەکەدا گوترابوو:« ئەگەر کردەوەدژی گەلیەکانی پاسدارانی انقلاب لەکوردستان پێشی پێ نەگیرێ، لەشکر کێشی بۆ کوردستان ڕانەوەستێ، کوردستانی خۆشەویست جارێکی دیکەش تووشی کوشتار و وێرانی دەبێ.حیزبی ئێمە بەئاشکرا ڕادەگەیێنێ کە کوردستان لە تەقینەوەدایە. ئێمە لامان وایە سازکردنی شەڕی براکوژی

لە کوردستان لە هەلومەرجی ئێستادا غەیانەتەبە خوێنی هەزاران شەهیدی خۆشەویستی گەلانی ئێران....» (نامەکە کورت کراوەتەوە).هەرلە گەڵ ئەو نامەیەش حیزبی دیموکرات بۆنیشاندانی حوسنی نیەت و پێشگری لە سازبوونەوەی شەر بەرنامەی ٢٦مادەیی خودموختاری دەستەی نوێنەرایەتی خەڵکی کوردی لە شەش مادەدا کورت کردەوە و دەستەیەکی نوێنەرایەتی بەسەرۆکایەتی غەنی بلوریان بۆ پێشکێش کردنی بەرنامەو پێشنیاری تازەو وتووێژ لەگەڵ دەوڵەت ناردەتاران. بەلاّم سەفەری دەستەی نوێنەرایەتیش بەرهەمێکی نەبوو. بەداخەوە دەقی پێشنیاری شەش مادەیی حیزبی دیموکراتم بەدەستەوە نیە، بەلام وەک نیوەرۆکی بەرنامە کەم لە دەفتەری یادداشتەکاغدا نووسیوە، ئەم مادانەی ژێرەوە بوون:

١. پەسند کردنی خود موختاری خەڵکی کورد لەچوار چێوەی سەربەخۆیی وتەواوەتی ئە رزی کۆماری ئیسلامی ئێراندا.

٢ ـ دیاریکردنی ناوچە ی جوغرافیایی کوردستان بە گوێرەی ویستی زۆربەی دانیشتوانی خەڵکی ناوچە.

٣ ـ پارێزگاری شارەکانی ناوچەی خودموختار بە پۆلیس و پاسداری مەحەللی بسپێردرێ.

٤ ـ ئەو دەرەبەگ و جاشانەی کەدەوڵەت چەکداری کردوون، چەک بکرێن.

٥ ـ حیزبی دیموکراتی کوردستان بەرەسمی بناسرێ.

٦. بوودجەیەکی تایبەتی بۆ ئاوەدانکردنەوەی شارە وێرانکراوەکانی کوردستان دیاری بکرێ.

لام وایە دوای گەرانەوەی دەستەی نوێنەرایەتی حیزبی دیموکرات بوو، ئایەتولا ئەشراقی زاوای خومەینی هاتە مەهاباد و لە سەدی مەهاباد

دابەزیبوو.هاتبوو چاوی بەرێبەرانی بزووتنەوەی کورد بکەوێ .ئێمە لامانوابوو کە کابرا میوانە وباشتر وایە نوێنەرانی کورد بچن بەخێر هاتنی بکەن.من و دوکتور قاسملو چووینە ماڵە ماموستا شێخ عیزالدینی. دوکتور گوتی: کابرا میوانە و هاتۆتە ئێرە. با جەنابت وەک سەرۆکی دەستەی نوێنەرایەتی خەڵکی کورد بچێ بەخێر هاتنی بکا وپاشانیش ئەو دێتەوە سەردانی جەنابت.ماموستا گوتی ناچم.لە پێشدا دەبێ ئەو بێ سەری من بدا.باسێکی زۆرمانبوو، دەلیل و بەڵگەمان بۆ هێناوە، فایدەی نەبوو.ماموستا نەیدەتوانی خۆی بریار بداو دەبواپە پرسبکا، بۆیە فەرمووی دووسەعاتی دیکە وەڵامتان دەدەمەوە. ئێمە هاتینەوەو پاش دووسە عات مەلاعەولا چوو وەڵام بێنێتەوە، کە هاتەوە هەر ئاوری دێنان.جا هەر مەلا مەلای دەناسێ و دەتوانێ نەزەری لەسەر بدا.ماموستا فەرموویبووی ناچم. دوایە دوکتورو مەلاعەولا چووبوون.ئەشراقی گوتبووی : پێشنیاری تازەی حیزبی دیموکرات لە وانەیە بەدە ستکاریەکەوە قەبوڵ بکرێ، ئەگەر داوای خودموختاری ئیسلامی بکرێ.

دوای شکانی هێزی پێشمەرکە شەر لەکوردستان پەرەی دەگرت وتا دەهات لەمەهابادیش نیزیک دەبۆوە.ئەرتەش پەلاماری بەرەو سەقز وبۆکان دەستپێکرد. ٩٨./٤/٢٧ موهەندیس فاروقی کەیخوسرەوی هاتەمەهاباد و گوتی:« شاری سەقز وەبەر تۆپ و خومپارە دراوە و شارزۆر ویران بوە .٥کەس کوژراون، سەقز چۆڵکراوە، رەنگە .١٥ماڵێکی تێدا مابێ.

لەم بارودۆخە ناهەموارەدا هەڵبژاردنی شورای شاری مەهاباد دەستپێکرا.حەوت کەسی کاندیدای کومیتە ی شارستانی مەهاباد زۆربەی دەنگیان بۆ درابوو هەڵبژێران.رۆژی ٩٨./٤/٣. شورای شار بەسەرۆکایەتی ماموستا مەلا رەحیمی عەبباسی سەروان داودی سەرۆکی

شارەوانی مەهابادی بانگ کرد پاش باس و راوێژ لە بارەی ئەمنیەتی شارەوە، بڕیار درا کە٨ . ١ ناوی بدەینێ، بکرێن بە پاسەوان و بەرەسمی لە شارەوانی خزمەت بکەن.مەلارەسوڵی پێشنماز بە مەسئولی ئینترامی شورای شار دیاری کراو بڕیار درا کە ئەم ٨ . ١ کەسە دیاری بکاو بیاندا بەشارەوانی.

کومیتە ی شارستانی مەهاباد (رێکخراوی ح.د.ک.ا.) بڕیاری دابوو بەبۆنەی هەوەڵی مانگی مای خۆپێشاندانێک ساز بکا و هێزەکانی دیکەی کوردستانیش بەشداری خۆیان راگەیاندبوو.لەو کاتەشدا دەستەیەکی نوێنەرایەتی لەلایەن سەرکۆمار بەنی سەدرەوە هاتبوە مەهاباد و هێندێ پێشنیاریان هێنابوو کە ئەگەر لە لایەن حیزبی دیموکراتەوە پەسند بکرێن، ئەوان لە مەهابادەوە خەبەر بدەنە بەنی سەدر و ئەویش لە رادیۆ تەلە فیزیۆنی تارانەوە رێک کەوتن و ئاشتی رابگەیەنێ.بەداخەوە دەقی پێشنیاری ئیسلاحی دەوڵەتم بەدەستەوە نیە، بەلام دەیانگوت کە بەرنامەو پێشنیاری ٦مادەیی حیزبی دیموکرات بە دەستکاریەکەوە لە لایەن خومەینی و بەنی سەدرەوە پەسند کراوە. بڕیار درا دوکتور قاسملو لە وتاری میتینگی هەوەڵی مانگی مای دا قەبوڵکردنی پێشنیارەکانی دەوڵەت رابگەیێنێ. مامۆستاو کۆمەڵە دژی ئەوە بوون.نەیاندەویست ئەو موافەقەتنامە ئیمزا بکەن کە قەراربوو دوکتور قاسملو رابگەیێنێ.ئیدی دوکتور زۆر بەتوڕەیی گوتی: «ئەگەر ئیمزای نەکەن حیزبی دیموکرات بەتەنیا رێککەوتننامە رادەگەیێنێ و لەگەڵ دەوڵەت ئیمزاشی دەکا.» نیوسەعات پێش ئەوەی دوکتور ئاخافتنی خۆی لە مێتنگدا دەست پێ بکا، مامۆستا ناردی و رایگەیاند کە ئێمەش موافقین.دیارە کۆمەڵەش موافەقەتی کردبوو، بۆیە مامۆستا رازی بوو.دوکتور لە مێتینگی هەوەڵی مانگی مای لەوتاری خۆیدا گوتی :«ئەوان پێشنیار دەکەن با ناوی

خودموختاری ئیسلامی بێ. ئێمە بۆ ئەوەی کۆسپ نەکەوێتە سەر ڕێگای ئاشتی و ئاسایش و ڕێککەوتن لەکوردستان، لەگەڵ ناوی خودموختاری ئیسلامی موافیقین»

ڕۆژی ١/٥/٩٨٠ ئەندامانی شوڕای شاری مەهاباد پێش نیوەڕۆ لە گەڵ نوێنەرانی دەوڵەت کە بریتی بوون لە(ئاغای برایمی یونسی ،معتمدی وەزیری وحەسەنی ئەردەلان )لە سالۆنی فەرمانداری مەهاباد دانیشتین و لە سەر بارودۆخی ولات وگێرانەوەی ئاسایش و هێمنایەتی باسێکی دۆستانەمان هەبوو.هەموو داوار پێشنیاری ئێمە وەک شورای شاری مەهاباد ئەوەبوو کە گەمارۆی ئابووری لە سەر کوردستان هەڵبگیرێ و هەموو شتومەکی پێویست هێنانی بۆ کوردستان ئازاد بێ. ئەوانیش بەڵێنیان دا کە لەگەڕانەوەیاندا بۆ تاران لە سەر ئەو مەسەلەیە پێدادەگرن. دەوڵەت هەر لە سەرەتای ئەو ڕۆژەوە بەتایبەت لە کەڵ سازکردنی شەڕی سنە کوردستانی خستبوە کەمارۆ.ی ئابوری وهاتنی نەوت و کازو ئیل وشتومەکی خواردەمەنی بۆ کوردستان قەدەخە کردبوو. نوێنەرانی سەرکۆمار بەکوێرەی قەرارو مەداری خۆیان لە کەڵ بەنی سەدر؛ دەبوایە دوای وتارو ڕاکەیاندنی دوکتور قاسملو بەنی سەدر لەموافەقەتی حیزبی دیموکرات ئاکادار بکەن و ئەویش لە ڕادیو تەلەفیزیو ندا بلاوی بکاتەوە. ئیواری هەر چەندی هەولیاندا نەیانتوانی لە کەڵ سەر کومار قسە بکەن. پێیا ن دەکوتن کە سەر کومار چوتە ئیسفەهان و دەرەتانی پیوەندیگرتنی تەلەیفونی نیە. وە پەلە کەوتن کە خۆ بکەیێنەوە تاران و سەر کومار لە ڕەوەندی وتوویژ و ئەنجامی سەفەرەکەیان ئاکادار بکەن. بە سواری ماشێن کەیاندمانە ورمی کە بە فروکە برونەوە تاران.کاتێک دەگەنەوە فروکەخانەی تاران هەر لەوێ پاسدار دەیانگرن.دوایە کەی ئازاد کران و کەی توانیان سەرکومار ببینن

لێم مەعلوم نیە و سەفەرەکەشیان هیچ ئاکامێکی نەبوو.
هەر وەک باسکرا ، بێجگە لە پەلاماردانی لەشکر و بۆمبارانی کوردستان، حکومەتی ئیسلامی ئێران کوردستانی خستە گەماروٚ ی ئابوریەوە.روژی ١٩٨٠/٤/٢٥ سکرتێری حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران پەیامێکی بوٚحیزب و کوٚمەڵ و رێکخراوەدێموکرات وپێشکەوتوخوازەکانی جیهان و کەسایەتیە سیاسی و بەشەر دوٚست و رێکخراو ی دیفاع لە مافی مروٚڤ نارد. لە پەیامەکەدا گوترا بوو «شارەکانی سنەو سەقزو بانە کەوتونە بەر پەلاماری لەشکرو پاسدارانی کوٚماری ئیسلامی، هەزاران کەسیان کوشتوە، کوردستان لە گەماروی ئابوری دایە...» لە پەیامەکەدا داوای دەنگ هەلبرین ورەخنەو یارمەتیدان کرابوو.روژی ١٩٨٠/٥/٥ خەلکی ئاوارەو دەربەدەری سەقز لە مزگەوتی بوکان هاوشان لەگەڵ خەلکی شاری بوکان کوٚبوونەوەو تیلگرافێکیان بوٚ خومەینی و سەر کوٚمار و پارلمانی ئیران نارد. لە تیلگرافەکەدا گوترابوو« لە تەواوی کاربەدە ستانی ولات و لە هەموو حیزب وریکخراوە سیاسیەکان داوا دەکەین بوٚ براندنەوە ی کوشتاری خەلکی بێتاوان و پێشگری لە وێرانکردنی مالو خانو ی ئەو خەلکەی کەوا ١٨ روژە ئاوارەی شارو گوندەکانی دەورو بەر بوە تەعەهودی ئیسلامی و ئینسانی خوٚتان لە ئاست خەلکی غەدر لێکراوی کوردستان رابگەیێنن». لە تێلگرافەکەدا گوترا بوو، گەلاڵەی شەش مادەیی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئیران، کە سەر کوماریش قەبولی کردوە ،شیوەییکی دروستە بوٚ چارە سەر کردنی مەسەلەکەو داوا دەکەین ئەم گەلا لە تەنبید کراوەیە بە خێرایی و بە رەسمی رابگەیەنری. لە تێلگرافەکەدا دوای مەحکوم کردنی پیلانی ئیمپریالیزم و کوٚنە پەرستی و هاندانی حکومەتی بەعسی عیراق وترا بوو: داوا دەکەین زوٚر بە خێرایی

بۆ برینەوەی وەزعی شپرزەی خەڵکی شەر لێدراوی شارەکانی سەقز و سنەو بانەو مەریوان و گەرانەوەیان بۆ سەر جێو رێی خۆیان و بژاردنی زەرەرو زیانی خەڵک و لابردنی گەماروی ئابوری شارەکانی کوردستان و بەردانی بارمتەکان کارێکی خێرا لە لایەن دەزگا دەوڵەتیەکانەوە ئەنجام بدری. »

بە دوا ی ئاوارە بوونی خەڵکی سەقز و ناردنی ئەم تێلگرافە بۆ خومەینی و بەنی سەدر، کۆمەڵە وەک هێزێک لە کوردستان کە لە گەڵ هەموو چەشنە رێککەوتنێک لەگەڵ حکومەت موخالیف بوو ، بەیاننامەیەکی بڵاو کردەوە هەر چەند روو ی بەیاننامەکە لە خەڵکی سەقز بوو، بەلاّم لە واقیعدا پلارو لاتاو بۆو بە حیزبی دیموکرات و راست ئەو مەسەلە کوردیەی دەگرتەوە کە ئێژی. :(بووکێ لە گەڵ تۆمە خەسو گوێت لێ بێ).لە بەیاننامەی کۆمەڵە دا گوترابوو :« بە بەربەرەکانی سەر رەقانە دەتوانرێ لە گەڵ شەر هەلاّیسێنی هەیئەتی فەرمانرەوا بەرامبەری بکرێ نەک بە کزەڵۆکی و پارانەوە .پاشا ن لە بەیاننامەکەدا گوترا بوو: خەڵکی تێکۆشەری سەقز، هەروەکو لە پێشیش رامانگەیاندوە، بەنی سەدرو شورا ی انقلاب و بە تێکرا دەوڵەتی دژ ی خەڵکی ئێران بڕیاری ئاخریان داوە گەلی کورد چەکێ و سەرکوت بکەن. لە بەرامبەر ئەم بڕیارە وەحشیانەدا خەڵکی خەباتگێر ی کوردیش بڕیاری خۆ ی داوە : بەربەرەکانی گشتی و عادلاّنە و سەر رەقانە، تەنیا لەم رێگایەوە دەوڵەتیەکان نەرم و ئارام دەبن، کزەڵۆکی و پارانەوە،هاوارو پارانەوە لە بەنی سەدری جەلاد، ئیشتیای دەوڵەت بۆ سەرکوتکردنی خەڵکی کوردو فەوتاندنی دەسکەوتەکانی جولاّنەوەو توندو تیژ کردنی جنایەت زیاتر دەکات. کزەڵۆکی و پارانەوە شێوە ی پێشمەرگە تێکۆشەرەکانی نیە، بەڵکو کارو رێو شوێنی ئەوانەیە کە خوێنی شەهیدان

دەکەنە وجەالمصالحە ی مەقام خوازی خۆیان »

لەشارەکانی سنەو بانەو سەقزو مەریوان شەر پەرە ی دەگرت.خەلکی ئەو شارانە ئاوارەو دەربەدەر ببون.دەبوایە یارمەتیان پێبکری.کومیتەی شارستانی مەهاباد- حیزبی دیموکرات- هەوەلی بانەمەری ١٩٨٠ لە بەیاننامەیەکدا داوای لە خەلکی شارو دیهاتی کوردستان کرد کە دە فریا ی خوشک و برا لیقە وماوەکانیان بکەون ویارمەتیان بو بنیرن.

لەم بارودوخە نالەبارەدا، سەرەرای ئەوەی کە شورای شارو شارەوانی هەبون، تەشکیلاتی حیزبی دیموکرات لە مەهاباد ببوە ناوەندی راپەراندنی کیشەو هەرای خەلک و ئەرکی ئیدارەکانی حکومەتی بەریوە دەبرد:کیشەی ئاغاو رەعیەت،دابەشکردنی زەو ی، پێراگەیشتنی شەرو کیشەو دوزینەوەی ماشینی دزراو و...هتد.تووشی روداوی سەیر دەبووین،چەند نمونەم یادداشت کردوون،رەنگە تاریخەکەیان پاش وپێش کەوتبێ :

- نیوارەیەک دەدوازدە کەس هاتنە دەفتەری تەشکیلات، تورە و گرژ.گوتیان حیزبی دیموکرات لیرە دەسەلاتەو بەلام پیشی خەلکی بەرەلا کردوە کە بە کەیفی خۆیان فەقیرو هەژار بروتیننەوە.

گوتم فەرمون دانیشن بزانین چبوە ؟

گوتیان لیرە هەقی معاینەی نەخوش ٢٠ تمەنە.قادری مەحمودزادەکەبەگیانی ئاخیری لەشورەویشی خوێندوە، هاتوتەوە لە جیاتی کزمەگ بەخەلک ٩٠ تمەنی هەقی معایەنە لە ژنیکی فەقیر ئەستاندوە. ئیمەهاتووین پێتان رابگەیینین کە وادەچین بەری دەرگای پیدەگرینو خو پێشاندان ساز دەکەین .

- توزی هیدیم کردنەوە. تەلیفونم کرد، نەختی بە سەریداهاتم و گوتم جاریکی تر وابکەی شاربەدەرت دەکەین .

-عبداللەی مەردوخ لە تەلەڤیزیۆنی مەهاباد کاری دەکرد.لە کۆبوونەوەو خۆپێشاندانەکانی مەهاباد دا تەلەڤیزیۆن جارو بارفیلمەکەی نیشان دەداوە.دوو میتنگی حیزبی دیموکرات فیلمبەرداری کرابون، بەلاّم تەلەڤیزیۆن نیشا نی نەدابوونەوە.هەر لەو کاتەشدا کۆمەڵە خۆ پیشاندانێکی ساز کردبوو، بە بێ بەشداری حیزبی دیموکرات، رۆژ ی دوایی تەلەڤیزیۆن بە درێژ ی نیشانی دابوّوە.برادەرانی تەشکیلات بۆیان ببوە مەسەلەو ناردبوویان فیلمەکانی تەلەڤیزیۆن بێنن.کە دەچن دە بینن عبدللەی مەردوخ فیلمەکانی بردوە.برادەری بەرپرسی ئینتزامی بە تەلەفون جنێو ی پێدەداو هەرەشەی لیدەکا ودەڵێ:« ئێستا دەنێرم دەتگرم ». مەردوخ بە مەلا شیخ عیزەددینی دەڵێ و خۆ دەشارێتەوە. ماموستاش بە دوکتور قاسملو دەڵێ .شەو درنگ دوکتور تەلەفونی کرد و گوتی :« گۆ یا مەردوخیان گرتوە و ماموستا تەلەفونی کردوە مەسەلە چیە ؟ »

گوتم ئاگام لە هیچ نیە .خەبەریان بە من نەداوە.

دوکتور گوتی :« ماموستا تەلەفونی کردوە ئەگەر گرتوویانە بەرەلاّی کەن ». بەیانی عبدللەی مەردوخ لە مەهاباد رایکردبوو، فیلمەکانی تەلەڤیزیۆنیشی لەگەڵ خۆ ی بردبوو.ئیتر لە مەهاباد نەدیتراوە.

رۆژی ۲۱/٤/۱۹۸۰ لە شار ی مەهاباد «کومیتە ی ئیمداد» مان بە سەرۆکایەتی سەید هاشمی سەبیدی بۆ کۆ کردنەوە ی یارمەتی وگەیاندنیبە لیقەوماوان دامەزراند.دوا ی دامەزراندنی کومیتەی ئیمداد رۆژی ۳/٥/۱۹۸۰ لە گەڵ خێزانم چومە تاران کە بەرێی کەمەوە بۆ بولغاریا.تا مەسەلەی پاسپورت و ئیجازەی رۆیشتنی تەواو بوو لام وایە شەش رۆژی خایاند. لەو ماوەیەدا تووشی کاک سامی عبدالرحمان بووم کە ماوەیە کبو گیرابوو تازە ئازادیان کرد بوو.داوا ی لێکردم کە بتوانم

بیبەمە باڵیوزخانە ی سوڤیەت یا بولغاریا بیناسینم و قسەیان لەگەڵبکات.گوتم بۆ باڵیوزخانەی سوڤیەت نە ئیمکانم هەیەو نە کەسیان دەناسم. بەلاّم لە گەڵ کونسولی بولغاریا ئاشنایەتیم هەیەولە سوفیا هاتو چوشمان هەبوە.چووینە باڵیوزخانەی بولغارستان، کونسول بۆ نانخواردن بردینیەوە ماڵیٚ ومیواندارییەکی پیاوانەی کرد.لە گەڵ کاک سامیش تیروپر بەئینگلیسی قسە ی خۆیانکردو پاشان گەراینەوە.

خیزانم ٩/٥/٩٨٠ سەفەریکرد. پیش رۆیشتنی لە تاران دوو جار چووینە کن کاک حەسەنی قزلجی.لەدەفتەری حیزبی توده لە ژوریکی پچوکی بەر تاوی پر لە دوکەڵ، وتارەکانی رۆژنامەی مەردومی دەکردە بەکوردی. نەخۆشی ئیکزیما بەجارێک دەستەکانی شپرزە کردبوو.نارەحەت وبیزار لە سیاسەت و لە ژیان ولە کارەکەی خۆی.بە کوڵیگریانەوە گوتی: ئەگەر ئەو جاریش رزگار دەبم ودەگەمەوە سوفیا تا مردن روو لەم لایە ناکەمەوە. تکای لە خیزانم کرد کە لە سوفیا تا ٣ مانگی دیکەش کریٚ خانوەکەی بۆ بدا، بەڵکو لەو ماوەیەدا لەو بەزمە رزگاری بیتو بگاتەوە بولغارستان.بەداخەوە لە دەست حیزبی تودەو کۆماری ئیسلامی رزگاری نەبوو تا لە زینداندا سەری نایەوە.

رۆژی ١١/٥/٩٨٠ تەلەفونم کردبۆ مەهاباد برادەران هاتبونە فرۆکەخانەی ورمیٚ لە گەڵ ئەوان گەرامەوە بۆ مەهاباد.

لەو ماوەیەدا کەمن لەتاران بووم، دوکتور قاسملو بە دەرفەتی زانیبوو کە یەکی دیکە بکاتە بەرپرسی تەشکیلاتی مەهاباد.لە پیشدا بە کاک نەویدی موعینی گوتبو: « تەشکیلاتی مەهاباد گەورەترین ریکخراوی حیزبی دیموکراتە.پیویستە ئەندامیکی کومیتەی ناوەندی بەر پرسی تەشکیلاتی مەهابادبیٚ. پیشنیار دەکەم تونەم کارە بگریە ئەستۆ ی خۆت.» نەوید گوتبو ی: «من ئەو کارە ناکەم. یەکەم کاک کەریم لە

لایەن کمیتە ی شارستانەوە هەلبژیراوە.دوەم ئەوە کار ی من نیە. من لە گەلْ مامۆستایان کار دەکەم.» کاتیک لەوە ناهومید دەبیْ، داوا لە ئەندامانیکومیتەی شارستان دەکات کۆبوونەوە پیک بینن سکرتیری‌حیزب دەچیْ قسەیان بۆدەکات.برادەرانی کومیتەی تەشکیلات کۆ دەبنەوە.دوکتور دەچیتە تەشکیلات و دوای هیندیْ ڕینوینی و ئامۆژگاری سەبارەت بە گویرایەلی پیْ یان دەلیْ:« دەفتەری سیاسی لە سەر ئەو باوەرەیەکە کاک کەریم بچیتە بەشی رۆژنامە و تەبلیغات لەو کارەدا شارەزایی هەیە. ئیوە خۆتان برادەریکی تر بۆ بەرپرسی تەشکیلات هەلبژیرن، یا دەفتەری سیاسی برادەریک دیاری دەکات».

ئیتر ئەندامانیکومیتەی شارستان بە تیکرایی وەدەنگ‌دین ودەلین :«کاک کەریم بە تیکرایی دەنگ هەلبژیراوە. ئیمە نە کەسیتر هەلدەبژیرین و نە دەمانەویْ دەفتەری سیاسیش کەسیترمان بۆ دیاری بکا.» دوکتور لەم پیلانەدا سەر ناکەو یْ، بەلاْم وەنەبیْ وازیش لە پیلانگیران بینیْ.

لە گەلْ پەریشانی وەزع وهیرشی بەربلاو ی ئەرتەشی دژی گەلی دفتەری سیاسی حیزبی دیموکرات ئەم بەیاننامەی خوارەوەی بلاْو کردەوە:

راگەیاندنیک ۹/۲/۱۸

رۆژ ی ۵۹/۲/۱۷ کوبونەوە ی کومیتەی ناوەندی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئیران لە وەزعی ئیستای ئیران و کوردستانی کولیەوە و لە ئەنجامدا ئەم بریارانەی خوارەوەی دا:

۱ - بۆ ئەوەی جاریکی دیکە دەولەت بکیشینە سەر میزی وتوویژ دەبیْ بە هەمو تواناوە بەرامبەر بە هیرشی هیزەکانی مقاومت بکەین و شەریکی دریژ خایەنی پارتیزانی لە گەلْ بکەین.

۲ ـ نابی ریگای وتوویژ ببەستین و دەبیْ لە هەمو هەلو مەرجیکی

جیددی بۆ وتوێژ بۆ چارەسەر کردنی مەسەلەی کوردستان کەلک وەرگرین.

٣ - بە هیچ جور نابێ لە نێو شارەکان شەر بکەین و پێویستە خۆ لەو شەرەی ئێستای نێو شارەکان دە رباز بکەین و بە گشتی خۆ لەشەری جە بهەیی بپارێزین.

٤ ـ بۆئەو مەبەستە پێویستە هەول بدەین لە زووترین وەختی مومکین دا لە شارە کان دەرچین.

٥ ـ لە چوار چێوەی ئەو سیاسەتەدا بەخشنامەو بەیاننامە بۆ ئەندامانی حیزبو خەلکی کوردستان وگەلانی ئیران و هێزە چەکدارەکان بەریدە کەین.

٦ - پێش ئەوەی خودموختاری کوردستان بە رەسمی بناسری وانتظاماتی نێو خۆ بدرێتە دەست پێشمەرگە (پولیس و ژاندارمری خۆ ولاتی) بە هیچ جور ناچینە ژێر باری چەکدانان.

٧ ـ هەمو ئەندامانی کومیتەی ناوەندی دەبێ پەیرەوی لەو بریارانە بکەن و پێویستە رێکخراوەکانیش لە سەر ئەو سیاسەتە روون بکرێنەوە.

دەفتەری سیاسی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئیران .

بە دوای ئەم بەیاننامەیەدا دەفتەری سیاسی شاری بەجێهێشت و لە دولی شێخان بارەگار خیمەو خەرگای لێ بە عەرزی داداو روژانە لە گەل تەشکیلاتی مەهاباد پێوەندی رادەگرت.لەم بارودوخە ئالوزەدا هێندی کەسی گێرەشێوێنی سەر بە دەستەو تاقمی چەپی خواری ئاژاوەچی دەستیان کردبوو بە بلاو کردنەوەی نووسراوی بێجی و ئیمزا کوکردنەوەو ئاژاوە نانەوە لە نێو بازاردا. حیزبی دیموکراتیش رایگەیاند بوو کە کوردستان سەنگە ری ئازادیەو هەموو حیزب و تاقم و دەستەی راکردو لە تاران ئازادن تێبکوشن، واتە بێن لە کوردستان ئاژاوە بنێنە. لە نێو

حیزبی دیموکرات دا نەبیٚ لە هەمرو کوردستان ئازادی تەواو هەیە.!!
رۆژی ١/٥/٩٨٠ لە دەفتەری شورای شار داتیشتبوم، تەلەفونیان کرد گوتیان تاقمیٚک کوٚ بوونەوە خەریکن بوتکەی رۆژنامە فروٚشی حیزبی تودە ئاگر تیبەردەن.رەحمانی کەریمی ئەندامی کومیتەی ناوەندی حیزب لە لام بوو، رابووین کە چووین،هیٚندیٚ کەسی سەریەگروی چەپرەوکوٚ ببوونەوەو بە ردە فرکی‌یان دەکرد و هەرا هەرایان بوو.چوینە پیش بوتکەکەو هیٚندیٚ قسەمان بوٚ خەلک کردو بلاوەمان پیکردن.رۆژی دوایی شورای شار بوٚ لیکوٚلینەوەی وەزع و تەگبیر بوٚ پیٚشگری لە ئاژاوە چیەتی و دابینکردنی هیٚمنایەتی شار کوٚ بووەو داوای لە کومەلەو چریکی فیدائیش کرد کە بەشداری بکەن: ئەوان نەهاتن، بەلام بە تەلەفون رایانگەیاند کە کاری وادزیو مەحکوم دەکەن. ریکخراوی لاوانی حیزبی دیموکراتیش ٩/٥/٩٨٠ لە بەیاننامەیەکدا لەگەلْ مەحکوم کردنی ئەم کارە ناحەزە داوای کردبور کە پیٚشی ئاژاوە تانەوە بگیریٚ.گیرە شیوین و کوتنە پەرست و شەر هەلایسین دەیانەویٚ وەزعی شار تیک بدەن، ئەوەش لە گەلْ پەلاماوی ئەرتەش و سازکردنی شەر پیوەن

دوای گەرانەوەم لە تاران کە بیستم دوکتر قاسملو دوای لەنەویدی موعینی کردوە بیکاتە بەرپرسی تەشکیلات و دوایەش چوٚتە تەشکیلاتی شار کە بەبیٚ من بەرپرسیان پیٚ یا بیٚ دیاری بکات، داوام لەبرادەرانی ریکخراوی شار کرد کە کوٚبوونەوەیەک پیک بیٚنن و بەرپرسی تازەی تەشکیلاتی شار دیاری بکەن. رۆژی ١/٣/١٣٥٩(٢٢/٥/٩٨٠) ٢٣کەس لە نوینەری ریکخراوەکانی شار ومەلبەندی مەهاباد کوٚبوونەوەیان پیک هینا و ئەم راپوٚرتەی خوارەوە یان پەسند کرد و رونووسیکیان بوٚ دەفتەری سیاسی نارد. ئەوەش دەقی راپوٚرتەکەیە:

«« راپوٚرتی کوٚبوونەوەی ریکخراوی شارستان ریکەوتی ١/٣/٥٩

لەرۆژی ٥٩/٣/١ رێکخراوی شارستانی مەهاباد بە بەشداری ٢٣ کەس لە ئەندامانی رێکخراوی شار وئەندامانی پەسند کراو لە لایەن رێکخراوەکانی ناوچە، بۆ دامەزراندنی تەشکیلاتی شارستان پێک هاتو لەو کۆبوونەوە یەدا پاش باس و لێکۆڵینەو لە سەر کەم و کوریەکانی رێکخراو، هەڵبژاردنی ئەندامان دەستپێکراو بە شێوەیەکی رێک و پێک و دیموکراتیک ئەندامانی بە رێوە بەرایەتی و مەسئولی رێکخراو هەڵبژێردران و بەم جورە رێکخراوی شارستانی مەهاباد ئەرکی سەر شانی مەسئولانی دیاری کرد.

١ ـ مەسئولی رێکخراوی شارستان کاک کە ریم حسامی ئەندامی بەرێوە بەرایەتی لەحەوت کەس پێک هاتو کە بریتین لەو کەسانەی خوارەوە:

١ ـ کەریمی حسامی ٢٣ رای
٢.......... ١٩ ==
٣ ـ ........ ١٩ ==
٤......... ١٩ ==
٥ ........ ١٩ ==
٦........ ١٥ ==
٧ سەعید کوێستانی ١٨

هەروەها مەسئولانی رێکخراوی شار بەگوێرەی خوارەوە مە سئولیە تیان پێ ئەسپێردراوە

١ مەسئولی بەشی تەشکیلاتی رێکخراو ...
٢== === فەرهەنگیان ....
٣ == == کارمەندان ......
٤ == == ژنان

٥ == === مالی ...
٦ === == بازاریان ....
٧ == === لاوان .....
٨ == === پەیوەندی وناتشارات ..
٩ === === ئاموزش .....
١٠ == == کرنکاران .... مزری :تشکیلاتی مهاباد
حزب دمکرات کردستان ایران»

بۆ سکالاو روونکردنەوەی بارودۆخی کوردستان پاش راوێژ و لێکدانەوە لە گەڵ فەرماندارى مەهاباد بە باشمان زانی هەموو فەرماندار و بەخشدارەکانی شارەکانی کوردستان بچنە تاران و لە گەڵ کاربەدەستانی دەولەت سەبارەت بەگەمارۆی کوردستان وتو وێژ بکەن. لە سەر ئەم بۆچوونە فەرمانداری مەهابادو بۆکان و بانە، بەخشداری سەردەشت و شنۆ، فەرمانداری پیرانشار چونە تاران. دەچنە کن سەرۆک وەزیر و لەو کاتەدا کە لە کن سەرۆک وەزیر دێنە دەر، پاسدارو کومیتەچی دەیانگرن. چاویان دەبەستن و دەیانبەن بۆ زیندان. ئێستاش بۆمان روون نەبووە کە عبدالرحمانی بەرزنجی بەخشداری شنۆ چون وەبەر ناکەوی‌وناگیرێ . خۆدەدزێتەوە، تیی‌دەتەقێنێ بۆ سنەوەدەچێتەبانە و سەردەشت و دەگاتەوە پیرانشار. ئێمە لە گرتنی فەرماندارەکان بێ خەبەر بووین، شیخ عبدالرحمان لە پیرانشارەوە تەلەفونی کردو گوتی: « من فلانکەسم. فەرماندار و بەخشدارەکان گشتیان گیراون. من خۆم دەرباز کردوە و گە پیشتومەوە ئێرە ».

رۆژی ٢٦/٥/٩٨٠ کومیتەی تەشکیلاتی شارستانی مەهاباد داوای لە خەلکی شار کرد لە فەرمانداری کۆ بنەوە تا لە گرتنی فەرماندارەکان و بارودۆخی کوردستان بکولینەوە.پاش روونکردنەوەی وەزعی شپرزەی

ولات و ئاخافتنی هێندێ کەس پێشنیارم کرد وەک هەوەڵین هەنگاو پێویستە تیلگراف بۆ خومەینی و بەنی سەدر بکەین و داوای ئازادی فەرماندارو بەخشدارەکان بکەین. پێشنیارەکە قبوڵ کراو تیلگراف نووسراو بەرێکرا . دوای چەند رۆژ فەرماندارەکان ئازاد کران، بەلام گەمارۆی ئابووری لە سەر کوردستان هەڵنەگیرا.

رۆژی ٩٨./٥/٢٧ چوومە سەردانی مەلا محمدی جوانرۆیی کە لە شەری سنە برینددار ببو، لەگەڵ چوار برینداری دیکە لەدەرەوەی شار لە باخی محێدینی بابانزادە دایاننابوون و رۆژانە دوکتور بۆ تیمار کردنیان دەچوو سەری لێدەدان.داوام لە مەلا محمد کرد کە کورتەیێک باسی شەرێ سنەم بۆ بگێرێتەوە. سەرەرای ئەوەی کە بریندار و نەخۆش بوو دەبێ سوپاسی بکەم داواکەمی نەداوە پاش وزەبتێکم بوداناو دەستی پێکردو منیش وا بەکورتی قسەکانی لێرەدا تۆمار دەکەم.

مەلا محمد :« داخ بۆ مەحمود، ئەو رۆژەی کە ئە و خەبەرەم بیست. کوڕ بم مەحمود. موستەحیلە ئەوەی لە سنە دیم لە مەهاباد دیتبم.کارەساتی وا نە بینراوەو نابینرێ.بەلام بەداخەوە ئەوانەی کە ئەو هەمو خوێنەیان دەرشت ئێمە لە ریزی ئەوان بووین. ئێمە بۆ ئەوانمان بکردایە نەماندەکرد.

یەکێتر لە بریندارەکان هەڵیدایە و نۆرەی لە مەلا محمد بریەوەو گوتی:.

- کاک کەریم باش دەزانی ئەم میللەتە، بپرسە لە سالح، کاتێک کەنیشت خەریکبوو گۆنی پر دەکرد لە ماسولە ژن بە سینی پرتەقالەوە دەهاتەناو سەنگەر،کەنیشت زەخمی رائەکێشا بۆ بیمارستان، زیاتر لە ٣. بیمارستان لە ژێر زەمینەکانی سنەدا دروست بوو.

مەلامحمد: هەزاران زەخمی لەو بن عەرزانەدا مایەوە.

دیسان برادەری دیکە : ماموستا ئیژێ هەزار زەخمی، بەخوا پەنج هەزار زەخمیش نە شارایەوە.ماموستا ئەلێ .٣٣٠کەس کوژراوە.ئەم ئامارەی کە بۆ ئیمەیان هاورد، پتر لە..١٧٠ کوشتە بوو.مالبوو لە ناو باغچەو حەوشەکەیدا ٢ دانە٣ دانە شەهیدی ئەشاردەوە. بەخوا وەختێ لەبەر ستاد چون بەر تانگەکانیان گرت، دای لە تانگەکەو توپەکەی گرت لە ساختومانی فروشگاکە، کە گە ورەترین فروشگای ئەم شارەبوو، زیلەکانی ئاگرداو شا یەد لە شارەکانی کوردستان فروشگای واگەورەی تیدا نەبێ، توپ هات دوو نەفەری کوشت، بەقبە گشتی چوە ژیر زەمینەکەوە.تانگەکە ناچاربوو گەریاوە.بەخوا لە ویتنام لە کوبا لەهیچ شوینێک دنیا جەنگ وانەبوە.تانگ راکێتی دائەخست، هیلیکوپتەر راکێتی دائەخست، کالیبر پەنجای ئەبەست، ئەرتەش توپ سەو شەش، سەو پەنج، خومپارە بازوکا، بەجارێک ئاگر بەر ئەبوە شارەکە.

مەلامحمد: ئە و ساختومانە سێ ئەومەی ئەروخا بەسەر یەکا لەبەر دەمیا، ئەو دایک و ژنەی کە دە کوژراو ئەو کچ و کورو ژنو میردەی کە دەکوژراو بریندار ئەبوو ئەهاتەدەری هاواری ئەکرد بەقوربانت بم هەر چالکەم بۆ هەلکەننو برونەوە بۆ نیشەکەی خوتان، بە قوربانتان بم دەی بچنەوە سەنگەرەکەی خوتان، هیچ نیە بەقوربانتان بم.ئیمە دهروژ بوو شاری سنەمان بەنانی دیهات بەخیو دەکرد.چونکە کەس نەبو نانی بکا.قاتو قری نان بوو.نان لە دیهاتە وە ئەهات.دیهات هەموو جونبشی کردبوو. چوار گەرەکی ئەو شارە نەوەد دەرسەدی ساختومانی روخینراوەو سوتینراوە.کورە برون ببینن بزانن لە دنیا شتی واهەیە.لاشەی شەهیدم هەبوە شەست حەفتا گوللەی کالیبری پیوە بوە.شەربوو،سەختیبوو، قارەمانەتی و ئازایەتی بوو.بەلام شەر فروشانو جەنگ ئەفروزان لەپاش روژی حەوتەم رایانکرد.سەنگەریان بەجێ هیلا،سەنگەرەکانیان تەسلیمی

دوژمن کرد.خوێریانە شەریفاوایان تەسلیم کرد بە دوژمن.بون بەباعیسی ئەوەی زیاد لە ٣٥. کەس لەو میللەتە بکوژرێ. من ئەو شەرەم ئیدامە پێ نەدەدا.ئەحمەدی عەزیزی بانگ کەن، لێی بپرسن، شەو پێم گوتن ، گوتم من ئەو شەرە ناکەم.چونکە پێش روێشتنم وەسیەتم‌کرد بور لە شاری سنەدا شەر ناکەم.لە سخنرانی دەی مانگا لە سەر قەبری سمایلی شەریفزادە پێم گوتن ئێمە شەری شاری سنە ناکەین، چونکە دوژمن بێرەحمە. ئەوەی جەنگ ئەفرۆشێ بە میللەتی کوردو دوژمنە بە دەوڵەتی مەرکەزیە،هەر لەو کاتەشدا خویناویەکی سەخت و گەورە بە میللەتی ئێمە تەحمیل دەکا، من بە میللەتم راگەیاند ئەگەر کۆمەڵە دەیەوێ لە شار شەر بکا ئێمە لە گەڵی نین، ئێمە نایکەین، گوێمان لێ بتەکێنن،سبەینێ ئەگەر سنە وێرانبوو،گلەییمان لێ مەکەن، بە برادەرانی مەسئولی خۆم دەجار گوتوە،

بەلام لەگەڵ ئەوەش شەرەکەیان تەحمیل کرد بەسەرماندا.خوێناویان دروستکرد، ئە وانەی دەیانەوێ شەر سازبکەن ئازایەتی خۆیان نیە، نەرمشی رابەرایەتی و کارنادروستی وەک خۆی کە ئێستا بەخۆیم گوت لێرە.تاوانەکانی سازمانی چریکەکانی فیدایی خەلکە وەک لە جەلەسەدا پێم گوتون.گوتم ئێوە سالێکە بەدوای کۆمەڵەدا خۆتان رائەکێشن، نەرمش نیشان ئەدەن، عەلاقەتان لەگەڵ ئێمە تێک ئەدەن، دور ئەکەونەوە، بەلام خۆتان لەگەڵ کۆمەڵە بە هێزوتوانا ئەکرد،میللەتی سنەتان هان ئەدا لێم و شەو لەنێو جێگە دەرتان ئەهێنام، وەرەجوابی خەلقی سنەبدەرە،چونکە خەلق داوای دادگایی حیزبی دیموکرات ئەکا، داوای دادگایی مەلامحمد ئەکا. چەند جار لەسەر خیابان دادگاییتان کردم ودادگایی حیزبی دیموکراتتان کرد لەسەر هەیئەت چون بۆتاران یا لەسەر ستون رەتکردن لەشار. دورومانگ و ١٧رۆژ ئێمە شەری سنەمان دراخست

بەرەتکردنی حەکیمانەی ئەوستونەی کە جاری پێشوو عەوەزمانکردو نەمانهێشت شەر بە شار تەحمیل بکرێ. کۆمەڵە دای لەدارو دای لەبەرد چونکە خۆم مەوجود بووم نەم هێڵاو نەم هێلا. سەرهەنگ سەدری پێشەرەف هەر حیسابی ئەوەی ئەکرد، جوانرۆیی لەشاریی، لەگەڵ دەرئەچوم لەشار ببانوبێکی ئەگرت ، کۆمەڵەش هەر لەشار دەرئەچوم بەزمێکی ئەخولقاند. چبکەم، کە هاتیشم شەرو خوێناو بەسەر شارا تەحمیل ببوو.هەرچی ویستم لێی راکەم، بەلام حورمەت و شەرەفی میللەتەکەو ئەو هەموو خوێنەی رژابوو، ئەو حەملەدرندانەی کە هاتبوە سەر خەلکەکە، ئەو هەموو عالەمەی داگیرسابوو، ئەو عەزیمەت و روحیەتەی کەپەیدا ببوو، بەهاتنەوەی منیش ئەوەندە هومێدیان بەستبوو نەدەکرا، هەر چەندە من تەسمیم گەرانەوەبوو.بە هەرچی نیرو قوەت و ئیمکانیەت و ئیبتکار و عەقلی هەمبوو چورمە مەیدانی جەنگ...دوژمن ئەو پیاوە نەبوو خۆ بگرێ، بەلام بەعزێ تاوان و خەیانەتی مەهاباد وایکرد. کەریمی حسامی شاهیدە کە بۆ گوللە توپی تانگ چییان لێکردم.لە مەیدانی نەخشە کێشاندا کە باشگای ئەفسەران گیرابوو، سێ دەفعە لێماندا، هەر سێ دەفعەکەی هەر چی بۆی هات تانگ ومانگ هەمووی شکا. هەرچی ئەسلەحەو موهیماتیهەبوو،گیرا.مەبتەکان لەسەر جادە کەوتبوون.بەلام دوایی کە توپ دەنێرمە مەیدان و موهیمات دەنێرم کە لەمەهابادەوە بۆم هاتوە، کەوتومە دلگەرمێکە موهیماتی بۆ هێناوم.بەتەمام حەملە بکەم، لەدەلاوە پێشمەرگەم ئامادەکردوە بۆوەی،لێی بدەم،ساختومان برووخێ و حەملەی بۆ بکەم. وەختێ گوللە توپم بۆ دەردێنن، گوللە توپی ٩٠ میلیمیتری توپی تانگە.گوللە توپی ١٠٦ تیە ، ئاواتم تێکدەچێ و پێشمەرگەم هەمووی هەرەس دەهێنێ، پەنا بوکێ بەرم، مەهاباد چیان کرد جەزاو سزا لەسەر ئەوانەی ئەوەیان بەسەر

هێنام. ناردوومی بۆ مەیدانی جەنگێکی سەخت و منطقەیەکی دوور، کەوتوومە ناوی، سەری تێدا بەرز ئەکەم کە وەک پێشمەرگەیەکی فیداکار هەموو وەفای خۆم بەکار بێنم،بەلاّم ئەوەم بەسەر دێنن. ئەچم پەلاماری تەلەڤیزیون ئەدەم، برادەرەکانم خانوویان کون کردوە، بەناو خانوەکاندا دەدوازدە جێگای پشتی ساختومانی تەلەڤیزیۆنیان گرتوە، بەلاّم وەختێ دێمە سەر توێتەقاندن بۆ ئەوەی حەملە بکەم، گوللە توێەکانی ١,٦ دوردە نیزە دەردەچن. ئەو دەم لە ساختومان دووکەڵ هەلئەستێ، لە جیاتی ئەوەی بروخێ . کوا ئەو کەسانەی پاش ٢٠رۆژ کە دەگوزاریشی دە لاپەرەیی و حەوت پەرە یی نیزامی و سیاسی و حیزبی ئەحمەدی عەزیزی مانی ناردە لایان، پارچە کاغەزێک و قەلەمێکی پچکوڵەشیان نەگەیشتە لامان.درایە سرپاسمان دەکەن کە بریندار بووین....»

قسەکانی مەلامحمد گەلێک زیاترن لەوەندە نووسینەوە.لە نیوەی قسەکانیدا دوکتور هات بریندارەکان دەرمان بکا. منیش ئیتر بەجێم هێشتن و لەگەڵ پێشمەرگەکانم گەرامەوە بۆ شار.

## مێتینگی هاوبەش لەگەڵ چریکی فیدایی

حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران لەبەرامبەر هەرەشەی ئەرتەش و ئالۆز بوونی بارودۆخی کوردستاندا هەولێدەدا لە گەڵ کۆمەلە و چریکە فیدایییەکانی خەلکی ئێران لە سەر بەرنامەو نەخشەیەکی خەبات رێککەوێ لەئەنجامی دانیشتن و گفتوگۆدا،حیزبی دیموکرات ولقی کوردستانی چریکەکان لە مەهاباد مێتینگێکی هاوبەش پێکبێنن.دەفتەری

سیاسی بریاری دا کە لەلایەن حیزبی دیموکراتەوە من وتار بدەم. رۆژی ١٩٨٠/٦/٦ لەمیتینگی ناوبراودا ئەم وتارەم پیشکیش کرد کە لە سەر شریت تۆمار کراوە.:

« خوشکو برایانی خۆشەویست ! هاو نیشتمانانی بەریز !

لە پیش ئەوەدا کە بیمە سەر باسی پیکهاتنی ئەم کۆبوونەوەیە و لە سەر ئەو گیرو گرفتانە بدویم کە ئیمرۆ لە پیشمانە، با بەتیکرایی سلاو بۆگیانی پاکی ئەو شەهیدانە بنیرین کەلە پیناو ماف و شەرەف و بوونی نەتەوەکەیاندا لە هیچ مەترسی و بەر هەلستیەک نەپرینگانەوە و گیانی خۆیان لە ریگای ئاوات و ئامانجی گەل و حیزبدا بەخت کرد .

سلاو لەو دایکو بابانە بکەین کە خۆشەویستەکانیان لە پیناو ئازادی و سەر بەستیدا فیدای گەل و نیشتمان کرد.کۆبوونەوەی ئەورۆمان کە بۆ هەوەلین جار لە سەر بەرنامەیەکی هاوبەش لەگەل سازمانی چریکە فیداییەکانی ـ شاخەی کوردستان- پیکدی، هەنگاویکی گەورەیە بۆ یەکیتی خەباتی هەموو هیزە پیشکەوتوخوازەکانی کوردستان و سەراسەری ئیران.

هاونیشتمانانی بەریز ! ولاتەکەمان ئیمرۆ بەقوناخیکی ناسک و پر لەمەترسیدا تیدەپەری.مەترسی گەرانەوەی دەسەلاتی خوینمژەکانی دەورانی ریژیمی پاشایەتی گۆرکراو هەرەشە لە ولاتەکەمان دەکا. ئیمپریالیزمی ئەمریکا لەگەل کۆنەپەرستی ناوخۆ بە هەموو توانایەوە خەریکە جاریکی دیکەش ریژیمی دەستنیژو گوی لەمستی خۆی بەسەر ولاتەکەماندا بسەپینیتەوە.گەلی کورد کە سالەهای سالە بۆ روخانی ریژیمی پاشایەتی خەباتی کردوە، لەشۆرشی مەزنی گەلانی ئیراندا بەشدار بوەو خوینی رژاوە، نایەوی و ریگانادا جاریکی دیکە ببیتەوە ژیر چەپۆک و ولاتەکەی ببیتەوە مەیدانی راو رووتی داگیرکەرانی ئیمپریالیستی

وجارێکی دیکەش قازاخ و ساواکیەکانی سەردەمی دیکتاتۆری ئاغایەتی بەسەر میللەتەکەماندا بکەنەوە.

ئەوڕۆ مەترسی ئەوەهەیە کە دەستکەوتەکانی شۆرشی گەلانی ئێران پێشێل بکرێنەوە و ئەخشەی گەڕانەوەی دەسەلاتی ئیمپریالیزم کە لەلایەن دەزگا جاسوسیەکانی رۆژئاواوە کێشراوە،بەهۆی شەر هەلایسێنەرانی نێو دەزگا دەولتیەکانی کۆماری ئیسلامیەوە دەیەوێ پیادە بکرێ.ئێستا بەئاشکرا دەبینین کە شەر فرۆشەکانی نێو دەزگای دەولتی بە هە موو تواناوە شەر بەکوردستان دەفرۆشن و دەیانەوێ لە رێگای سازکردنی شەرو کوشتار لەکوردستان ئەرتەشی ئێران لە ئەرکی راستە قینە کە پاراستنی سنورەکانی ئێران ودەستکەوتەکانی شۆرشە هەتلە بکەن و رێگا بۆ بە کرێگیراوانی دەرەوە بکەنەوە کە لەهەموو لاوە دەست بخەنە نێو کاروباری ئێرانەوەو بنکەی شەرو ئاژاوەو گێرە شێوێنی لە ولاتەکەمان دامەزرێنن.خوێنمژانی رێژیمی گۆڕ کراوی پاشایەتی لەشەر هەلایسێنەرانی نێو دەزگا دەولتیەکان لەکوردستان کەلک وەردەگرن.دەیانەوێ کوردستان بکەنەمەیدانی شەر وبە کوشتاری خەلکی کورد ووێرانکردنی شارەکانی کوردستان سەرخۆشبن.

حیزبی دیموکراتی کوردستان کەلەبەرامبەر چارەنوسی گەلی کورد وشۆرشی ئێراندا هەست بە بەرپرسی دەکا، لە بۆچونی مەسەلەی کوردستاندا سیاسەتێکی ئاشتیخوازانەی گرتوتە پێش و شەری براکوژی لە کوردستان لە لایەن هەرکەسێکەوە بێ مەحکومی دەکا. هەر لەسەر بنەمای ئەو سیاسەتەیە وەک دەزانن حیزبی ئێمە دەیان نامەو تیلگرافی سەبارەت بەشەر راگرتن و مافی خودموختاری بۆرێبەرانی کۆماری ئیسلامی ناردوەو هەمیشە ئامادەبی خۆی بۆ وتووێژو چارەسەرکردنی هێمنانەی مەسەلەی کورد راگەیاندوەو شەری براکوژی مەحکوم

کردوە.بەلاّم بەداخەوە هەموو جاریٰ حوسنی نیەتی ح.د.ک. وهیزەسیاسیە پیشکەوتوخوازەکانی کوردستان لە لایەن دەولەتەوە بەهەرەشەو شەر و گەمارویٰ ئابورییەوە جوابی دراوەتەوە. سیاسەتی ئاشتیخوازانەی حیزبی دیموکرات بەومانایەنیە کە واز لەخودموختاری بینیٰ.خودموختاری کە ئیستا بوتە دروشمی سەرەکی گە لی کوردو ریکخراوە سیاسیەکانی کوردستان سالەهای سالەح.د.ک. خەباتی بوکردوەو لەم ریگایەدا سەدان ئەندامی تیکوشەری فیداکردوە.ئیمەلامان وایە ناسینی مافی خودموختاریلە لایەن کوماری ئیسلامیەوە دەبیتە هویٰ بەهیزبوونی خەباتی دژی ئیمپریالیستی وگەلی کورد بەهەموو تواناوە لەکوماری ئیسلامی دیفاع دەکا.بوئیمە جیگایٰ داخە کە هیندی لەریبەرانی کوماری ئیسلامی ئەو بوختان و تومەتە وەپالٰ گە لی کورد وهیزەسیاسیەکانی کوردستان دەدەن کە شوڤینیستەکانی ریژیمی پاشایەتی بویان هەلدەبەست.ئیمەلامان وایە لەچوارچیوەی کوماری ئیسلامیدا ئیمکانی ئەوەهەیە کەگەلی کورد بەمافی خودموختاری بگاو هیمنەتی لە کوردستان ولەسەرانسەری ئیراندا سەقامگرتوو بیٰ.راگەیاندنی گەلالەی شەش مادەیی ح.د.ک هەنگاویکی گرنگەبوٰ راگرتنی شەرو پیشگرتنی هەموو جورەگیرەشیوینی و ئاژاوەیەک کە دوژمنانی کوردو کوماری ئیسلامی دەیانەویٰ لە کوردستان سازیٰ بکەن.

هیندیٰ لەروژنامەکانی تاران باسی کوشتاری.تەقینەوەی بومباو خەرابکاریٰ دەکەن لەکوردستاندا.ئەوانە دەبیٰ بزانن لەبارودوخی ئەورویٰ ئیراندا ئەم رووداوانە دینە پیش ولە شەریشدا میوژان نابەشنەوە. سیاسەتی ئیمە شەرخوازی نیە. بەلاّم بەئاشکراش رادەگەیەنین هەتا مەسەلەی کوردستان لەریگای ئاشتی و هیمنانەوە چارەسەر نەکریٰ وهەتا ویست و داخوازی گەلی کورد لەسەر ئەساسی پیشنیاری ح.د.ک.وهیزە

سیاسیەکانی تر نەیەتەدی، پێشمەرگەی کورد چەک دانانێ ویو پاراستنی شە رە ف و کەرامەتی گەلەکەی بەهەموو تواناوە دیفاع دەکا. ئێمە دەمانەوێ پێشمەرگەی ح.د.ک.و هێزەسیاسیەکانی دیکەی کوردستان چەکی خۆیان دژی بە کرێگیراوانی ئیمپریالیزم و کۆنەپەرستی بەکار بێنن و لە سنورەکانی ئێران و دەسکەوتەکانی شورش دیفاع بکەن. بەلاّم ئەوە سیاسە تی چەوت و شەرانی حکومەتە کە رێگای بوگیرە شێوێن و شەرخوازەکان کردوتەوە.لەنێو دەزگای دەولە تی وهەروەها لە کوردستانیش دەستەو کەسی ئەوتو هەن کە لەرێگای شەرەوە دەژین.بوون ومانەوەی خۆیان لەشەرو ناژاوەدا دەبینن.زۆرلە وانە دەیانەوی ئاگری شەر خوش بکەن و لە سەر حیسابی مالوێرانی خەلک ناو وناوبانگ بوخۆیان پەیدا بکەن. تەنانەت ئەوکەسانەش کە لەرابردودا ژیانیان بو خزمەت بەرێژیمی چەپەلی شا تەرخان کردبوو،ئێستا گویا بوونە کوردپەروەر وبو کوردستان هەولدەدەن.ئێمە ئەو خوفروشانە باش دەناسین.ئەوانە هەروەک بومالی دنیا خویان بەساواک و بەرێژێمی شافروشتبوو، ئێستاش بو دولارو دینار خویان بەئیمپریالیزمی ئەمریکاو رێژیی خوێنخوری بەعسی عراق فرۆشتوە و دەیانەوێ لەولاتەکەماندا ئاژاوە ساز بکە.

هاونیشتمانانی بەرێز !

ح.د.ک.ا.هەر جموجولێکی بو توند کردنی شەر لەکوردستان لەلایەن هەر دەستەو تاقمێکەوە بکرێ بەتوندی مەحکومی دەکا.ئێمە رێبەرانی دەولەت بەمەسئولی ئاژاوەو پەشێوی وەزعی کوردستان دەزانین.دەمانەوێ جارێکی دیکەش بە رێبەرانی کوماری ئیسلامی رابگەیێنین کە مەسەلەی کوردستان لە رێگای شەرو گەمارۆی ئابوری یەوە چارە سەرناکرێ. نەهێشتنی بەرنامە کوردییەکان لەرادیو وتەلەڤیزیونی کوردستان،

هەڵوەشاندنەوەی پەروەردەو فێرکردنی سنە، یان هێندی نەخشەی گڵاوی دیکە، کە پاسدارو ئەرتەش بۆکوردستان کێشاویانە،هیچیان ناتوانن مەسەلەی کوردستان چارە سەر بکەن.تاقە رێگای چارەسەرکردنی مەسەلەی کورد،بریتیە لەوەستاندنی شەر وناسینی مافی خودموختاری و راگەیاندنی گەلاڵەی شەش مادەیی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران.حیزبی ئێمە هەروەک لەمەو بەریش زۆرجار رایگەیاندوە،ئامادەیە لەگەڵ بەرێوە بەرانی دەوڵەت لەسەر مەسەلەی کورد بەجیددی وتوویێژ بکا.تەنیا لەو رێگایەوە دەکرێ هێمنایەتی لەکوردستان بەرقەرارببێ و دەستی ئاژاوەچیەکانی ژوورەوەو دەرەوە کورت بکرێتەوە.

ئاغای بەنی سەدری سەرکۆمار دیسان دووپاتەی کردوتەوە کەئەگەر چەکدارەکانی کورد چەک دابنێن، دەچمە کوردستان و ئەوەی من وئێمام پەسندمان کردوە جێ بەجێی دەکەم.ئێمە جارێ نازانین ئەوان چی‌یان پەسند کردوە و چۆن دەسنیان لەگەڵ لەی شەش مادەیی حیزبی دیموکرات وەرداوە.بەڵام ئێمەداوا لەسەرکۆمارو رێبەرانی کۆماری ئیسلامی دەکەین باهەر ئێستا بێنەکوردستان.گەلی کورد میللەتیکی میوانگرە و لەکوردستان پێشوازی لەهەموو میوانێک دەکا.بابێن لەنیزیکەوە بزانن کە پێشمەرگەی کورد بۆدوژمنایەتی کۆماری ئیسلامی چەکی هەڵنەگرتوە.ئەوە شەرخوازەکانی نێو دەزگای دەوڵەتین شەریان بەسەردا سەپاندوەو ناچاریان کردوە بۆ پارێزگاری گەل و وڵات چەک دەست بداتێ. پاشان باسەر کۆمار پەسندکراوەکانی ئیمام رابگەیێنێ تا بزانین چی‌یان پەسند کردوەو چ مافێک بۆ گەلی کورد قایل بوون.

ئەگەر دەوڵەتی کۆماری ئیسلامی ویستی رەوای گەلی کورد بەجێ بگەیێنێ وئەگەر مافی خودموختاری گەلی کورد بسەلمێنێ،ئەودەم پێشمەرگە قارەمانەکانی کوردستان چەکی خۆیان بۆ پارێزگاری کۆماری

ئیسلامی وذژی دوژمنانی گەل بەکار دێنن.ئەگەر مافی خودموختاری و ویستی رەوای گەلی کورد بەرەسمی بناسری، هەر هێزو دەستەو کەسێکی لەکوردستان دژی بوەستێ و بخوازی درێژە بە ئاژاوەو گێرەشێوێنی بدا، بێگومان لە لایەن گەلی کوردەوەریسواو سەرکوت دەکرێ.

حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران ئامادەیە لەگەڵ هێزەکانی تری کوردستان مەسەلەی کورد لەسەر ئەساسی ناسینی مافی خودموختاری و یان گەلاً لەی شه ش مادەیی حیزب لەگەڵ دەولەت چارەسەر بکات. ئیمە داوا لەهەموو گەلی کورد و هێزە پێشکەوتوەکانی ئێران دەکەین کەلە سیاسەتی ئاشتیخوازانەی ح.د.ک.وهێزەسیاسیەکانی کوردستان پشتیوانی بکەن.بالە سایەی یەکێتی و برایەتیمان دروشمی ئەساسی ح.د.ک. دیموکراسی بوئێران و خودموختاری بوکوردستان بەجێ بگەیێنین. سەرکەوتنتان ئاواتەخوازین. »

روژی ٩٨./٦/١١ لە سەر بانگەوازی فەرماندازی مەهاباد بو پێراگەیشتنی وەزعی ئاوارەولێقەوماوانی شەر کوبورنەوەیەکی گەورە لە فه رمانداری پێکهات.لە پێشدا کاک حەسەنی بابەتاهیری فەرمانداری مەهابادوتاریکیداو گوتی :«٤٣روژە کوردستان لەگە ماروی ئابوریدایە.گەلێک شتومەکی تاجرەکانی مەهابادو کالای دەولەتیش کە بو مەهاباد دەهات لە شارەکانی ئازەرشار ریناو گیراوەو هەراج کراوە.سی وپێنج هەزار کەس خەلکی بانە ئاوارەبوون.لەتەرگەوەر ومەرگەوەر ١٤هەزار کەس ئاوارەو دەربەدەر بوون.ئێستا نیزیکەی ٧. هەزار کەس لە کوردستان ئاوارەو بێ پەناو پە سیو ماونەتەوە.ئەو یارمەتیەی کوکراوەتەوە بەشناکات.هێندی گروی سیاسی خێوەت و پەتو وشتومەکی ئاوارەکانی سەقزیان بردوە.دوای وتاری فەرماندار زورکەسیتر وتاری داو پێشنیاری جوربەجور کران.لە هەموان سەرنج راکێشتر، ئاخافتنی جەلیلی

گادانی بوو، بوٚنی شەری لیدە هات و هەرەشە و دەتگوت لە شەرێکی سەرکەوتوانە گەراوەتەوە.حەمەدەمینی سیراجی گوتی:«پێویستە هەرچوٚنێک بێ و لە هەر رێگایێکەوەبێ،کاربوٚ ئەوەبکرێ کەشەر لە ولاٚتەکەمان دوور کەوێتەوە.فیکرێک بوٚ ئەوەبکرێ کە ئاوارەکان بگەرێنەوە سەر جێگاو رێگای خوٚیان.» پاشان کاک حەمەدەمین بانگکرابوو کەگوٚیا:(دژی حیزب قسەی کردوە)!

لەوتاری خوٚمدا هێندێ ئەژمار و بارستایی یارمەتی کومیتەی ئیمدادم بوکوٚبوونەوە روونکردەوە. بەگوێرەی سیایی و ئەژماری کەکومیتەی ئیمداد بوتەشکیلاتی مەهابادی ناردبوو، لە ماوەی ٥٠ روٚژدا،دوومیلیوٚ و٣٠٠هەزار تمەن پارەی نەغد کوکرابوٚوە.باری ٧ لوٚری خواردەمەنی و شتومەک بوٚ لیقەوماوەکانی بانە ناردرابوو.باری٣٩ لوٚری بوٚ لیٚقە،ماوەکانی سنەو دیواندەرە چوو بو. باری ٣٧ماشێن بوٚ شنوٚ و ١٢لوٚری بوٚمەریوان ناردرا بوو.سێ هەزارکەسی خەلٚکی سەقز هاتبوونە مەهاباد و لە مەدرەسەکاندا نشتەجێ کرابوون.لە هەوشار ٥٠٠ماڵوخێزان ئاوارە ببوون. لە مەرگەوەر ٣١گوند چوٚلکرابوون.داوام لەخەلٚک بە تایبەت لە دەولەمەندەکان کرد کە پتر یارمەتی بکەن.

ئەگەر هێرشی ئەرتەش و جنایەتی پاسدارانی ئیسلام ببوە هوٚی گەماروٚی ئابوری ودەربەدەری خەلٚک، کەمو کوری و ناتەواوی نێو حیزبی دیموکرات و بەشی پێشمەرگەش دیاردەیەکی کەم داخدار نەبوو.سەبارەت بەهێندی لەو رووداوانە نامەم بوٚ دەفتەری سیاسی نووسیوە کە وا باسیان دەکەم:

- لە هەوشارسەرپەلی پێشمەرگە سندوقە فیشەکان لە نێو ماشێنی خوٚیدا رادەگرێ وهەر نەفەرە ی چل فیشەک دەدا بە پێشمەرگە.لە پر

بەسەر شەڕ دادەکەون.فیشەکیان لیٚدەبڕیٚ و ٩پیٚشمەرگە شەهید دەبن.سەرپەل لەگەلٚ پیٚشمەرگەیەک کە لەشەڕدانابیٚ، بەسندوقە فیشە کە وە دەگەڕیٚنەوە. کاتیٚ لە ئیندرقاش چومە سەرەخوٚشی، لە مزگەوت خەلٚک داوای سزادانی بەرپرسی ئەم کارەساتەی دەکرد.بەفە رماندەی هیٚزی پیٚشە وام گوت کابرا بیٚنیٚ ودادگایی بکا.سەید رەسولی ورچانیان هیٚنا تەشکیلات، ئە و پیٚشمەرگەی خەلٚکی ئیندرقاشی کەزیندوو مابوو، بە رەو روو پیٚی گوت : هەر چەندی پیٚشمەرگە هاواریان کرد کە چل فیشەک بوٚ شەڕ نابیٚ توٚ جوابت نە دانەوەو فیشەکت نەدانیٚ.فەرماندەی هیٚزی پیٚشەوا رووداوەکەی نووسیٚ بوٚدەفتەری سیاسی و داوای سزادانی کرد. بە لاٚم هەر ئەوەندە دەرکرابوو.

- لە خەلیٚفانی سندوسی پیٚشمەرگە دەیانەویٚ بچنەنیٚو گوندی.کوٚیخا مەحمودی بالغچی خەبەریان دەداتیٚ کە پاسدار وموجاهیدی نەغەدە شەو هاتونە نیٚو گوندی و لە کوٚلاٚن و سەربانان لە مەتەریٚزاندان. بانەیەن. جوابی ئەم پەیامە دلسوٚزیە نادەنەوە . شوٚڕ دەبنەوە نیٚو گوندی، پاسدار لیٚیان ڕادەبن ٣ پیٚشمەرگە شەهید دەبن.

- سەروان نەفشین هەر وەک لە شەر دانەبیٚ، راست دەچیٚتە بەر دەستی پاسداران لە بنزینخانەی میانداو وبە هیچ و خوٚرایی شەهید دەبیٚ.

- لە مەهاباد پیٚشمەرگە بە ماشیٚنی سەرئاواڵە بەنیٚیو شار و بەپیٚش بنکەی پاسداراندا دەسوڕیٚتەوە، تەقەی لیٚ دەکەن و شەهید دەبیٚ.

بیٚجگە لە وانە گرتنی خەلٚک و ماشیٚن دزینیش وەک مودی لیٚهاتبوو. خەلٚکی بیٚگانەی شارەکانی میانداو یا ورمیٚ کە هاتبا مەهاباد دەگیراو تا دەرباز دەبوو ماوەیە کی پیٚدەچوو. روٚژیٚک وسیٚن مەراغەیی ئە ندامی حیزبی دیموکرات لەتەشکیلاتی شار وەژوور کەوت هەر قوڕی دەپیٚوا.لیٚیان پرسی چیە چقەرماوە ؟ گوتی کاکە پیٚشی ئەو بەرەلاٚییە

بگرن. لە پێش دوکانی غەفوری مەنسوری ڕاوەستاوم، چەکدارێک هاتوە دەڵێ تۆ عەجەمی، یالاّ وەپێشم کەوە.هەر چەندیپێی دەڵێم : من خەڵکی ئێرەم و ئەندامی حیزبم،دەست هەڵناگرێ،تا غەفور نەجاتی داوم. ناردم کابرایان هێنا،تفەنگێکی درێژ دەشانیدا، ئەحمەدە کوێر خەڵکی گەرگولی خواری.چوتە لای سەرگورد عەباس شەهید،تفەنگێکی ویداوە کە لە شورای تیزامی لە بەر دەرگا راوە ستی.تفەنگەکەیان لی ئەستاند و تەلەفونم کرد بۆ سەرگوردی رەحمەتی.گوتی ئەوە فەقیربوو ، ئەو تفەنگەم دایە کە لێرە کارێکی پی بکەن. تکایە تفەنگەکەی بدەنەوەو بینێرەوە ئێرە ناهێلم وەدەر کەوی.کابرام بۆ سەرگورد ناردەوە. پاش چەند رۆژ بو بەشداری لە کۆبوونەوەی کادرەکانی شارویران دەچوومەگو ندی کوسە کەرێزە. لە دەرەوەی شار ماشێنێک دە هات، ڕاوەستا و دوایە کەوتەوەری.کە گەیشتینێ، دیسان ئەحمەدە کوێر بووماشێنی ڕاگرتبوو. ڕاوەستام و بانگم کرد، پرسیم لێرە چدەکەی، ئەو ماشێنەت بو ڕاگرت ؟
-هیچ... هەر بۆیە بزانم لەکوێوە دێت
بە پێشمەرگەکانم گوت تفە نگەکەی لی وەرگرێ. گوتم لەو شارەت بینمەوە گوێت دەبڕم.تفەنگەکەم بۆ سەر گورد ناردەوەو ئەحمەدە کوێرم ساڵی ۹۸۲ لە گوندی گەرکول دیتەوە.
. ڕوژێک برادەرانی چومی مەجیدخانی بریاریاندابو لە گوندی قەرەموسالیان کۆبوونەوەیان هەبێ.داوایانکرد بوو بەشداری بکەم.گەیشتمە ئەمیراباد ولەکن پێشمەرگەکان دابەزیم. دیتم غەفوری خوارزای سەید عەولای ئیسحاقی لەگەڵ دوورکەسبتر لەوێیە. غەفوور پێش شەری سێ مانگە لەوێ سەر پەل ببوو.ڕایکرد بوو، لە وزیندەری چوار تفەنگی دابوو بە ئیمەو وازی هێنا بوو.لێم پرسی لێرە چدەکەی؟
. دەچمە شامات و هێزی بەرگری دادەمەزرێنم. سەرگورد عەبباسی

ناردوومی.

سەیر ئەوەبوو ناوچەی شامات لە باری تەشکیلاتی و نیزامی و زیبک و زاکونەوە خاوێنترین بەشی تەشکیلاتی حیزبی بوو.گوتم بگە رێوە هەقت نیە بچیە ئە و گوندانە. نامەیەکم بۆ سەرگوردی نووسی و بە پێشمەرگەکانم گوت بیگێڕنەوە.من هەمیشە پێم لە سەر ئەوەدادەگرت کەبەشی نیزامی پێویستە لەژێر فەرمان و ئەوامیری بەشی سیاسی حیزب دابێ.بەکورتی ناتەواوی یەکجار زۆربووروکە هەمووی لە نووسینەوە نایەن. دیارە کۆمەڵەو چریکیش بەشە دەسەڵاتی خویان بۆ گرتن وکوشتن بەکار دەهێنا.قوڵە رێکخراوی چە پی خواری راکردووی تارانیش جێگای ئاژاوەی خۆیان لە کوردستان دیتبوو. هیرۆئینی و تریاک فرۆشی ئێرانیش لە کوردستان دەگیر سانەوە.

- رێکخراوی لاوانی حیزبی دێموکرات

رێکخراوی لاوانی حیزبی دێموکرات چالاکترین و بەکارترینی تەشکیلات و رێکخراوەی حیزب بوو.کاری چاپەمەنی و نووسینی شوعار و سازکردنی میتینگ و کاری تەبلیغاتی لە ئەستۆی ئە و رێکخراوەیەبوو. دوای کونگرەی چوار کۆنە پەرستی نێو حیز بۆ تێکدانی ئەم رێکخراوە چالاکە کەوتە خۆ.بیانوویان ئەوەبوو گۆیا ئەوانە سەر بەتودەن.دوکتور قاسملو پێشنیاری کرد و گوتی :« لە بەر ئەوەی ئەم ناوە وەناوی «سازمان جوانانی حزب تودە» دەچێ باناوەکەی بگۆڕین و بیکەین بە«یەکێتی لاوانی حیزبی دیموکرات«. بەلای منەوە هیچ قە یدی نەبوو.بەتایبەت دەیگوت ئەگە ر ناوی یەکێتی لە سەر بێ،کەسانی غەیرە حیزبیش دەتوانن ببنە ئەندامی.واتە دەبێتە رێکخراوێکی سەر بەحیزب و یا لایەنگر حیزب.

ناوەکەیان گۆڕی، بەڵام بەکردەوە دەرکەوت مەسەلەکە لە وەقوڵترە.

هەر چەندە کورەکانی ڕێکخراوی لاوان کە بەم نا وە کاریان کردبوو، لەم ناو گۆڕینە ڕازی نەبوون، بەلام ملیان ڕاکێشا و لەگەڵ تەشکیلاتی مەهاباد تێکۆشانی خۆیان درێژە پێدەدا.دیارە ڕێبەرایەتی حیزب بەوەندە ڕازی نەهێنا.بە پێچەوانەی ڕێو شوێنی دیموکراسی کە زۆریان باسدەکرد، بەبێ کونفرانس و هەڵبژاردن چەند کەسیان لە ڕێبەرایەتی «یەکێتی» لابرد کە لە سەرەتای شۆڕشی ئێرانەوە بە چالاکی لە ڕیز ی حیزبدا تێکۆشا بوون.چەند کەسی گوێ لەمست و دەروێشی خۆیان هێنا بە سەر یەکێتیدا سەپاند.دیارە تاوانێکی نەبەخشراوی «ڕێکخراوی لاوان» ئەوەبوو کە لەگەڵ تەشکیلاتی مەهاباد کە من بەر پرسی بووم هاوکاری نیزیک و برایانەیان هەبوو. بەتایبەت لەگەڵ شەخسی من پێوەندی دۆستانەو ڕەفیقانەیان توند بوو.ئەوە ش وەنەبێ کوێر کوێرانە بوربی. دەرسم پێ گوتبوون ، ڕێنوێنیم دەکردن. لە شەری سێ مانگەدا لەگەلم بوون. بەراستیش لە چوارچێوەی سیاسەتی حیزبی دیموکرات نەدەچوونەدەری.پاش ئەو سەپاندنە نابەجێیە کورەکانی ڕێکخراوی لاوان ها تنەلام و نامەیەکی مەعقول و بابەتیان نووسیبوو، لەم بریارە ناحیزبیانەی دەفتەری سیاسی ڕەخنەیان گرتبوو. من بەڕاشکاوی و دۆستانە پێم گوتن، کە پێویستە لە ناو یەکێتی دا بمێننەوەو بۆ بریاری دەفتەری سیاسی مل ڕاکێش تێکۆشانی خۆتان درێژە پێبدەن و لە ماوەی تێکۆشاندا داوای کونفرانس و هەڵبژاردن بکەن . بەداخەوە هێندێ لە لاوەکان وەها کەوتبوونە ژێر تەئسیری ڕاوێژ کەرو دۆستە نەزانەکانی حیزبی تودە، هەلو مەرجی کوردستان و قوناخی بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کوردیان لێ تێکچوو بوو.

ئەگەر ڕێبەرایەتیحیزبی دیموکرات بە قەولی خۆی دەیویست « حیزب پاک کاتەوەو تەنیا(دیموکرات)لە نێو حیزبدا بیلێتەوە» ڕێبەرایەتی

حیزبی تودەو راوێژ کەرە نەزانەکانی دەمێکبوو خەریکبوون کۆمەگ بەو ئامانج و مەبەستەی رێبەرایەتی حیزبی دیموکرات بکەن .

ئەگەر کورەکانی رێکخراوی لاوان لە بەر بێ تەجروبەیی و کرچ و کاڵی سیاسی و لە ژێر تەئسیری کەسانی نەزاندا لە یەکیتی لاوان هاتنە دەری، تاقمی حەوت کەسە بە هەنگاوی چەوتی جیابوونەوە گە لێک لەوان خەراپتر کۆمەگیان بەو ئامانجەکرد.ئەوانیش لە ژێر تەئسیری رێبەرایەتی هەلپەرستی حیزبی تودە، بێ لێکدانەوەی بابەتی وەلسەنگاندنی بارودۆخی کوردستان لە حیزبی دیموکرات جیا بوونەوە و رێگایان بۆ سەپاندنی دیکتاتوری وریبازی ناراست چۆلکرد.

(لێکۆلینەوەی ورد و زانستیو بابەتی ئە باسەم بۆ بەرهەمیکی تایبەتی هێشتوتەوە ؤ هیوادارم بتوانم بەدرێژی خوێنەرانی بەرێزی کورد شارەزای ئەم باسە بکەم)

## جیابوونەوە لە حیزبی دێموکرات

رۆژی ۱۹۸./٦/۲۱ لە ماڵی سەید ئەجمەی حوسێنی میوان بووم، دەمی نیوەرۆ کاک ئەویدی موعینی هاتە لام، بەیاننامەیەکی درێژی چەند لاپەرەیی ویدام کە لەلایەن (بای فەوزیەی قازی ،غەنی بلوریان ،دوکتور رەحیمی قازی ،فاروقی کەیخوسرەوی ،هێمنی شاعیر ، ئەویدی موعینی وئە حمەدی عەزیزی یەوە . ) ئیمزا کرابوو.دەستم کرد بەخوێندنەوەی هە ر لەهەوەڵی پێداچوونیدا شێوەو شەقڵی نوسینی رێبەرایەتی حیزبی تودەم هاتە بەر چاو. من ماوەیەکی در یژ لە رادیودا لەگەڵ نووسین و درێژ دادڕی و ڕاری سەر کاغەزی رێبەرانی حیزبی تودە شارەزاییم

هەبوو.نەوید بۆ یە هاتبوو کە منیش رەگە ڵیان بکەوم و قەولی هاوکاری بدەم. گوتم دیارە لەگەڵ رەخنەگرتن و تێکۆشان بۆ راستکردنەوەی هەڵەکان موافیقم. بەلام دژی جیابوونەوەو لەتکردنی حیزبی دیموکراتم.لەم هەلو مەرجەدا جیابوونەوە بەقازانجی بزووتنەوەی کورد نازانم.
نەوید گوتی: تەواو بوە، بڕیارمانداوە و ئیعلامی مەوزیعمان کردوە.
– کەوابوو هیچ ... ئەگەر بڕیارتان داوەو تەواو بوە، بۆ هاتووی پرسم پێدەکەی؟
– بۆ پرسکردن نەهاتووم، هاتووم داوات لێبکەم لەگە ڵمان بی.
گوتم پێم کارێکی هەڵەیە و لەگەڵتان نابم. نەوید رۆیشت. من بیرم لە وەکردەوە ئەوانە منیان بەدۆست و هاوکاری خۆیان دەزانی و بە چە پیشیان دەناسیم، بۆچی جارێک ئەو فیکرەیان لەگەڵ من نەهێنا گۆڕێ؟ بێجگە لەوە تەشکیلاتی مەهاباد گە ورەترین و چالاکترین رێکخراوی حیزبی دیموکرات بوو، منیش بەر پرسی بووم، بۆچی غەنی بلوریان جارێک نەهات نەک هەر لەگەڵ من، بەڵکوو لەگەڵ کومیتەی شارستان، یالەگەڵ رێکخراوەکانی حیزب مەسەلەی ناکۆکی نێو کومیتەی ناوەندی باس بکا و بەگوێرەی پێرەوی نێو خۆی حیزب بۆ چارەسەر کردنی ناکۆکی داوای کونفرانسی حیزبی بکات ؟
دوای بیر لێکردنەوەیەکی زۆر لە سەر دوو خاڵ یان دوو هۆ ساخبوومەوە.:
یەکەم سەبارەت بەخۆم کە پرسیان پێنەکرد بووم، گەیشتبوومە ئەم نەتیجەیە کە : حیزبی تودەی ئێران لە رۆژنامەی مەردوم دا حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێرانی بەسێ دەستە یا رێباز دابەشکرد بوو.:
١ـ عناصر مخرب اگاه
٢ـعناصر ناسیوتالیستی افراطی

٣ ـ عناصر صدیق اگاه

پاشان روونی کردبووەو نووسیبووی :«رێبەرایەتی حیزبی دیموکرات دوای شۆرشی ئێران کەوتە دەست گروهی یەکەم بە سەروکایەتی عبدالرحمانی قاسملو. گروه دوەم کە (ناوی نەهێنا بوون) ناوی بو ئاشی گروهی یەکەم هەڵدەبەست و ببوە داردەستی گروەی(١). گروه (٣) کە عناصر صدیق وئاگاه و دیموکراتی راستین بوون، حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران (پیرەواتی کونگرەی چوار) یان پێک هێنا و لە ئاست شورش و کوماری ئیسلامی ئێران و خەباتی دژی ئیمپریالیستی ئەمەگداری خویان راگەیاند»

جامن بیرم لێکردەوە، بەو باس و کێشەی رابردوو کە لە سەر مەسەلەی کورد لە گەڵ رێبەرایەتی حیزبی تودە بوومە، دەبی ناسیونالیستەکەمن و کەسانی وەک من بووین.غەنی بلوریان و برادەرانیشی کە(عناصر صدیق وئاگاه و دیموکراتی راستین) بوون، راویژ کەریشیان حیزبی تودە بوە، نەدەکرا مەسەلەیەکی ئاوا لەگەڵ (ناسیونالیستیک) بیننە گوڕێ و پرسی پێ بکەن.هەر بۆیەش یەکجار مەسەلەی جیابوونەوەیان لەگەڵ من باس نەکرد.

دوەم سەبارەت بە جیابوونەوە پێم وابوو غەنی بلوریانیان وا لە خشتەبردبوو کە گویا وڵاتانی سوسیالیستی پشتیوانیت لێ دەکەن و ئیمام خومەینیش خودموختاری دەدا بەئێوە.خۆ ئەگەر خودموختاریش نەدا ناشێ بەگژی دابچین، چونکەدژی ئیمپریالیزمە.!! رەنگە بو چونەکەم تەواو نەبێ و گەلێک هوی دیکەش هەبووبن، بەڵام بەبیروڕای من ئەو هەڵەیەی ئەوانکردیان بە هیچ بروبیانویێک پینە ناکرێ.

دوای بڵاو کردنەوەی بەیاننامەی حەوتکەسی زوربەی خەڵک لایان وابوو منیش لەگەڵیانم. کەوتبوومە بەر پرسیاران.لە نێو شار، لە لادێ،لە

نێو ڕێکخراوەکانی حیزب، لە لایەن حیزبە کوردیەکانی کوردستانی عیراقەوە نامەی پرسیارم بۆ دەهات. لە هەمان ناخۆشتر کۆنە دۆستێکی فرە خۆشەویستم تەلەفونی کرد بێ ئەحواڵپرسیجاران گوتی وەڵاهی لێت زیز بووم و ناتدوێنم.

- بۆ چی .. چقەوماوە ؟ پێم وانیە بەراستیت بێ !
- چۆن .. تۆ لەگەڵ ئەوانە چووی،حیزبت بەجێ هێشتوە ؟

کوڕەکانی ڕێکخراویش کە لە یەکێتی لاوان جیا ببوونەوەو دەرکەوت زۆریان هەر پێشتر تودەیی بوون و خۆیان خزاندبوە نێو حیزبی دیموکرات، بڵاویان دەکردەوە کە فلانکەسمان لەگەلە.ئەمجار کە دەرکەوت من لەگە لیان نیم و ڕێگای ئەوانم پێ چەوتە، دەستیانکرد بە بڵاو کردنەوەی بوختانی ئەوتۆ کە نەک هەر فری بەراستیەوە نەبوو، بە لکوولە ڕێگای شەرافەت وئوسولی دۆستایەتیش بەدوور بوو.هێندێ کەسی گوێ لەمست و بەرەلاش کە لە دەورو بەری دەفتەری سیاسی کۆکرابوونەوە، ئەوانیش لەدەوروبەری من قوتەقوتیان بوو کەبزانن داخوا لەگەڵ نە و دەستەیە هاوکارم یان نا ؟

ڕۆژی ١٧/٦/٩٨. هەواڵدەری ڕۆیتەر لەتارانەوە تەلەفونی کرد وپاسوخوا سی جیابوونەوەی غەنی بلوریانی پرسی. پێمگوت : حەوتکەس لە ئەندامانی کومیتەی‌ناوەندی بەیاننامەیەکیان بڵاو کردوتەوەو لە حیزبی دیموکرات جیا بوونەوە. لام وانیە لە نێو حیزبدا تەئسیرێکی بەرچاوی هەبێ.کابرا پرسی : ڕاستە دەڵێن کەریمی حسامیش لەگەڵیانە؟

- نا ڕاست نیە
- لە تاران وا بڵاو بوتەوە کە حسامی لەگەڵیانە دەمویست بزانم.
- تۆ تەلەفونت بۆ کوێ کردوە ؟
- بۆ تەشکیلاتی حیزبی دیموکرات لە مەهاباد

- راستە ئەوە کەریمی حسامی یە لەگەڵ تۆ قسان دەکا.
- چۆن بزانم خۆیەتی ؟
- تەشریف بێنە مەهاباد دەزانی .

رۆژی ١٩٨٠/٦/١٨ بەیاننامەی دەفتەری سیاسی لە ژێر سەرخەتی: (خەیانەتی گروهی حەوت نەفەری)لە سەر جیابوونەوە ی ئەم حەوت کەسە بلاو کرایەوە.لە بەیاننامەکەدا بە خائین و بە جاش ناویان برد بوون. رۆژی دوایی لە سەر نووسین و بەکار هێنانی وشەی (جاش) نامەیەکم بۆ دەفتەری سیاسی نووسی و لە بەکار هێنانی وشە ی (جاش) رەخنەم گرت. نووسیم زۆر شەرمە وشەی جاش بێتە نێو ئەدەبیاتی حیزبی ئێمە.جاش بەو کەسانە دەگوترێ کە دژی بزووتنەوە چەکیان هەڵگرتبێ و دژی حیزب شەریانکردبێ . ئەوانە چەکیان هەڵنەگرتووە و بیروڕایەکی جیاوازیان هەیەو جیابوونەوە.باشترە بۆ ڕێگای چارە کردنی ئەو مەسەلەیە تێبکۆشین.

رۆژی دوایی کاک جەلیلی گادانی پەیدا بوو. گوتی :(نامەکەت لە دەفتەري سیاسی خوێنرایەوە و بەلایەنگری ئەوان حیساب کرای. وشەی جاش بۆ ئەوانە پڕ بە پێستیەتی. ئەوانە جاش و خائینن ). باسکردن لەگەڵ کاک جەلیل بێفایدە بوو.لە دەفتەری سیاسی بەجاش دانرابوون ، ئیتر لای ئەو تەواو بوو. لەم بوارەدا قسەیەکی کاک نژادم وەبیر هاتبوو.ساڵی١٩٦٣ کە شەر لە کوردستان توند بووو رۆژنامەی پراڤدای سۆڤیەتی لەوتارێکدا لە باسی شەری کوردستانی عێراقدا نوسیبوی:«ژەنراڵ جەلال تاڵەبانی».پاشان پریماکوف لەگەڵ مام جەلال وتووێژ دەکاو لە ئاخافتنەکانیدا هەر دەڵێ:«ژەنراڵ».هەر چەند مام جەلال دەڵێ ژەنراڵ نیم فایدەی نابێ. لەپراک بووین باسکرا. کاک نژاد گوتی: کاکە پرافدا نوسیویەتی ژەنراڵ. هەتا جارێکی تر نەنوسێتەوە ژەنراڵ

نیە، هەر ژەنرالەو روس نایگوڕن. لە دەفتەری سیاسیش ماموستا مەلاعەولاْ نوسیبوری جاش. دوکتور قاسملوش دەستی لیْ نەدابوو. ئیتر باسکردنی لەگەڵ کاک جەلیل بیْفایدە بوو.

چەند روْژ دوای جیابورنەوەی تاقمی حەرتکەسی، بەیانیەکی زوو لەدوام هاتن گوتیان دوکتور قاسملو لە ماڵی عەلی حەسەنیانی یەو بانگت دەکا. پیم سەیربوو.دوکتور لە نیْو شار نیە، بەم بەیانیە لە ماڵی عەلی حەسە نیانی چدەکات؟

هاتم بوْ دەفتەریْ تەشکیلات کە یەکیْک لە برادەران لەگەڵ خوْم بەرم. دیتم موهەندیس فاروقی کەیخوسرەوی وکاک حەمەدەمینی سیراجی لە پیْش دەفتەری تەشکیلات راگیراون.دوروسی پیْشمەرگەی دەفتەری سیاسیش لەوێن. یەکیان هەتیویْکی سەرسەریە بەناوی« ئەبو عیمادی » .لەگەڵ فاروق و حەمەدەمین چاکو خوْشیم کرد و گوتم فەرمون بوْ سەریْ،خیْرە بەو بەیانیە؟

- گیراوین

- یانی چی ؟ کیْ گرتوونیْ؟

ئەبو عیمادی هاتە پیْش و گوتی : کاک کەریم ئیْمە گرتومانن و هیْناومانن.

- ئیْوە چکارەن، کیْ گوتویە خەڵکی بگرن؟

- لە دەفتە ر پیْمان گوتراوە هەر یەک لەوانە تووشیان بین بیانگرین.

- باشە.. ئەوە هیْناوتانە ئیْرە ئیتر بروْن خوْم دەزانم.

- ناتوانین هەروا بروْین، رەسیدمان بدەنیْ.

بانگی کاک کەریمی عەلیارم کرد کەفەرماندەی هیْزی پیْشەوابوو. گوتم ئەوە چیە، کیْ فەرمانی گرتنی ئەوانەی داوە.؟ گوتی : من ئاگام لیْ نیە ،ئەوانە پیْشمەرگەی دەفتەری سیاسین.

- پێشمەرگەی دەفتەری سیاسی باڵە چیا خەڵک بگرن. ئێرە نێو شارە و تۆش بەر پرسی.

کاک کەریمی عەلیار گوتی : تۆ رەسیدیکیان بدەیە با بڕۆن. هەروا بەسەر پێوە رەسیدێکم نووسی ،حەمەدەمین و ماشێن و فاروقم وەر گرتەوەو ئەوانم بەرێکرد و لەگەڵ کەماڵی شافیعی،چومە لای دوکتور.کە چووم ئەبوعیمادی لە بەر دەرگای ماڵی عەلی حەسەنیانی راوەستابوو.کەماڵی شافیعی گوتی :« هەتیو ئەوە لێرە چدەکەی؟ »

- هاتوومە ئەو رەسیدە پێشانی دوکتوری بدەم، بزانم دەڵێ چی.!

لەگەڵ ئێمە هاتە ژوورێ.دوکتور دەنگی داو گوتی تۆ لێرە چدەکەی ؟

- کاک کەریم ئەو رەسیدەی داوینێ و فاروق و سیراجی ئازاد کردوە.

- باشە برۆ. ئەگەر کاک کەریم رەسیدی داوە، ئیتر برۆ، خوی دەزانێ.

بوم دەرکەوت کە ئەوانە لەگەڵ دوکتور هاتوونە خوار و دوکتوریان داناوەو کەوتوونە راوی تاقمی حەوت کەسە و فەرمانی گرتنیشیان لەلایەن دەفتەری سیاسیەوەدراوە کە درنگتر کوشتنیشی بەدواوەبوو. ئەوە لە کاتێکا کە بە سەدان ئاژاوەچی و هیرونێنی و ساواکی لەکوردستان دەسوڕانەوەو دژی حیزبی دیموکرات کاریشیان دەکرد و دەیاننوسی. بەلام کەس نەبوو نە بیانگرێ و نە راویان بنێ،چونکە کوردستان سەنگەری ئازادی و دیموکراسی بوو !! )

لەگەڵ دوکتور چووینە ژوورێکی دیکە.لە پێشدا من لەو بوو چوون و راونانە رەخنەم گرت و گوتم پێویستە رێگای دیکە بۆ چاری ئەو مەسەلەیە بدۆزرێتەوە. پاشان پێم خۆش نیە ئە و لات و سەرسەریانە پێشمەرگەی دەفتەر بن و بە تایبەت لەگەڵ تۆش بگەڕێن .دوکتور گوتی: ئەوانە چەک و ماڵی حیزبیان لە کنە دەبێ بیدەنەوە. گوتم راستە. بەلام جارێ حیزب لە سەر ئەوە یەکی نەکەوتوە.ئەوەش لام وایە نابێ لە

ریگای گرتن و راونانەوەبی.

دوکتور گوتی : « پیم خوشە بچیە کن مامە غەنی، بەلام مەلێ ئەو ناردوومی.بلێ وەختی ئەوەنیە.مەسئولیەتیکی گەورەی لە سەر شانیە، بەم کارە زیانیکی قورس وەجولانەوەی کورد و وەشەخسی خوشی دەکەوی.درنگ نەبوە،بابگەریتەوە نیو حیزب، بادوژمن پیمان خوش نەبی.خوشت لەم بارەوە هەرچی دەیزانی و چەندی پیت دەکری بیدوینەو قسەی لەگەلْ بکە. »

دوکتورم بەجی هیشت و هەر ئەو روژە چوومە مالی مامە غەنی. ئەحمەدی عەزیزی کە لەشەری سنە برینداربوو، لەگەل یەک دووکەسیتر لەوی بوون. کەچاویان بەمن کەوت شاگەشکە بوون.تیکرا : دەک رەببی بەخیر بیی. جاوا درنگ .. هەر چاوەروانبووین، بەیەکجاری هاتووی یان هیشتا چاوەروانبین؟.

- نە بە یە کجاری هاتووم و نە چاوەروانیش بن. کاریکی راتان نەکردوە کە چاوەروانی من بن . لەگەل مامە غەنی چووینە قاتی سەری و دانیشتین.گوتم بویە هاتووم بە دریژی قسەت لەگەل بکەم و بە راشکاوی پیت بلیم کاریکی زور ناحەزت کردوە.تووشی هەلەیەکی گەورەبووی. لە پیشدا دەمەوی بلیم تو ئەگەر دەتویست هەنگاویکی ئاوا بنیی، بو چی نەدەچوویە نیو ریکخراوەکانی حیزب و قسەیان لەگەل بکەی و روونیان بکەیەوە.داوای کونفرانسی حیزبی بکەی،تو کە منت دەناسی و بەهاوکار ودوستت دەزانیم تەنانەت جاریک لەگەل منیشت ئەو ناکوکی و خەیالی جیا بوونەوە نەهینا گوری.لە بیرتە لەکونگرە چەند جارم پی گوتی تو دەتوانی پیشی فرو فیلی دوکتور بگری.خوت ماتکرد و هەرچی دوکتور کردی و گوتی بوت لەملیدا.؟ ئیستاش پیم وایە لەم کارەشدا وەدوای قسەی خەلکی کەوتووی.من لام وایە درنگ نەبوە پیاوی سیاسی دەبی

ئەو شەهامەتەی هەبێ، ئەگەر تووشی هەڵە بوو،بتوانێ ڕاستی کاتەوە.هاتووم تکات لێ بکەم بگەڕێیەوە نێو حیزب، ڕێز و ئیحترامت لە جاران پتر دەبێ بوونی تۆ لەنێو حیزبدا دەتوانێ پێشی گەلێک هەنگاوی ناڕەوا بگرێ.ئەم لەتبوونە بە قازانجی بزووتنەوەی ئێستای کورد نیە.بێجگە لەوانە دەمەوێ بزانم دەتەوێ چبکەی؟

مامە غەنی گوێچکەی بۆ قسەکانم ڕاگرت و دوای تەواوبوونم لە پێشدا هێندێ کوتە کاغەزی لەگیرفانی هێنا دەر کە دوکتور قاسملو بۆ سمکۆی عەلیاری نووسیبوو،لەگەڵ کوتە نووسراوە یەک کە پێوەندی لەگەڵ بەعسی عیراق نیشاندەدا و گوتی :« ئەوانە هەموویان بەڵگەی خەیانەتن کە قاسملوو پێوەندی بە بەعسەوە هەیە. »

گوتم مامە غەنی ئەوانە شتێکی تازە نین، ئێمە ئەوە چەند ساڵە لەگەڵ بەعس پێوەندیمان هەیەلە سەرەتاوە تۆ ئاگاداری ئەو پێوەندیانەبووی. گوتی : « فەرقی هەیە، من نامەوێ چەک دابنێم لەم چیایانەی کوردستان مەقەر دەکەمەوە.بەڵام بەقسەی بەعس شەر ناکەم.ڕاستە دەبوایە لەپێشدا لەگەڵ ڕێکخراوەکانی حیزب باسم کردبایە. بەڵام مەلا ڕەسوڵ و مەلا حەسەن درۆیان لەگەڵ کردم. مەلارەسوڵ گوتی لە بە یرە م یا لەگاکەش مەقەر دەکەینەوە . تۆ خۆت شاهید نی ١٧تفەنگی کلاشنیکوفم هێنانە وە و لە کونە دێ تەحویلی مەلا ڕەسوڵم دان ؟. گوتم لام وایە یەکێکیانمان دا بە خانەخوێەکەمانهەر ١٦دانە مەلارەسوڵ بردنی. ڕاستە .. مەبەست ..لەئاست تۆ بە هەڵەدا چووم. پێم وابوو ئیختیلاقی شەخسیت لەگەڵ قاسملو هەیە. سبەی ڕادیۆ موسکو بەیاننامەکەمان دەخوێنێتەوە، هەموو وڵاتانی سوسیالیستی پشتیوانیم لێ دەکەن. حیزبە کومونیستەکان بە ڕەسمیم دەناسن و پشتیوانیم لێ دەکەن،حیزبی دێموکرات من دەبم نەک قاسملو.لەگەڵ ئەو

کابرایەکارناکری.»

گوتم مامە غەنی ، موسکو بەیاننامەکەتان ناخوێنێتەوە.لەو هەڵ و مەرجەدا جیا بوونەوە بەقازانج نازانم.بەداخەوە مامەغەنی ملی بۆ قسەکانی من رانەکێشا و نەگە راوە نێو حیزب و زیانێکی زۆر وەجولانە وە کەوت و لە چیاکانی کوردستانیش مەقەری نەکردەوە.

دوای جیابوونەوە بەراستی کارەساتی ناحەز و ناڕەوا قەومان. لەبۆکان و مەهاباد وسەقز دەستکرا بەڕاونان و گرتنی لایەنگرانی تاقمی حەوت کەسە.هەموو رۆژێ چەند کەسیان لەکەسانی جۆر بەجۆر دەهێنا دەفتەری تەشکیلات و کە تاوانەکەم دەپرسی، هەر ئەوەندە بوو کە گۆیا لایەنگری ئەوانە، ئازادم دەکردن.رۆژێک کاک کەریمی عەلیار فەرماندەی هێزی پێیشەوا گوتی : « کاک کەریم ئێمە تێناگەین تۆ لەگەڵ حیزبی یان لەگەڵ تاقمی حەوت کەسەی؟ لەدەفتەری سیاسی بە ئێمە گوتراوەکە ئەوانە بگرین.دەیانهێنینە ئێرە، تۆ ئازادیان دەکەی.»گوتم کاک سەر گورد من ئەندامی حیزبم و لەگەڵ ئەوان نیم، کاری ئەوانیشم پێ هەڵەیە. بەلام ڕێگا نادەم لە تەشکیلاتی مەهابادا رەوشتی ساواکی ڕێژیمی پێشوو بەکار بێنن. ساواکیش هەر بە تاوانی جیاوازی بیرو باوەر و بۆچوون، موخالیفەکانی خۆی راو دەنا و دەیانکوشتن.ئێوە لەچی ئە وانە دەترسین؟ نەچەکیان هەیە، نە هێزی شەریان هەیە، ئێوە بەم هەموو هێز و تواناوە، بۆ لە چە ند کەس دەترسین و دەیانگرن؟

گێرە شێوێن و شەر هەلایسێنەر و ئاژاوەچی دەیانویست لەم ناکۆکی و ئیختیلافە کەلک وەر بگرن و ئاسایشی شار تێک بدەن.لە دەفتەری تەشکیلات بروم خەبەریان هێنا کە کتێبخانەی حیزبی تودەیان ئاگر تێبەردا.کتێب و رۆژنامەیان بەجادە وەرکردوەو دەسوزێنن.تەلەفونم کرد بۆ سەرگورد عەبباسی شەهید و گوتم ئەوە چیە بۆ پێشیئەو ئاژاوەیە ناگرن؟

گوتی تکایە هەستە وەرەئێرە . کە چووم ٤-٥ کەسی ئەوانەی لە دەفتەری حیزبی تودە دەبوون لەوێ دانیشتبوون و دورسی پێشمەرگەی حیزبیش سەر بەدەفتەری سیاسی لەوێ ڕاوەستا بوون، یەکیان هەر ئەو ئەبوعیمادە سەر سەریە بوو .سەرگوردی ڕەحمەتی گوتی :« ئابروو چوونە.کۆمەڵە و چریک و ئیتحادیەی کومونیستان و پێشمەرگەی حیزبی دیموکرات کتێبخانە و ڕۆژنامەی حیزبی تودەیان ئاگر تێبەرداوە.

لە پێشمەرگەکانم پرسی ئێوە لە نێو شار چدەکەن ؟ ئێوە دەبێ ئەمنیەتی شار بپارێزن یا دەفتەر و کتێب و ڕۆژنامە بسوتێنن؟

یەکیان گوتی : ڕوژ نامەیان دەفروشت و هاواریان دەکرد : قاسملو جاشی بەعسە. ئێمەش پێشی خەڵکمان پێنەدەگیرا.یەکی ڕیوەڵەی تودەیی کە زور جار لە ڕوژنامە فروشیەکەدا دیتبووم و نەمدەناسی و لەترسانیش خوی مەلاس دا بوو، هەڵیدایەو گوتی: ئەرێ وەڵا جاشی بەعسەو نوکەری ئیمپریالیزمیشە و لە جاش خەراپترە. بە توندی لێی تورە بووم و گوتم هەتیوە خویرە تو غەڵەت دەکەی قسە بە دوکتور دەڵێی. ئیتر یەک لە پێشمەرگەکان غاریدایە. سەرگورد ڕابوو بەتوندی دەنگیداو پێشمەرگەکانی لەژووری وەدەرنا. من نامەیەکم بو دەفتەری سیاسی نووسی لە گەڵ مەحکوم کردنی ئەو تاوانە پێشنیارم کرد کە دەفتەری سیاسی لە ڕاگەیاندنێکدا ئەو کارە مەحکوم بکا. دوکتور قاسملو لەوەڵامی نامەی مندا نووسیبووی: «خەڵکی جور بە جور ئەوکارەیان کردوە و پێشمەرگەی ئێمەش بەهەڵکەوت لەوێ بوون.ئێمە کاری وا تەئیید ناکەین، بەڵام ئەگەر بەیاننامەی لەسەر دەرکەین، وادەگەیێنێ کە ئێمە دەستمان تێدا بووە!!!».

سەیر ئەوەبوو حیزبی تودەش لە ڕوژنامەی مەردوم دا نووسیبووی: کەریمی حیسامی مەسئولی تەشکیلاتی قاسملو جنێوی بە ئەندامانی ئێمە

داوە. ئیتر نەینوسیبوو بە دووجنیوان لە کوشتن و تێهەڵدان رزگارم کردون.!! بە دوای ئەوەدا تا قمی حەوت کەسە ویستبوویان بەهیوای ئەو ئازادی و دێموکراسیەی کە حیزبی دێموکرات بە قسەو بەنووسین رایدەگەیاند،لە مەهاباد میتینگ سازبکا.ئەحمەدی عەزیزییان بە برینداری هێنا بوو قسەبکا، پێشمەرگە بە ناویان وەر ببوون و بڵاوەیان پێکردبوون.

لام وایە دووحەفتە پێچوو تەشکیلاتی مەهاباد لەسەر ئەم رووداوەیە بەیاننامەی بڵاو نەکردەوە.بەڵام من وتاریکم نووسی و بڕیارماندا لە رۆژنامەی پێشمە وادا بڵاو بکرێتەوە.لە وتارەکەدا هەنگاوی تاقمی حەوتکەسەم مەحکوم کردبوو، بەلادان و بە زیانی بزووتنەوەی کوردم داتابوو. بەڵام بەجاشم ناو نەهێنا بوون.دەفتەری سیاسیخەبەریداکەئە ندامانی هەیئەتی ئیجرائییەی تەشکیلاتی مەهاباد هەموویان بێنە دەفتەر. رۆژێک هەستاین بە تیکرایی بەرەو دوڵی شێخان کەوتینە رێکا لە گەڵ دەفتەری سیاسی کۆ بینەوە.بەر لەوەی بگەینە خێوەتی دەفتەر، لە بنکەی پێشمەرگە لە بنداران جێگایان بۆ میوانان ساز کردبوو، دانیشتین. دوکتور قاسملو ومەلا عەولاش پە یدا بوون.دوای بەخێر هێنان و چاکو چۆنی، لە سەرەتاوە دوکتور بە توڕەیو تەشەرەوە هاتە مەیدان و حەملەی دەستپێکرد و گوتی : « من ئەو تەشکیلاتەم ناوێ کە تا ئێستا بەیانێکتان لە سەر ئەو جاشانە دەر نەکردوە. ئەوە تەشکیلات نیە.» من لەو توندتر لە وەڵامدا گوتم :« جاری دەبێ بزانی تەشکیلاتی تۆ نیە و تەشکیلاتی حیزبە.رێکخراوێکە ئەندامانی حیزب هەڵیان بژاردوە هەر عەیبە قسەی وادەکەی .پاشان هەر وەک بۆم نوسیبوون ،ئێمە بەکارهێنانی وشەی جا ش بەراست نازانین.غەنی بلووریان و هێمن جاش نین.لامان وایە دەفتەری سیاسی نە دەبوایە ئەم وشەیە بخاتە نێو

ئەدەبیاتی حیزبەوە.»

دوکتور گوتی : ئەوە نەزەری خوتە. گوتم لام وایە نەزەری تەشکیلاتە.برادەران وا لیوەن و با نەزەر بدەن . یەک دوو کەس گوتیان لامان وایە لە بەکارهینانی وشەی جا ش تالوکە کراوە. پاشان گوتم راستە ئیمە بەیانمان دەر نەکردوە، بەلام من وتاریکم بو روژنامەی پیشەوا نوسیوە و دوو روژی دیکە بوتان دەنیرین.

پاشان من هاتمە سەر گرتن و ناردنی زیندان و بی سەرەو بەرەیی و هاشین دزین و شتیوا،و داوام کرد کە بە توندی پیشی ئەو کارانە بگیری.دوای نانخواردن بەرەو شار شور بووینەوە.

لەو سەرو بەندەدا ئەوەی عەولاغای مەنگور مردبوو، لەگەل کاک سەید حەسەنی هاشمی چووینە سەرەخوشی. برای برایماغای کاقادریش مردبوو لە گەل کاک عومە ری قازی چووینە سەرە خوشی. لە قوژتەل گەلیک ئاغای مەنگور و خەلکیتر لەوی بوون. دەستیان کرد بە گلەی لە حیزب و منیش ئەوەی لەتوانامدا بوو ،دلخوشیم دانەوە و گوتم تکایە لە رابردوو دەرس وەرگرن و فریوی دوژمن مەخون .

دوای گەرانەوەمان لە دەفتەری سیاسی هیندی لە ئەندامانی ریکخراوی مەهاباد ، لام وابوو لە بەر وردە حیساب و کونە دل یشی ناوی ٢٧ کەسیان هینا کو بوونەوە کە ئە وانە لایەنگری تاقمی حەوت کەسەن و دەبی دەربکرین . دیارە لەوانە چەند کەسیان بە نووسین لە حیزب ئیستعفایاندا. ئەوانیتر پاش باسیکی زور و دمە تەقە ١٧ کەس وەبەر دەرکردن کەوتن و بەیانیان لەسەر دەر کرا.دیارە سەفەری لای دەفتەری سیاسی وهیرشی دوکتوری بی تەئسیر نەبوو.

## نامەی دەفتەری سیاسی

رۆژی ١٠/٨/١٩٨٠ (١٣٥٩/٥/١٩) دەفتەری سیاسی حیزبی دیموکراتی کوردستان ئەم نامەیەی خوارەوەی بۆ کومیتەی شارستانی مەهاباد نوسیبوو :

١- بە هیچ جور لە نێو شاردا شەر مەکەن.
٢- ئەگەر ئەرتەش بەرەو بنکەکانی حیزب لە شار وەدەر کەوێ، بە توندی لێی بدەن.
٣- تا دەتوانن لە ئاژاوەچیەتی و شەڕ هەڵایسێنەری تاقمە سیاسیەکانیتر بۆ بەهانە بەدەستدانی ئەرتەش بۆ سازکردنی شەڕ لە نێو شاردا بەر گری بکەن »

لە گەڵ ئاڵوز بوونی بارو دۆخی وڵات رێبەرایەتی حیزب و رێکخراوە سیاسیەکان لە شار وەدەر دەکەوتن و یا وەدەر کەوتبوون.بەلام ماموستا شیخ عیزالدین گوتبووی :« ئەمجارە داشائمەجید بمزوێ من نابزووم و شار بە جێ ناهێلم . »دلگەرمیەک بوو بۆ خەلک.چونکەداشائمەجید، ئەم کێوە بەرز و زەلامەی پشتی مەهاباد قەت نەدەبزوت. لەبارو دۆخێکی ئاوا پڕ لە مەترسیدا، رێبەری مەزهەبی و دەفتەرەکەی وەک کێوی داشائمەجید لە نێو خەلکدا بمێننەوەو نەبزوون، دیارە جێگای هومێد و دلگەرمیە. بەتایبەت بۆ تەشکیلاتی مەهابادی حیزبی دیموکرات کە ئەویش بریاری دابوو نەبزوێ.رێبەرانی سیاسی شاریان بەجێ هێشتبوو، مانەوەی رێبەری مەزهەبی جێگای هومێد بوو. من لە دەفتەری تەشکیلات نە دەبزوتم.

دانیشتبووم کاک مەلا رەسولی پیشنوماز وەژوور کەوت و گوتی: «ئەوە تۆ هەر لێرە دانیشتووی ئاگات لە هیچ نیە داشانمەجید بزووت .» مەلا رەسول بە شێوەیەکی وەها هاروژانی و توند و بە گورم قسەکەی کرد، قوت بووم . پێم وابوو ئەو هێزەی ئە رتەشی کە لە سەر داشانمەجیدە بزوتوە بێتە نێو شار. گوتم چون، ئەدي سەرگورد لە کوێیە؟ چدەکەن .. ئامادەگیتان چونە؟

مەلا رەسول گوتی : چونی پێناوی. بزوت و تە واو بوو.توزی خاو ببوەوە. منیش هاتمەوە سەر خو گوتم : ئە وە دە لێی چی مەلا رەسو؟ چ بزوت؟

کورە دەلێم چی، مەلا شێخ عیزالدین بزوت و روێشت و شاری بەجێ هێشت .»

دەباشە مالت خەرا نەبی. چاک چاکی کرد. وەزع خەتەرە. خودا نەخواستە ماموستا شتێکی بەسەر بی، ئەو میللەتە لێقەوماوە چبکا و بی رێبەری مەزهەبی چون دەتوانی رزگاری بی خودای لە گەل بی.

روژی ١٩٨٠/٨/١٠ (١٣٥٩/٥/١٩ )پادگانی مەهاباد ئەم بەیاننامەی خوارەوەی لەرادیوی مەهابادا بلاو کردەوە:

بەناوی خودا - بەیاننامەی ژمارە یەک .

«خەلکی بە غیرەت و موسلمانی شارستانی مەهاباد ، ئەفرادی نیزامی نشتەجی لە مەهاباد، روژی ٥٩/٥/١٩ بو ئەنجامدانی مەعموریەتی فێر کردەیی روژانە، بە چەکو قورخانەوە بە نێو شارو دەورویەری شاردا هاتووچو دەکەن. چاوەروانین کە خەلکی بە رێزی مەهاباد لەگەل هاوکاری برانیزامیەکانیان ، نەبنە کوسپی هاتووچوی ئەوان.ئەگەر کەسانی غەیرە مەسئول و ئاژاوەچی، بیانەوی پێشی ئەم

گەران و هاتووچوونە بگرن، بە توندترین شێوە سەر کوت دەکرێن و خۆیان دەبنە هۆی شەر هەڵگیرسان و ماڵوێرانی هاو شاریەکانیان» ئەرتەشی کۆماری ئیسلامی ، پادگانی مەهاباد.»

بۆ پێشگری لە ئاژاوەو لێکۆڵینەوەی هەرەشەی ئەرتەش هەر ئەوی رۆژێ لە فەرمانداری مەهاباد کۆبوونەوەیەک پێکهات. لەم کۆبوونەوەیەدا سەر گورد فەرۆخی نوێنەری پادگان، سەروان داودی سەرۆکی شارەوانی، دادستانی مەهاباد و نوێنەرانی تاقم و توێژی کۆمەلایەتی شار و ریشسپی و پیاو ماقوڵ و نوێنەرانی حیزب و رێکخراوە سیاسیەکان بەشداریان کرد .لەلایەن تەشکیلاتی مەهابادەوە کاک عومەری قازی بەشداری کرد. پاش باسێکی زۆر گەیشتبوونە ئەم بریارانەی خوارەوە. :

١- حیزب و گروە و رێکخراوەکان نابێ بە هیچ جور دەست لە کاروباری نەزمی شار وەربدەن.

٢- ئەفرادی هیچ حیزبو رێکخراوەیەک نابێ بە چەکەوە لە نێو شار دا هاتووچۆ بکەن.

٣- پاراستنی نەزمی شار لە ئەستۆی شارەوانی کۆماری ئیسلامیە.

٤- گشت هێزە تیزامیەکانی نشتەجێ لە مەهاباد ، لە ژێردەسەلاتی تیپی مەهابادا دەبن و فەرماندەی پادگان بەر پرسیانە.»

پتر لە ٢٠ کەس ئەم بەیاننامەیان ئیمزا کردبوو.دوای ئەم کۆ بوونەوەیە کومیتەی شارستان لەگەڵ فەرماندەی هێزی پێشەوا هاتە سەر ئەو باوەرە کە پێشمەرگە لە مەقەر وبنکەی خۆیاندا وریا بن و بەچەکەوە لە نێو شاردا نەسورێنەوە. لەراستیشدا ئیمە دەمانویست هێمنایەتی شار بپارێزرێ. یەکەم بریاری دەفتەری سیاسی بوو. دوەم ئاژاوەی نێو شار بە قازانجمان نەبوو. لە بەرامبەر ئەوەدا کۆمەڵە ئە و هەڵوێستەی ئیمەی بە سازشکاری و چەکدانان حیساب دەکرد .

ڕۆژی ٢٣/٥/٣٥٩ (١٤/٨/٩٨٠ )ئەم نامەیە ی خوارەوەم بۆ دەفتەری سیاسی نووسی :

بەڕێز دەفتەری سیاسی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران !

سڵاوێکی شۆڕشگێڕانە. بەپێویستی دەزانم لە سە چەند مەسەلە بیروباوەڕی خۆم د ە ربڕم و چارەسەرکردنیان لە لایەن رابەرایەتی حیزبەوەبە ئەرکێکی جیددی دەزانم.

١- سیاسەتی بەرگری و شەرو بەرەبەرەکانی.

لامروایە ئەگەر بە گشتیش سیاسەتی حیزب روونبێ، لانی کەم لە باری تاکتیکی جولانەوەی رۆژانە، هێزە چەکدارەکانی ئێمە نازانن چدەکەن.

تەماشای عەمە لیاتی مانگێکی پێشمەرگە بکەین. لە سایینقەلاوە بگرە تا شنۆ،لانی کەم ٢٠ پێشمەرگەمان کوژراوە.گومانم لە وەدا نیە کە لە وانیش هەر ئەوەندە کوژراوە. ئەوە زیانێکی زۆر گەورەیە بۆ ئێمە.ئەگەر پێشمەرگەیەکی ئێمە لە بەرامبەر ٢٠ پاسداردا بکوژرێ، دیسان ئێمە زەرەرمان کردوە.بێجگە لەوە هەمووی ئەو پێشمەرگانە بە خۆڕایی لە ئەسەری نەبوونی فەرماندە و بێ تاکتیکی و بێ سەرەوبەرە یدا کوژراون.رابەرایە تی حیزب جارێک لەوەی کۆڵیەوە کە بۆ چی لە داشکستان فەرماندە بێ کێشک و بێ فیشەک پشمەرگە بەجێ دێڵێ؟ بۆچی سندوقە فیشەک لە ماشێنی فەرماندەدا دەبێ وپێشمەرگە بە ٤٠ فیشەک و ٢٠ فیشەکەوە لە مەتەرێزدا دەبن؟نابێ بزانن کێ مەسئولی ئەو جنایەتەیە؟رابەرایەتی حیزب لە وەی کۆڵیوەتەوە کە هۆی چۆلبوونی ناوچەی سایینقەلاو داشکستان چی بوە ؟ ئێستا بە هەزاران ماڵ دەربەدەر بوون، داخوا لە دوورەوە تۆپ بە سایینقەلاو یا شوێنێکی دیکەوە نان کە نەتیجەی ببێتە پەلاماری دوژمن و وێرانکردنی دێهات کردەوەو

تاکتیکیکی راستە؟ لەوە کۆڵراوەتەوە کە کاتیکی دەمانەوێ لە شار وەدەر کەوین، بۆچی دەبێ پێشمەرگە بە ماشینی سەر ئاواڵە تەقڵەو رمبازی بەنیو شاردا بکار بچێتە بەر دەمی پاسداران وچوارکەسمان بەخۆرایی لەکیس بچن؟.لە خەلیفان هیچ روون نیە بۆچی پێشمەرگەی ئیمە بەشەر لەدار دەکەون؟ لە خەبەری هەوەڵیدا کە کەمی مابوو بۆ ئیوەی بنووسم، فەرماندەی هیزی پێشەوا گوتی .٢پاسدار کوژراوەو ٣پێشمەرگەش بریندارن.بەلاّم لە واقیعدا لە دوژمن کەس نەکوژراوەو ٣پێشمەرگەش شەهید بوون من سەرباز نیم و قانونی شەڕ نازانم. بەلاّم داخوا کوژران و بە کوشتندان و پەلامار وکشانەوە لە لایەن حیزبەوە لێ پرسینەوەی هەیە؟. داخوا مەسئولی سیاسی نیە کە پەلامار و کشانەوە لە باری سیاسیەوە لیکبداتەوە؟ ئەوانە بە کەمتەر خەمی و یانەزانی ویا بێ موبالاتی رابە رایەتی حیزب دەزانم ودەبێ چارەسەر بکرێن.

٢- لەلایەن تەشکیلاتەوە دوێنێ لە سەر ماشیندزین و چەتەگەری هیزی ئەفشین بۆم نوسیبون. بەلاّم ئیستا نەزەری شەخسی خۆم رادەگەیێنم.ماشێن دزو تفەنگ دزو ئیستفادەچی شەڕ ساز دەکەنەوە و حیزبەکەمان تووشی تەنگو چەڵەمەی گەورەتر دەکەن. ئەگەر سیاسەتی دەفتەری سیاسی پێشبەرەلاّ کردنی پێشمەرگەیە بۆ ماشین دزین، تکایە بە ئیمەش رابگەیێنن کە خۆمان پیاو خەراپ نەکەین.هێندی لە فەرماندەکان وەک زەمانی شکاکان دەڵێن ئەگەر پێشمەرگە ماشێن نەدزێ و توندو تیژی لە گەڵ بکرێ، بەر حقوقە کەمە شەر ناکا.!! جائەگەر دەفتەری سیاسیش موافیقی ئەو نەزەرەیە،وا روونی کەنەوە.ئەگەرموافیق نیە ،جارێک سەر لقێک، پێشمەرگەیەک لە سەر ئەو کارە چەک کرا؟ تا.. چونکە دەتانەوێ ئەو پێشمەرگانە پشتیوانیتان لێ بکەن و تەبلیغات بو رابەرایەتی حیزب بکەن.ئەو مەسەلە بۆ ئیوە گرنگە نەک ئەم وەزعەی کە

لە سەر ماشێن دزین پێکهاتوە و گاڵتە بە پرستیژی حیزب دەکرێ.

٣- ئەوە بۆ هەوەڵجار دەبینم نامەیەکی بۆ دەفتەری سیاسی بنوسرێ، پێشمەرگە بزانێ چی بە و پێیان بگوترێ کە تەشکیلات چی نوسیوە. رەنگە بۆ ئەوەبێ کە پشتیوانی ئەو پێشمەرگانە یا ئەو لات و سەر سەریانە بۆ لای خۆتان رابکێشن. پێشمەرگەی وەک ئەبوبەکری عیمادی کە بوونی لە ریزی جولانەوەدا ئابرو چوونە، وەک قادری برایمی کە شریتی تەجاوەزی بە پێشمەرگە بە زۆری پارەکەم بۆ دەفتەری سیاسی ناردوەو چاوتان لێ نوقاند.بەراستی ناکرێ لە راست ئەو هەموو شتە پیاو خۆ مات کا.

لەسەر ئاور تێبەردانی دەفتەری حیزبی تودەنامەم بۆ دەفتەری سیاسی نوسیوە. واقعیەت چۆن بوەو چی یان بە تەشکیلات راپۆرت داوە، ئەوەم نوسیوە.بۆ بەیانی ئەبوبەکری عیمادی و هەتیونکی دیکە لە سەرێ گەراوتەوە و لە پێش دەفتەری حیزب بەرینگم پێدەگرن کە راپۆرتم لێداون.لە سەر رۆیشتن بورم دەنا بۆ ئەو کەسەم تەمبێ دەکردن کە پشتیوانی لێ دەکەن . ئەسڵەن پشتیوانی لات و سەر سەری ئاوا لە رێبەرایەتی حیزب ئابرو چوونە.نەتیجەی سیاسی پشتیوانی و سەر سەریەتی ئەوانە بۆحیزبی ئێمە لاموایە زۆر باش نیە.

٤- وەک لە زیندانەوە خەبەر دەدەن، زۆر کەسی بێ پەروەندەو پرسیار ماوەیەکی زۆرە گیراون ، هێندێکیان ئەلەج بوون، لام وایە پێراگەیشتن بە وەزعی ئەوانە کارێکی باشبێ.راگرتنیان نازانم فایدەی چیە؟ لەوانەیە ئێوە لە وەزعی گیراوەکان زۆر ئاگادار نەبن.

لە کۆتاییدا تکادەکەم لە بەرامبەر وەزعی ناسک و بە ترسی ئێستادا، پتر هەست بە مەسئولیەت بکەن و لیبراوتر بڕیار بدەن.

خۆشیتان براتان کەریمی حسامی ٢٣/٥/٥٩

پاش ئەو نامەیە دەفتەری سیاسی نامەیەکی نارد نووسیبووی لەمەودوا بەبێ ئاگاداری و نووسراوەی تەشکیلاتی مەهاباد تابێ هیچ کەس بگیرێ و بۆ زیندان بەرێ بکرێ.باشبوو توزێک پێشی بەرەلابی گیرا.ڕۆژی ۹۸./۸/۱۸ حوسێنی تاهیری ئوستانداری ئازربایجانی ڕۆژئاوا لە بەیاننامەیەکدا ڕایگەیاند کە حقوقی کارمەندانی دەوڵەتی لەبۆکان و مەهاباد نادرێ. دەقی بەیاننامەکە بەمجورەیە.:

«ازاین تاریخ تا اطلاع ثانوی از پرداخت هرگونەوجهی بەکلیەادارات وسازمانهای دولتی ونهادهای وابستەدرمهاباد وبوکان خود داری وحقوق کلیە افراد دولتی قطع گردد».

## یادی دامەزرانی حیزبی دیموکرات

ڕۆژی ۲۵ی گەلاوێژ نیزیک دەبۆوە، دەبوایە لەم بارودۆخە ئاڵۆزەدا ۳۵ساڵەی دامەزرانی حیزب جیژن بگرین.لە نێو ئەندامانی کومیتەی شارستان لە سەر ئەم مەسەلەیە بیرورای جیاواز هەبوو. هێندێ لە برادەران لە سەر ئەو باوەڕە بوون کە ئاهەنگ و کۆبوونەوەپێویست نیە و تەنیا بە بلاو کردنەوە ی بەیاننامەیەک یادی ئەو ڕۆژە بکەینەوە.هێندێکی تر دەیانویست ئاهەنگێکی گەورە ساز بکەین. پاش باسێکی زۆر هاتینە سەر ئەو بریارە کە ئاهەنگ و کۆبووتەوە ساز بکرێ. کومیتەیەکی ئامادەکردن و بەڕێوە بردنی جێژن هەڵبژێردرا.کارتی داوەتی خەڵک چاپ و ئامادە کران. جارێک هاتنە سەر ئەو باوەڕە کە لە کیتکە جێژن بگیرێ و خەڵک بە ماشێن و لۆری و ئوتوبوسان بچنە کیتکە. لەو

رایە پەشیوان بوونەوەو گوندی دیبوکریان بۆ کۆبوونەوە پێ باشتر بوو.پاشان بە دەلیلی نەبوون ئەمنیەتی و هاتوچۆ نەویشیان وەلانا.ئاخرەکەی کومیتەی ئامادەیی و کومیتەی شارستان هاتینە سەر ئەو رایە کە لە مەهاباد لەدانشسەرای کچان ئاهەنگی جێژنی ٢٥ی گەلاوێژ ساز بکەین.بریار درا تارۆژی خۆی جێگای کۆبوونەوە بەنهێنی رابگیرێ. بۆ ئەم کارە دەبوایە ئیجازە لە خانم وەتەمیشی سەرۆکی دانشسەرا وەریگرین. برادەران گوتیان مەگە ر بە قسە ی تۆ بێتە بەریار، دەنا زەحمەتە مرافقەت بکا.هەر بە تەلەفون لەگەڵ خانم وەتەمیشی بۆرە ئاسیارێکم هەبوو.کە تەلەفونم لێکرد زۆر بەگەرمی جوابی داوە:

ئەوە چلۆنە لێمان دەپرسی ؟

- ویستم سلاوێکت عەرز بکەم، بەلام هەر ئەوەش نیە وای لێهاتوە ئێستا موحتاجی تۆ بووین و کارەکەمان کەوتۆتە دەستی تۆ.جانازانم قسەم دەشکێنی یان نا ؟

- جا کێ دەوێرێ قسەی تۆ بشکێنێ.

- مەسەلە وێران و نەوێران نیە ئیحترامی متقابیلە. تکامان ئەوەیە ئیجازە بدەی لە دانشسەرای کچان جێژنی دامەزرانی حیزب بەرێوە بەرین.بەم بۆنەوە داوەتیشت دەکەم کە بەشداری جێژنەکەمان بکەی.

- ئەگەر دڵت نەیەشێ.من دەچم بۆ تاران و دانشسە راش لە ئیختیاری خۆتان دا دەبێ.

- جامن وام ناوێ.دەمەوێ خۆت بەشداری بکەی.هەر حەیفە تۆ لەگەڵمان نەبی. مەگەر لەو جێژن و کۆبوونەوانەدا پیاو بتبینێ.

- تکای ئەوەم لێ مەکە،من دەرۆم و ئێوەش جێژن بگرن و دیتنیش هەڵدەگرین بۆ دوایە.

رۆژی ٢٥ی گەلاوێژ(١٩٨٠/٨/١٦)لە سەر بانگەوازی کومیتەی

شارستانی مەهاباد پتر لەپێنج هەزار کەس لە حەوش وحەساری دانشسەرای کچان لە مەهاباد کۆ ببۆوە فەرماندەی هێزی پێشەوا کار قایمێکی باشی کردبوو. لە شوێنی ستراتیژی و دەوروبەری دانشسەرا پێشمەرگەی دامەزراندبوون.سەرگورد عەبباسی رەحمەتی لەگەڵ پۆلێک پێشمەرگە لە شورای نیزامی نێو شاردا مابووەو بەتەلەفون لەگەڵ دانشسەرا لە پێوەندیدا بوو.لە لایەن دەفتەری سیاسیەوە کاک جەلیلی گادانی بەشداری کردبوو.دوای کردنەوەی جێژن بە سرودی ئەی رەقیب لە لایەن کۆری یەکێتی لاوانەوە، بەناوی کومیتەی شارستانی تەشکیلاتی مەهاباد ئەم وتارەی خوارەوەم پێشکێش کرد:

خوشکو برایانی خۆشەویست ! .

هاوڕێیانی تێکۆشەری حیزبی! لە لایەن رێکخراوی ح.د.ک.ا تەشکیلاتی مەهابادەوە بەگەرمی بەخێرهاتنتان دەکەم.بالە یادی ٣٥ساڵەی دامەزرانی حیزبدا بۆگیاتی پاکی شەهیدانی رێگای رزگاری کوردستان سلاوێکی شۆرشگێرانە بنێرین.هەروەها ئیجازە بدەن لە ح.د.ک. سوپاس بکەین کە لەماوەی ٣٥ساڵدا،سەرەرای تەنگو چەڵەمەو هەوراز ونشێو، خەباتی رزگاریخوازی کوردی رابەری کردوە و ئالای خەباتی دانەناوە و دوای کەوتنو سەرەنگرنبوون،هەستاوەتەوەو خەباتی درێژە پێداوە.

٣٥ساڵ لەمەو بەر لە رۆژێکی ئاوا پیرۆزدا، بە ئیپتکار و پێشنیاری زاناو تێکۆشەری بەناوبانگی کورد، پێشەوا قازی محمد، ناوی کۆمەڵەی ژ.ک. بە ناوی ح.د.ک. گۆردراو و دامەزرانی حیزبی سیاسی شۆرشگێری کورد راگەیەنرا.دامەزرانی ح.د.ک. بەرەوڕووی خەبات و فیداکاری گەلی کورد بوو کە بە درێژایی مێژوو بۆ ئازادی و سەر بەستی خەباتی کردوە.لە سەردەمی حکومەتی رەشی پەهلەویدا، نەتەوەی کورد بەرەو

نەمان‌وتوانەوە دەچوو.زمانی زکماک وجلوبەرگی جوانی کوردی قەدەخە کرابوو.هەزاران کورد بەتاوانی پو چو تۆمەتی بەدرۆ لە ولاتو ماڵو حاڵی خۆیان دوور دەخرانەوەو دانیشتنی کوردستانیان پێ رە وا نەدەدیتن.دیوەزمەی رە شی دیکتاتۆری پشووی لەخەڵک بریبوو.بەلام لە سەر ئەو حالەشەوە تێکۆشەرانی کوردی وەک مامو ستا مەلا ئەحمەدی فەوزی،قازی کاکەحەمەی بوکان، شێخ ئەحمەدی سریلاوا و مەرحومی پێشەوا قازی محمد،هێندێ پێوەندی نهێنی ئازادیخوازانەیان لە نێوان خۆدا بەر قەراز کردبوو، بیریان لە چارەنووس و دوارۆژی نەتەوەی کورد دەکردەوە.شەری دووەمی جیهانی ئەگەر بۆ گەلانی ئورووپا هۆی وێرانی و کوشتاری میلیۆنها ئینسان بوو، بۆ گەلانی ئێران و بەتایبەت بۆ گەلی کوردی چەوساوە،ئازادی بەدواوەبوو.

هاتنی ئۆردووی هاوپەیمانەکان بۆ ئێران، تاج و تەختی گلاوی رەزاشای رماندو ئێرانی لە چنگ دیکتاتۆری رەش رزگار کرد.گەلی کورد پیاوانە لەو دەرفەتە کەلکی وەرگرت و هەوەڵێن رێکخراوەی سیاسی خۆی دامەزراند.کۆمەلەی ژ.ک. بەخێرایی پەرەی گرت وتەنانەت لقەکانی لە بەشەکانی تری کوردستانیشدا رەگاژۆییان دەکرد.بەلام رووداوەکان و هەلکەوتی کوردستان پێویستیان بە رێکخراوەیەک هە بوو کە وەلامدەری هەلومەرجی ئەو رۆژەی کوردستان بێ.بەگوێرەی ئەو پێداویستەبوو کە رۆژی ٢٥ی گەلاوێژی سالی ١٣٢٤ (١٩٤٥/٨/١٦)ح.د.ک. دامەزرا.پێکهاتنی ح.د.ک. لە هەموو بەشەکانی کوردستانی گەورە، بەگەرمی پێشوازی لێکراو مەهاباد بوو بەپە ناگای تێکۆشەرانی کورد و لە هەموو بەشەکانی کوردستانەوە روویان تێدەکرد.بەخۆرایی نەبوو کە پاش رووخانی کۆماری دیموکراتی کوردستان، شاعیرێکی کورد دەڵێ:

«مەهاباد، مەهاباد دوێنێ بوو دەمیلیۆن قەومی کورد
بەرەو تۆ دەوەستان، سوژدەیان بۆت دەبرد
قیبلەگای هیوا بووی ،سەنگەری ئازادی
شـــەبەق بووی بۆ شەوی تاریکی بێدادی»

بەڵێ کۆماری کوردستان بۆ گشت کورد شەبەقبوو.بەدامەزرانی کۆماری دیموکراتی کوردستان، بۆ هەوەڵینجار لە مێژوودا، گەلی کورد دەسەلاتی سیاسی و ئیزامی خستە بەر دەستی خۆی و لە ماوەیەکی کەمدا هەنگاوی بەنرخی بۆ بەختەوەری کورد هاویشت.

ح.د.ک. بەچالاکی کەوتە بلاو کردنەوەی بیروباوەڕی پێشکەوتنخوازی و لە ماوەیەکی کەمدابوو بە حیزبی هەموو توێژەکانی گەلی کورد.هەر لە سەرەتای دامەزرانیەوە، جولانەوەی کوردی بە بەشێک لە بزووتنەوەی دژی ئیمپریالیستی سەرانسەری ئیران دانابو. لەگەڵ چەند حیزبی پێش کەوتووی ئەردەی ئیران بەرەی یەکگرتووی پێکهێنا. دوای تێکچوونی کۆماری کوردستان، حیزب تووشی تێکۆشانی نهێنی بوو .ساڵ بە ساڵ تاقیکردنەوەی پتری وەدەستهێنا.لە تێکۆشانی خۆیدا پێرەوی لە تیئوری زانستی پێگەیشتنی کۆمەڵ کردوە.

هـاورێیـانـی بەرێز ! ئـەمـســاڵ ٣٥ســاڵەی دامـەزرانـی حـیـزب لـە هەلومەرجێکی تایبەتیدا جێژن دەگرین. ڕێژیمی پاشایەتی روخاوە.حیزبی ئێمەش لەوەزعی دژواری نهێنی هاتۆتەدەر و تێکۆ شانی ئازادی خۆی دەست پێکردۆتەوە.گەلی کورد کەلە شۆرشی گەلانی ئیراندا بەشداری کردبوو،هیوای ئەوەبوو کە لە ڕێژیمی تازەدا بتوانێ بە ئازادی بژی و لە چوارچێوەی کۆماری ئیسلامیدا بەمافی خودموختاری بگا.ح.د.ک. لەو ماوەیەدا هەولیداوە کە مەسەلەی خودموختاری لەچوارچێوەی کۆماری ئیسلامی و پاراستنی دەستکەوتەکانی شۆرش چارەسەر بکا. حیزبی ئێمە

سیاسەتی خۆی لە پێوەندی لەگەڵ جەمهوری ئیسلامیدا گەیاتدۆتە، رادەیەک کە هێندێ کەسی تێنەگەیشتوو، یا هێندێ هێزی زڕە شۆڕشگێڕ بوختانی سازشکاری پێدەکەن.بەڵام کاربەدەستانی کۆماری ئیسلامی کە مەبەستیان پاراستنی قازانجی شۆرش نیە و دەیانەوێ گیروگرفتی سەدەی ئاتۆم بە عەقلیەتی ..١٤سالْ لەمە، بەر چارەسەر بکەن، سیاسەتی ئاشتیخوازانەی حیزبی ئێمەیان بەفریو وشەر و بۆمباران و گەمارۆی ئابووری وەلأم داوەتەوە. سەیر ئەوەیە گشتی ئەوجنایەتانە دژی گەلی کورد بەناوی ئیسلام و لەژێر پەردەی ئیسلامدا بەرێوە دەبرێ.

خوشکو برایانی بەرێز !

ئێمە لە کاتێکدا یادی ٣٥ ساڵەی حیزب دەکەینەوە، کە بەناهەق و ناڕەوا شەڕێکی نابەرامبەر بەسەر میللەتەکەماندا سەپاوە.لەماوەی چەندمانگی رابردوودا شارەکانی سنەی قارەمان وسەقزی خویناوی ویانەی تێکۆشەر بە تۆپخانەو بۆمبارانی لەشکری کۆماری ئیسلامی وێرانکراون.نیزیکەی سەد هەزار کەس خەڵکی ئە و شارانە ئاوارەو دەر بەدەر بوون.دارونەداریان بەتالأن چوە.لە ناوچەی هەوشار نیزیکەی ٤٠گوندیان چۆلکردوەو سووتاندوویانە.خەڵکی ئەو گوندانە تالأن کراون‌و دەربەدەر بوون.ئەوانەی دەیانەوێ حکومەتی ئیسلامی لە کوردستان دابمەزرێنن، تەنانەت رێگا نادەن خەڵک دەغڵو دانیشی کۆ بکاتەوە.لە ناوچەی تەرگەوەڕ ومەرگەوەڕ نیزیکەی ٣٠گوندیان بۆمباران کردوە.خەڵکی ئەو گوندانە ئیستا ئاوارەی چیاکان بوون و هیچیان نەماوە.حکومەتی کۆماری ئیسلامی بەبیانووی پاکسازی چەک وەرگرتنەوە لۆمپێن پرۆلتەر و لات و بەرەڵای عەجەمی ئەغەدەی چەکدار کردوەو بەگژ خەڵکی شنۆیەی داکردون.چەند گوندیان سوتاندوەو تالأنیان کردوە. بەکورتی بەرێوەبەرانی کۆماری ئیسلامی بێجگە لە

سەرکوتکردنی میللەتی کورد، هیچ بەرنامەیەکی دیکەیان نیە. بەلام شەڕ هەلایسینەرانی دەولەت خەراپی تێکەیشتوون میللەتێکی بۆ وەدەستهێنانی مافی ڕەوای خۆی خەباتبکاو نەتەوەیەکی ڕۆلەکانی بۆ ئەستاندنی مافی نەتەوایەتی بەپێکەنینەوە پێشوازی لەمەرگ بکەن، بێگومان هەر سەر دەکەوێ. ئەورۆ ئیتر هەموو کوردێک بە باشی هەست بە دەردوژانی کۆمەلایەتی وستەمی نەتەوایەتی دەکا. هەموو کوردێک دەزانێ لە دنیای ئەورۆدا هیچ میللەتێک لە کورد ژێردەستتر و بەشخوراوتر نیە.دوژمنانی میللەتی کورد خەباتی دژی ئیمپریالیستیان کردۆتە پەردەیەک ولە ژێر ئەو پەردەیەدا، هەموو جوولانەوەیەکی ئازادیخوازی و بیرو باوەڕێکی پێشکەوتوخوازانە و شوێنەواری دێموکراسی سەرکوت دەکەن. لە کاتێکا ئەوانەی بڕوایان بەخەباتی دژی ئیمپریالیستی هەیە، بەر لە هەموو شت دەبێ یەکێتی گەلانی ئێران دابین بکەن و مافی گەلانی ئێران بە شێوەی خودموختاری بسەلمێنن.دەبێ ئازادیو دیموکراسی، ژیان و بەرێچوون بۆ زەحمەتکێشان دابین بکەن.ناکرێ ئیدیعا بکەی کە دژی ئیمپریالیزم خەبات دەکەم، بەلام هەر لەو کاتەشدا هێزەکانی دژی ئیمپریالیستی بۆمباران بکەی.شارودێهات بسووتێنی و زەحمەتکێشان دەربەدەر بکەی. ئێستا ڕێبەرانی کۆماری ئیسلامی،ڕاست ئەو سیاسەتەیان گرتۆتەبەر.بۆ شاردنەوەی ئەم سیاسەتە چەپەلە، ڕۆژنامەی ئەرتەزی بەناو پێشکەوتوویان ئازاد کردوە کە جنایەتەکانیان دەشارنەوەو پاکانەیان بۆ دەکاو دەهۆلیان بۆ دەکوتێ و بە گژ حیزبی دیموکراتیان داکردوە. ئەو ڕۆژنامانە نەخشی چاو بەستنی خەلک یاری دەکەن. بەناوی خەمخۆری میللەتی کورد، کوردیان بۆ فریو دەدەن، زرەتیئۆریان بۆ دەهۆننەوە. بەو مانایە کە چونکە حکومەت دژی ئیمپریالیزمە، کورد دەبێ کڕنوشی بۆ بەرێ، سەری بۆدابنوێنێ. واز لە

مانی رەوای خۆی بینێ، خودموختاری هیچ مانای نیە، هەموومان ئیرانین و جارێ ئەشێ خەباتی دژی ئیمپریالستی بکەین.جا بەدبەختی لە وەدایە کە بەناوی پێشکەوتنخوازی ومارکسیستی ئەم هەولٚ وتەقەلا نارەوایەدەدرێ و دەیانەوێ بزووتنەوەی کورد لەنێوەوە بکوژن،گەندەلٚی بکەن و هێزەی لەخۆوە بۆ بتاشن و پاشان لە بەریەکی بەرن و تەرتو تونای بکەن.

ح.د.ک.ا. بە تاقیکردنەوەی ٣٥ سالٚ خەبات لە بەرامبەر فرۆفێلی دوژمنانی گەل و فریوخواردتی رەفیقانی نیوەریدا، بەدەنگی بەرز وبە هەستی مەسئولیەتەوە دەلٚێ: دەبا لە رابردوو دەرس وەرگرین، پالٚ وێک بدەینو- پشت لێک ببەستین، واز لە سودو مەسلەحەتی تایبەتی بێنین، دەبا دەست تێک گرین و بەرەو پێش بچین.با هەتا سەر بۆ بەجێ گەیاندنی دروشمی سەرەکی ئەمڕۆمان،دیموکراسی بۆ ئیران و خودموختاری بۆ کوردستان تێبکۆشین.

ئەوکەسانەی لە رابردوو دەرس وەرناگرن و بۆ مەبەستی تایبەتی ویا بۆ ناو وناوبانگ خەریکی دووبەرەکی نانەوەو کۆمەلٚ و دەستەسازکردن و داتاشینی تاقم و دەستەی جیاوازن، لە داهاتوودا ئەوانە دەبنە گەپجاری مندالانی کوردستان ومێژووی نەتەوەکەمان بە خەرابیان باس دەکات.

هاونیشتمانانی بەرێز ! جولانەوەی رزگاریخوازی کورد بەقۆناخێکی ناسکی مێژوویدا تێدەپەڕێ، لەم قۆناخە ناسک و دژوارەدا پێویستمان بە وریایی و بە فیداکاری وبە ئازایی وبە سەبری ئینقلابی و بە لەخۆبوردوویی وگیانفیدایی هەیە. باوابکەین میللەتەکەمان لەم قۆناخەدا بەسەر بەرزی بگاتەئاوات و مزلی سەرکەوتن. با رۆژی ٢٥ی گەلاوێژ بکەینە رۆژی تازەکردنەوەی عەهدوپەیمان لەگەلٚ حیزبەکەمان و بەتێکرایی لە دەوری حیزبی قازی محمد کۆ بینەوە.باله ئاست فیداکاری پێشمەرگە

• قارەمانەکانمان بیٚ موبالات نەبین ولە بیرمان نەچیٚ ئەو رۆلە قارەمانانە بۆ ئازادی و ئاسایشی میللەتەکەمان گیانی خۆیان فیدا دەکەن.با ئیمەش بۆژیان و بەرنچوونی ماڵ ومنداڵی ئەوان، زۆر دەست بەماڵی دنیاوەنەگرین و پیاوانە کارێکی وابکەین کە لە مەیدانی تیکۆشان وخەباتی دژواردا،فیکری بەرنچوونی ژیان پەرێشانیان نەکات. باسەر سالی دامەزرانی حیزبی دیموکرات بکەینە سالی یەکیتی وبرایەتی و پتەو کردنی خەبات وتیکۆشان لە پیناو دیمو کراسی و خودموختاریدا.»

بەدوای وتاری مندا، کاک جەلیلی‌گادانی هەستا پیرۆزبایی کردو گوتی: هەرچی پیویستبوو کاک کەریم گوتی، هیچی زیادیم نیەبیلیم. پاشان مەلامحمدی جوانرۆیی بەقاچی بریندارەوە وتاریکی‌دا. دوکتور خەلیقی کە لە سنە ئاوارەببو، داوای لە کومیتەی ئامادەیی کردبوو کە رینگای بدەن قسەبکا. موافەقەتیان نەکردبوو. بەم بیانوە کە ئەندامی حیزب نیە. هاتە لای‌من و گوتی ئەمانە بۆچی رینگا نادەن قسەبکەم.بەبرادەرانم گوت دوکتور خەلیقی کەسیکی ناسراوەو دەربەدەر بوە، رینگای بدەن با دەدەقیقە کە خۆی ویستوویەتی قسەبکا. دوکتور چوەپشتی میکرۆفون و بەلام ۱۰دەقیقەی چی و ۲۰دەقیقەی چی. نیوە نیوەش دەیگوت : ئیستا رەنگە کاک کەریم تووڕەبی.لە ئاهەنگە کەدا شیعر وگۆرانی خۆش خوینرانەوە. زۆربەی ماموستاکانی ئایینی بەشداریان کردبوو.ئاهەنگی ٢٥ی گەلاویژ بە سەرکەوتوویی و هیمنانە کۆتایی هات.

## هەڕەشەی لەشکری ٦٤ی ورمێ

ڕۆژی ١٩٨٠/٨/١٩ لەشکری ٦٤ی ورمێ لە ئاگاداریەکدا ڕایگەیاند کە ڕۆژی ٥٩/٦/٣(٩٨٠/٨/٢٥)لەشکر بەچەک و بێچەک بەنێو شاری مەهابادا هاتوچۆ دەکا.تائەو دەم سەرباز نەدەهاتنە نێو شار. ئەگەر ویستبایان بۆ کارێک بێنە نێو شار تەلەفونیان دەکرد بۆدەفتەری تەشکیلات و دەیانگوت ئەوا ئەوەندە سەربازە بۆ فلان کار دێنە نێو شار.ئێمە پێشمەرگەمان دەنارد چاوەدێریان بکەن.

ڕۆژی ٩٨٠/٨/٢١ دەستەیەکی نوێنەرایەتی لە کەیخوداو ڕیشسپی و باوەڕپێکراوانی شار چوونە ورمێ تا لە بارەی هێمنایەتی شارو بڕینی مەعاشی کارمەندان و بڕینی تەلەفون لەگەڵ ئوستاندار بدوێن. لەگەڕانەوەدا هەر ئەم ڕۆژە ئەم بەیاننامەیان بلاو کردەوە.:

بە ناوی خودا ! خەڵکی بەشەرەفی مەهاباد ـ هاوشارانی خۆشەویست .لە پێوەندی لەگەڵ بەیاننامەی لە شکری ٦٤ی ورمێ،سەبارەت بەهاتنی ئەرتەش بۆ نێو شار و پێوەندی لەگەڵ پادگانی مەهاباد، هێندێ لە زانایان و باوەڕپێکراوانی شاری مەهاباد،لە سەر بیروڕای خەڵک و پەسندی خەڵکی شار لە کومیسیۆنی ئوستانداری ئازربایجانی ڕۆژئاوا، لە گەن ئوستاندارو فەرماندەی لەشکرو فەرماندەی پادگانی مەهاباد، پێشنیارەکانی خەڵکی شار بەم جۆرەی خوارەوە گەلاڵەکران :

١- تەواوی کاروباری ئینتیزامی و ئەمنیەتی شار، تەنیا بەهۆی شارەوانی کۆماری ئیسلامی مەهابادەوە بەڕێوە دەچێ و هێزە

ئینتزامیەکانی دیکە دەست لە کاروباری شار وەرنادەن. بۆ تەواوکردن و بەهێزکردنی کادری ئێستای شارەوانی، بەرادەی پێویست و بە گوێرەی ڕێ و ڕەسمی دیاریکراو لە خەڵکی مەحەلی کەلک وەردەگیرێ.
٢- بۆ دابینبوونی هێمنایەتی شار هیچ کەس بەچەکەوە لە نێو شاردا هاتووچۆ ناکاو چەک هەڵناگرێ.
٣-لە بارەی بڕینی مەعاشی کارمەندانی دەوڵەت و دامەزراندنەوەی پێوەندی تەلەفونی نێو شار هەنگاوی پێویست باوێژرێ.
لە بەرامبەر پێشنیارەکانی سەرەوەداو ئوستاندار و فەرماندەی لەشکر رایانگەیاند کە:
١-لە رۆژی دوروشەمۆوە ٥٩/٦/٣ ئەرتەش بەچەک وبێچەک بەنێو شاریدا هاتووچۆ دەکات. بەلام دە سست دەکاروباری هێمنایەتی شار وەرنادات.
٢-لەکاتی هاتووچۆدا، ئەرتەش بەهیچ جۆر زۆر بەکارناهێنێ و تەقەی ناکا.مەگەر کەسێک یا کەسانێک تەقەی لێ بکەن.
ئێستا بە سەرنجدانی مەبەستەکانی سەرەوە،بەئەرکی خۆمانی دەزانین لە خەڵکی بەشەرەفی مەهاباد چاوەروان بین بە بەشداری شێلگیری خۆیان لە پاراستنی ئەمنیەت و هێمنایەتی لە هیچ تێکۆشانێک درێخی نەکەن. دەستەی باوەڕ پێکراوانی بەشداربوو لە کۆبوونەوەی تاریخی ٥٩/٥/٣.ی ئوستانداریدا.
کاتێک لەورمێ گەڕانەوە، دەستەی باوەڕ پێکراو هاتنە دەفتەری تەشکیلات و گوتیان :« ئەوەی بۆمان دەرکەوتوە، وادیارە ئەرتەش دێتە نێو شار و هاتووچۆش دەکات. ئێستا تکامان ئەوەیە کە ئێوە کارێکی وامەکەن کە شارەکەمان تووشی شەڕو کوشتار و وێرانی بێ.»
گوتم ئەوەی پێوەندی بەئێمەوە هەبێ، بڕیارەکانی کۆبوونەوەی

فەرمانداری رەچاو دەکەین و پێشمەرگەی حیزب بەچەکەوە لە نێو شار ناسورێنەوە. هەر ئەو رۆژە نامەم بۆ دەفتەری سیاسی نووسی و بڕیاری ئەرتەش وبەیاننامەی باوەڕ پێکراوانی شارم بۆ ناردن. لە وەلامدا دەفتەری سیاسی نووسیبووی:« هەتا دەکرێ مەهێلن لە شاردا ئاژاوە سازبێ و لە شاردا شەڕ مەکەن».

## کارەساتی دڵتەزێن .

رۆژی ١٣٥٩/٦/١ (١٩٨٠/٨/٢٣)بەیانی زوو دووپیشمەرگە ی دەفتەری سیاسی پەیدابوون، نامەیەکی دوکتور قاسملوویان هێنابوو. دوکتور نوسیبووی:« کاک کەریم تکایە بە سەرگورد عەبباسی بڵێ، ئەو هیچ کاری لە مەهاباد دا نەماوە.هەقی نیە لە نێو شاربێ.هەر ئێستا بکەوێتەرێ و بێتە ئێرە، دەفتەری سیاسی چاوەڕوانیەتی».
هەستام چوومە کن سەرگوردی، بەتەنیا لە شورای نیزامی دانیشتبوو. لە بەر ئەوەی کە بەتەما چوونەدەرێ بوو، کێشک و پێشمەرگەی لە شورای نیزامی نەهێشتبوو. نامەکەی دوکتور قاسملوم نیشاندا و گوتم : پێشمەرگەکانم راگرتوە ئێستا دەبێ برزی تکایە خۆت ئامادەکە و گیر مەبە . » گوتی:« کاک کەریم هێندێ کارم ماوە.تە واویان دەکەم، ناوی هێندێ کەس هەیە بۆت دێنم. شتێکم دامەزراندوە، دێنم تەحویلت دەدەم و لای ئێوارێ دەکەومەرێ و دەڕۆم.»
سەعاتی ٣ی دوای نیوەڕۆ کۆبوونەوەی کۆمیتەی شارستان هەبوو، باس لەوە دەکرا کە برێک خۆ کۆ بکەینەوەو سەنەد و بەڵگەو کەلوپەلی پێویست لە شار وەدەر خەین.پێشمەرگە لە بنکەکانی خۆیان لە ئامادەیی

دابن و بەچەکەوە نەسورێنەوە.لە پر تەلەفون زەنگی لێدا، کە هەڵم گرت یەکێک گوتی : کاک کە ریم سەرگورد عەبباسی کوژرا.ئیتر خورپەم لە دڵی هات. ڕاپ ڕووین، گوتم ئێرە پاک کەنەوە و هیچی لێ نەمێنێ.لەگەڵ دوو پێشمەرگە سواربووم بۆ شورای نیزامی.سەر سەقام هەر زمەی دەهات. سەرگوردیا ن بردبوە شێروخورشید.چوومە شێرو خورشید، وە سەر کەوتم دوکتور حەبیبزادە گوتی:«ناتوانی ببینی

بۆ عەمەلیات ئامادەدەکرێ.تکایە تۆ لێرە گیرمەبە. خەبەرت پێ ڕادەگەیێنم.»

- سەرگورد چۆن کوژرا ؟ دوو پاسداری ورمێ بەفێل و تەڵەکە دێنە کن سەرگورد ودڵێن ئیمە دژی رێژیمین وئامادەین هاوکاریتان بکەین. سەرگوردی سادەو ساکار یەک دووجار دەیانێنێرێتە ورمێ، دەرمانیان پێ دەکڕێ و دروبانی بۆ دێننەوە. سەرگورد پێشتر بەمنی گوتبوو کە لە نێو پاسدارانی ورمێدا رابەڵکەیەکم دامەزراندوەو کاریان پێ‌دەکەم. کەسەکانت پێ دەناسێنم، جا دەڕۆم. ئەو رۆژە سەرگورد لە بەر هاتنەوەی ئەوان رۆیشتنی وەدواخستبوو.پاسدار دەوری سەعات سێ دەگەنەوە مەهاباد .یەکسەر دەچن بۆ شورای نیزامی.یەکەس لە بەر دەرگا دەبی و نە کۆنترۆڵ و پشکنین.راست وەسەر دەکەون. کارتۆنێک پڕدەکەن لە دەرمان وبوزیێەکی پڕ لە فیشەک و لە سەر پێ،لە سەر دەرمانەکان دادەنێن.سەرگورد بەتەنیا لە پشت مێزی خۆی دادەنیشێ و سەروان ئەحمەدی چەلەپی و سالحی پێشمەرگە ی لە کن دەبن.ئیتر کابرا کارتۆن لە پێش سەرگورد لە سەر مێزی دادەنێ و دەست دەداتە بوزی و دەیرشێنێ. سەروان چەلەبی و سالح هەر دەموودەست شەهید دەبن و سەرگوردیش دەگەیێننە شێرو خورشیدی. قاتڵەکان بە پەلەجەرەدا خۆ فرێدە دە نو ڕادەکەن. یەکیان دەکوژرێ و ئەویتریش نارنجۆکی دودی

فڕندەداو خۆ دەگەیێنێتەوە بنکەی پاسداران. لە شێروخورشید هاتمەدەرێ خەڵک دەورەیا ن دامو هاواریان دەکرد کە بڕۆم و لە وێ نەمێنم. لە پڕ جێبیکی سەر ئاواڵە دووکەسی سوار ببوون، لە لای پادگانەوە هاتەخوار ولایتەکانی هەڵکرد بوو، هاواریان دەکرد : ئەرتەش هات. بوو بەهەلات هەلات. سوار بووم بەپێشمەرگەکانم گوت: بۆلای شیرکەتی نەوت.لە نیزیک پردی یەرغو دابەزیم.لەو هەرایەدا خەڵک چوار عەجەمەرووتەی نەناسراویان گرتبوو پێشمەرگە هێنایانن. گوتم بیانبەن بۆ بنکەی سەرێ تا پرسیاریان لێدەکرێ.من پێشتر لەو کولانانەی نیزیک پردی یەرغوو ماڵێکی دۆست و بۆرە خزمێکم بەدی کردبوو، بێجگە لە دووبرادەری ئەندامی تەشکیلات کەسیتر پێی نەدەزانی.بە پێشمەرەکانم گوت : ماشینەکە لە ئەدیو رابگرن و چاوەروان بن. یەکیان لەگەڵم هات،چوومە ماڵەکە. تەلەفوونم کرد بۆ دەفتەری تەشکیلات کەسێ لێ نەبوو.تەلەفوونم کرد بۆ ماڵی بەرپرسی رێکخراوی ژنان، پێمگوت من ئەوە لە نێو شارم، دەچمەوە دەفتەر و تکایە برادەران بدۆزەوە بێنە دەفتەر.

زۆری پێ‌نەچوو برادەران کۆ بوونەوە. برادەرێکمان نارد لە عەجەمە گیراوەکان بکۆڵێتەوە و ئەگەر بزانێ پێوەندی‌یان بەم کارەساتەوەنیە، بەرەڵایان بکات.بریارماندا شەو لە دەفتەر بمێنینەوە و چاوەروانی خەبەری سەرگوردی بین. سەعاتی حەوتی ئێوارێ،دوکتور حەبیبزادە تەلەفونی کرد و گوتی :« کاک کەریم ،خەبەرێکی داخدار، سەرگورد تەواو بوو، چبکەین ؟

- تکایە جەنازەکە بنێرنەوە مزگەوتی سوور. نووسراوەیەکی فەوتیشم بۆ بنێرە. زۆری پێ نەچوو دوکتور خۆی هات و ئەم نووسراوەیەشی بەفارسی نووسیبوو:« شاهیدی دەدرێ کە ئاغای حبیباللە عەبباسی رۆژ٭

٥٩/٦/١٠ دوای ئەوەی گوللەی لە سینگ ورانی درا بوو،لە نەخۆشخانەخرا زۆر عەمەلیات و بەراوەستانی دڵ تەواوبوو.»٥٩/٦/١ دوکتور حەبیبزادە مۆری نەخۆشخانە.

کەوتینە سەر باسی ئەوەی کە چبکەین. کاک سەید حەسەنی هاشمی پێشنیاری کرد کە هەر ئەمشەو بینێژین. وەزعەکە خەتەرەو دوورنیە تووشی شەر ببین. یەکدوو کەسیش پشتی پێشنیاری سەید حەسەنیان گرت.زۆرم پێ‌ناخۆشبوو. بەتوندی دژی وەستام و گوتم : خۆتان دەزانن من هەمیشە دژی شەری نێو شار و ئاژاوەناتەوە بووم. هەمیشە هەوڵم داوە کە شارەکەمان تووشی شەرو ویرانی نەبێ. بەڵام ئێستا سەرەرای هەموو مەترسیەکی شەر، نابێ سەرگوردی بەشەو بە نهێنی بنێژین . ئابروومان دە چێ. سبەی جەنازەی سەرگوردی بە رێزو ئیحترامێکی ئە وتۆ دەنێژین کە شایانی سەرگوردعەبباسی بێ. بەخۆشیە وە برادە ران بە تێکرایی هاتنە سەر رای من. بە سەر گورد عەلیاری رەحمەتیمان گوت : هەر ئە م شۆ پێشمەرگەکانی بنکەی لاچین و گوێکتەپەو کیتکە بێنەوە نێو شار و لە شوێنی ستراتیژی و قایم و پێویست لە ئامادەیی دابن.نامەیەکم بۆ دەفتەری سیاسی نووسی و پێشنیارم کرد کە بەیانی برادەرێکی ئەندامی دەفتەری سیاسی‌بێتەوە شار و لە ئاهەنگی ناشتنی سەرگورد عەبباسیدا بەشداری بکات.سەروان جاوید فەری رەحمەتی ئامادە بوو کەبچێتە دە فتەری سیاسی نامەکە بەرێ و برادەرێکیش لەگەڵ خۆی بێنێ.راست لەو کاتەدا کە جاویدفەر دەرۆی دوکتور خەلیقی پەیدابوو.لە سنە رایکردبوو لە مەهاباد دە ژیاو دەیویست خۆ لە حیزبی دیموکرات نیزیک کاتەوە. لە مزگەوتان لەتازیەو پرسەی شەهیدەکاندا بەسەعات وتاری دەداو زۆر جوان سەرنجی خەڵکی رادەکێشا. خۆی هەڵکرد بوو، تفەنگێکی کەلاشینکۆف لە شاندا.سلاوی کرد و گوتی:

کاک کەریم ئەشێ هەر ئێستا بنێری بۆ دەفتەری سیاسی.

گوتم دوکتور گیان بەو شەوە هاوار نیە. ئێمە بەیانی سەرگورد دەنێژین، تۆ پێویستە بەشداری بکەی و وتار بدەی.لە سەر قەبران چەند وشەیەک بفەرمووی. دوکتور خە لیقی کە بۆ وتاردانێک رۆژە رێنک بە پێیان دەرۆیشت، پێی چە قاند و گوتی هەر ئێستا ئەشێ رەوانم کەی.بە کاک جاوید فەرم گوت : لە رێی خوادا ئەوەش لەگەڵ خۆت بەرەو برۆ.سەعاتی ٩ی شەو تەلەفونم کرد بۆ فەرماندەی پادگان.بەر لەوەی من قسە بکەم گوتی :« ئاغای حسامی لەم کارەساتە فرەبەداخم. جێگای داخە، ئەم کارەنائینسانیە » گوتم : ئێمە سبە ی جەنازەکەی دەنێژین.دوکان وبازاری شار دادەخرێ. خۆمان ئەمنیەتی شار دەپارێزین. تکا دەکەم تۆ شەخسەن ئاگاداری وەزع بەو نابێ رێگا بدەی ئاژاوە ساز بکرێ.گوتی: دلنیا بە.من بەتەواری ئاگاداری ئەوزاع دەبم. ئێوەجەنازەکە بنێژن.

شەو سەعا تی دە هەموو برادەران چووینە مزگەوتی سوور. مەیتی سەرگورد لەحەساری مزگەوتێ دانرا بوو. دووپێشمەرگە، وابزانم یەکیان حامیدی غەوثی بوو،سەریان هاویشتبوە سەر مەیتەکەو بە بانگو سەلا دەگریان و مەیتەکەیان بەر نەدەدا.چووم لە سەر مەیتەکە راستم کردنەوەو تۆزێ دڵمدانەوە.خەڵکێکی زۆر روویانکردە مزگەوت و حەسار تەژیبوو. پاشان چوومە پشت بڵندگۆی مزگەوت ولەگەڵ دەربرینی داخوپە ژارە داوام لەخەڵکی مەهاباد کرد کە سبەی دوکانو بازار دابخەنو بە وردودرشتەوە لە بەرێکردنی جەنازەی سەرگوردعەبباسیدا بۆ سەر قەبران بەشداری بکەن .شەو زۆر درەنگ گەراینەوە بۆ دەفتەری تەشکیلات.سەرگورد عەلیاری رەحمەتی لەگەڵ چەند برادەرێکی تەشکیلات لەوێ مانەوە و من چوومەوە ماڵەکەی خۆم.بەیانی بەتێکڕایی چووینە مزگە وت و سەعاتی

• دە لە کاتێکا حەسار ودەورووبەری مزگەوت وشەقامی شار پڕ ببوو لە خەڵک، جەنازەی سەرگورد و شەهیدەکانی تر کە لەسەر ماشێن بەگوڵ داپۆشرابوون، بەرەو قەبران کەوتەرێ. ئەندامانی کومیتەی شار بە ڕیز لە پێش مەیتەکان دەرۆیشتن.رێکخراوەسیاسیەکان بەگشتی بەرێکو پێکی بەشداریان کردبوو. سرودی ئە ی‌شەهیدان و سرودی تری شۆرشگێری و نیشتمانی عاسمانی‌مەهابادی پڕکردبوو.لە سەر قەبران شین وگریانی خوشکی سەروان چەڵەبی، و ژتانیتر، گۆرستانی هاژاندبوو.ماموستا مەلائەحمەدی عەبباسی بەعەرەبیەکی خەست تەڵقینی دادا.خۆم پێرانەگیرا گوتم : ماموستا سە رگورد عەبباسی زۆر کورد بوو، لەکوردی بەدەر هیچی دیکەی نەدەزانی.خۆزیا بەکوردی لەگەڵی دواباى.چاوەروان بووین یەک لە ئەندامانی دەفتەری سیاسی بێتەوە خوار و لە سەر قەبران بەم بۆنەوە وتارێک بدا، لە ناشتنی ئەندامێکی کومیتەی ناوەندی‌دا بەشداری بکا، چاوەروانیەکی بێهودەبوو، هیچیان لە دۆڵی شێخان نەهاتنەخوارێ. پاش بە خاک ئەسپاردنیان لە سەر قەبران کۆ بووینەوەو ئەم وتارەی ژێرەوەم پێشکێش کرد.:

«هاونیشتمانانی بەرێز ! خەڵکی بەشەرەفی مەهاباد!

با بۆ رێز گرتن لە گیانی پاکی ئەو رۆڵە کوردانەی کە بەناهەق بەدەستی،جنایەتکارانی دوژمنی گەل شەهید کران، دەقیقەیەک بێدەنگ راوەستین.

خوشکو برایانی بەرێز ! لێرە کۆبووینەوە تا مالاوایی لە ٣پێشمەرگەی نەبەزی میللەتی کورد بکەبن کە لە رێگای تا زادی و بەختەوەری میللەتەکەیاندا ژیانی خۆیان فیدا کرد.

مالاوایی لە سەرگورد عەبباسی بکەین، ئەو رۆڵە زەحمەتکێشە ی کە هەمووتان دەزانن لەخێزانێکی نەدارو زەحمەتکیش هاتبوە دنیاو بە

فەقیری‌و هەژاری خوێندبووی‌و سەبارەت بە لێ وەشاوەیی، لە ڕێژیمی چەپەڵی پاشایەتیدا گەیشتبوە دەرەجەی سەرگوردی.مەقام‌وپوڵ و دەرەجەی ئەفسەری نەیتوانیبوو لە ڕێگای میللەت لایبدا ، تەنانەت لە سەردەمی ڕێژیمی پاشایەتیشدا هەستی نیشتمانپەروەری خۆی پاراستوەو لە ڕووخانی ڕێژیمی شادا بەشداری کردوە. سەرگورد عەبباسی وەک زۆر لە هاوسەنگەرەکانی دوای ڕووخانی ڕێژیمی پاشایەت هاتە نێو ڕیزی جولانەوەی ڕزگاریخوازی کورد وشەرەفی ئەندامەتی ح.د.ک. وەرگرت.لەوماوەیەدا سەرگورد عەبباسی وەک پێشمەرگەیەکی سادە وەک ڕۆڵەیەکی خەڵک لە ڕێگای ئامانجەکانی حیزبدا ،بێ وچان خەباتی کردوە ، تا لە کونگرەی چوارەمدا بە ئەندامی کومیتەی ناوەندی هەڵبژێردراوە.

هەر وەها ماڵاوایی لە سەروان چەڵەبی بکەین کە ئەویش وەک هاوسەنگەرەکانی وازی لە دەرەجە و مەقامی ئەفسەری هێنا وهاتە نێو ڕیزی خەڵک ولەم ڕێگایەشدا شەهید کرا.

مە حمودی سالحی پێشمەرگەیەکی زەحمەتکێش، چەند ساڵ لە دەربەدەریدا ژیا و تائەو ڕۆژەی شەهید کرا پێشمەرگەیەکی وەفاداری کوردستانبوو.

هاونیشتمانانی بەڕێز ئەو ڕێگایە ی کە میللەتی کورد گرتوویەتەبەر، ڕێگای گەیشتن بە ئازادی و خودموختاری، ڕێگایەکی سەخت و دژوارەو لە مەو دواش دەبێ ڕۆڵەکانی وەک سەرگورد عەبباسی و سەروان چەڵەبی و مەحمودی سالحی گیانی خۆیانی لە پێناودا فیدا بکەن.لە خەباتی سەختو دژواردا خۆراگری و سەبری شۆڕشگێڕی و خەباتی بەردەوام بپێویستە نەک شین‌و گریان . من زۆر بەداخم کە ئەورۆ خوشکەکان ئاوا لە سەر مەیتی شەهیدەکان شین دەگێڕن .من وتە ی

پارەکەم دووپات دەکەمەوە کە لە ناشتنی شەهیدی برای مەلارەسولی پێشنومازدا گوتم :ژنی کورد ئیتر نابێ بۆ شەهیدەکان بگری و شین بگێڕێ، ژنی کورد دەبێ شانبەشانی براکانی بۆ تۆڵەی شەهیدان بێتە مەیدانی خەبات وبۆ ئازادی تێبکۆشێ.

ڕێژیمی دژی خەڵکی کە بەناوی ئیسلام و بەناوی خەباتی دژی ئیمپریالیستی شەری بەسەر ئێمە دا سەپاندوەو دەیەوێ جووڵانەوەی رزگاریخوازی کورد سەرکوتبکا،کاتێ دەزانێ بەشە ڕ و کوشتار و بەگەمارۆی ئابوری و بەهۆزەداتاشینی نێو خۆ دەرزستی کورد نایە، پەنا دەباتە بەر چەپەڵترین شێوە ی نائینسانی کە تیرۆر ورەشەکوژییە.جنایەتکارێکی کە دوێنێ برادەرانی ئێمەی بەرەشەکوژی ناپیاوانە شەهید کردوە، ئەندامێکی سوپای پاسدارانی ئینقلابی ورمێیە. ئەو پاسدارانەی کە کوردە فریو خواردوەکان و حیزبە بەناو پێشکەوتووخوازەکان پێیان دەڵێن نیهادی ئینقلابی! ڕێژیمی دژی خەڵکی و کاربەدەستە بێشەرمەکانی ئوستانی ئازربایجانی رۆژئاوا، ڕاست لەم کاتەدا ئەم جنایە تەیان کردوە کەهێزە شۆرشگێڕەکانی کور بۆ پاراستنی هێمنایەتی شاری مەهاباد ئەو پەری مرونەتیان نیشانداوەو بریاریان داوە کە چەکدارەکانیان لە نێو شاردا نەسوڕێنەوە.هەیئەتی معتمدینی شاری مەهاباد بە نوێنەرایەتی خەڵک قەولیان داوە کە چەکدارەکانی ئێمە دەست لە کاروباری شار وەرنەدەن و هێمنایەتی شار بەدەست شارەوانی حکومەتەوەبێ.جا شارەوانی وئوستانداری ئازربایجانی رۆژئاوا، ئەمنیەتی خەڵک و هێمنایەتی شار، ئاوا دابین دەکەن.لە بە رامبەر جنایەت ونائینسانی کاربەدەستانی حکومەتی کۆماری ئیسلامیدا، میللەتی کورد بێجگە لەوە کە بەچەک لە بوونی خۆی دیفاع بکا، رێگایەکی دیکەی نەماوە.لە بەرامبەر پیلان، و سیاسەتی رەشەکوژی ڕێژیمدا،پێویستە پشتی

یەک بگرین وتا سەرکەوتن ئالأی خەبات دانەنێین.

ح.د.ک.ا. جارێکی دیکەش لەم کۆبوونەوەبەداو لەم پرسەو کارەساتەدا، پەیمانو دەداتێ کە لەگەڵ هەموو هێزە شۆرشگێرەکانی کوردستان یەکێتی خۆی بپارێزێ و تا گەیشتن بەخودموختاری خەبات درێژە پێبدا.جارێکی تر لە لایەن ئەندامانی ح.د.ک. وە، سەرەخۆشی لە کەسوکاری شەهیدە بەرێزەکانمان دەکەم.سەرەخۆشی لە خەڵکی مەهاباد دەکەم. سوپاسی خەڵکی بەشەرەفی مەهاباد و تەواوی ئەو کەسانەدەکەم کە لەم پرسەیەدا بەشدار بوون رهەستی دڵسۆزانەی خۆیان دەر بریوە.

پێی ناوێ بۆ شەهیدی وەتەن شیوەنو گرین ـ ئامرن ئەوانەوا لەدڵی میللەتا دەژین.

سەر بەرزی بۆ شەهیدانی رێگای رزگاری ،ئەمانو مەرگ شۆرەی بۆ زۆرداران‌و دوژمنانی گەل .

دوای وتاری من مەلامحەمدی جوانرۆیی بەقاچی بڕینداڕەوە وتارێکی گەرمی پێشکێش کرد. مەلامحەمدی عەبباسی لە لایەن دەفتەری ماموستا شێخ عیزالدینەوە وتاری دا و پەیامی ماموستای بۆ ٣رۆژ دوکان و بازار داخستن ڕاگەیاند.پاشان نوێنەرانی کۆمەڵەو رێکخراوی فیداییانی خەڵک وتاریاندا.دوای تەواو بوونی ئەم ریو رەسمە عالەمەکە بەئارامی بۆ نێو شار گەرانەوە.

چەند ڕۆژ لە مزگەوتی سوور سەرەخۆشی دانرا. ئەندامانی تەشکیلاتی شار تەواوی رۆژ بەنۆرە لە مزگەوت دادە نیشتن .

## سەفەر بۆ ئورپا.

چە ند رۆژ دوای ئەو کارەساتە دەفتەری سیاسی خەبەریدا کە بۆ لێکۆلینەوەی وەزعی شار وهەلکەوتی پێشمەرگە و تەشکیلات بچمە دۆلی شێخان. سدیقی فە روخی و مەلاعەولای کتابیش لە ناوچە ی بانەوە هاتبوون و کاریان بەدەفتەری سیاسی بوو، ئە وانیشم هەلگرت وچوومە دەفتەر.لەوێ لەگەل دوکتور قاسملو ودوکتور سەعید دانیشتین.لام وایە فەتاحی کاویانیش کە بەر پرسی کومیسیونی بازرەسی بوو، خۆی کردە شە ریک.دوای باس و شیکردنەوەی وەزعی نێو شارگوتم « وام دیتە بەر چاو لە بە رامبەر پەلامار و سیاسەتی شەرانی حکومەتدا ئێمە وەستاوین.تەنیا سیاسەتی دیفاعێکی پاسیفمان گرتۆتەپێش.ئێستا هەتا دەرفەت هەیەو تووشی شەرێکی سەرانسەری و تەواو عەیار نەبووین، بەباشی دەزانم کە کونفرانسێکی میللی سە رانسەری کوردستان لە ئاغاو مەلاو شێخ و سەرۆک عەشیرەت و بازاری ودێهاتی و شارستانی خاوەن زیبک وناسراو پێک بێنین.لە بەرێوە بردنی کاروباری کوردستان پرسیا ن پێ بکەین و بەشداریشیان بکەین.من لەو بەیتەدا کە چوومە سەرەخۆشی نەوەی عەولاغای مەنگور وبرایم اغای نوزەری چاوم بە خەلکێکی زۆر کەوتوەو لە شاریشدا ئاغایانی دێبۆکری دەبینم. گلەیی و قسەلۆک زۆرن، رەنگە کونفرانسێکی ئەوتۆ زیانی نەبێ و بتوانێ خەلکی زیاتر بۆ لای حیزب رابکێشێ.

دوکتور قاسملو گوتی « پێشنیارێکی خەراب نیە. پێویستە بیری لێ

بکەینەوە.» پاشان گوتم : ئێستا بە عیراقدا ڕێی هاتووچۆ هەیە. پێم خۆشە ئەگەر ئیجازەم بدەن و مانیعێک نەبێ، سەفەرێک بکەم و سەرێکی منداڵەکانم بدەمەوە.
دوکتور گوتی :« چەندەت پێ‌دەچێ؟
. پێم وانیە لەمانگێک زیاترم پێ بچێ.
-قەی ناکا. وەزعی تەشکیلات ڕێکو پێک کەو برادەرێک لە جێی خۆت دیاری بکە. دەتوانی سەفەر بکەی.ئێستا ڕەنگە باشتر بێ.پاشان کاک ئەمیر دێ قسەت لەگەڵ دەکات.نامەیەکیشت بۆ دە نووسێن بتوانی لەگەڵ بولغارەکان قسەبکەی. دوای نیوەرۆ گەرامەوە بۆ مەهاباد .لەتەشکیلات مەسەلەی سەفەرم لەگەڵ برادەران هێناگۆڕێ و بەتێکڕایی برادەرێکمان بەجێگر دیاری کردو بڕیاری سەفەرم مسۆگەر بوو.
لەمەودای تێکۆشانی سیاسیمدا ڕەنگە تووشی گەلێک هەڵەو کەمو کوڕی سیاسی بووبم. بەڵام بڕیاری سەفەری ئەمجارەم گەورەترین هەڵەی سیاسیم بوە. هەر بۆیەش دوکتور قاسملو وایەهاسانی و بەبێ بیانوو موافەقەتی کرد کەسەفەر بکەم. نەک لەبەر ئەوە کە هەر پاشی من سەرەرای ئەوەی کە کومیتەی شارستان جێگری منی دیاری کردبوو، تا دەگەڕێمەوە، دوکتور قاسملو دەرفەت دێنێ و کونفرانس ساز دەکا و یەکی ماستاو ساردکەرەوەو گوێ لە مست دەکاتە بەر پرسی تەشکیلاتی مەهاباد، بەڵکوو لە بەر ئەوە لام وایە ئەگەر من لەشار مابامەوە، زۆر وێدەچوو نەهێڵم لەنێو شاردا شەر سازبێ و مەهاباد بکرێتە گۆمی خوێنێ. خۆ ئەگەر ئەوەشم پێ نەکرابایە، لانی کەم لە نێو برادەران دەبووم ولە نێزیکەوە بەشداری زام و دەردی خەڵک و بەشداری تێکۆشانی برادەرانی تەشکیلاتی مەهاباد دەبووم، کە هاوکاریەکی گەلێک

• برایانەمان پێکەوە هەبوو.

پێداگرتنی دەفتەری سیاسی لە سەر شەڕ نەکردنی نێو شار و هاودەنگی فەرماندەی هێزی پێشەواو هەڵوێستی کومیتەی تەشکیلات بۆ پاراستنی هێمنایەتی شار، وای لێکردم کە سەردانی منداڵەکانم بە هەڵ بزانم. بەتایبەت کە کەمالی کوڕم زانستگای تەواو کردبوو.

پاش چەند رۆژ کاک ئەمیر هات، نامەیەکی دەفتەری سیاسی هێنابوو. نامەکە بە ئینگلیزی نووسرابوو: «هاوڕێ کەریمی حسامی دەتوانێ لەلایەن دەفتەری سیاسیەوە لەگەڵ حیزبی کومونیستی بولغارستان لە بارەی وەزعی کوردستانەوە قسەبکات وسلاوی کومیتەی ناوەندی‌یان پێ‌ڕابگەیێنێ.» کاک ئەمیر گوتی : دوو رۆژی تر مەلارەحمانی کاژەیی دێت وماشێنی پێیە دەتگەیێنێتە عیراق. بۆ خەرجی رێگا پارەشت بۆ دێنێ. ئەوەشم پێ سەیر بوو، چونکە من داوای خەرجی سەفەرم نەکردبوو.

مەلارەحمان هات ..١٠هەزار تمەنی بۆ هێنابووم.گوتی من دەچمەوە نەلاسێ کارێکی خۆم هەیە. تکا دەکەم با سبەی لە پیرانشار یەکتر بگرینەوە. ئێوارێ رێکخراوی ئیندرقاش لە گوندی خانەگی بۆ هەڵبژاردنی کومیتە کۆ بوونەوەی هەبوو. داوایان کرد کە بچم بەشداری بکەم. شەو دوای نانخواردن ژانەسگم گرت و نارەحەت بووم. هەموو لەشم دەلەرزی شەو درەنگ کەیاندیانمە شیروخورشیدی مەهاباد. دوکتور حەبیبزادە لەوێ‌بوو.تەماشای کردم گوتی مەسموم بووی، دەرزی لێدام و گوتی نابێ لێرە بی. نابێ هیچ بخۆی ماستاو نەبێ. شەو بردیانمە ماڵی کاک برایمی باباتزادە. ماڵەکەی خۆم کۆ کرابۆوە. کتیب و نامەو سەنەد وبەڵگەکانم پێچابۆوەو لە لای برادەرێکی ئەمین ودزستم دانابوون.شەو لە رادەبەدەر خزمەتیان کردم. چەند جاریش ماستاوم خواردەوە، بەیانی حەلەمم لێ‌برابوو.چوومە تەشکیلات ومالاوایيم لە برادەران خواست و لەگەڵ سێ

پێشمەرگەی دۆست وبرادەر(محەمەدی خوێرپاوایی و سەید ئەبوبەکر • ومحەمدی خاکی ) کە بەداخەوە تاگەرامەوە هەر سێکیان شەهید کرابوون، بەرێگای رەبەت و میراوێ‌دا، بەرەو پیرانشار کەوتینە رێ.لە رەبەت لە کن نەستانیەکان لاماندا، کەبابێکی باشیان بۆ سازکردین و شەو چووینە پیرانشار.هەرچەند لە ماڵی مەلا قاسم چاوەروانی رەحمان کاژەیی بووم کە شەو نەهات، بەڵام کاک مامەندی زەرگەتەنی داوەتی کردین. شەو کاک سەید رەحیمی قەڵاتێنیش هات کە دۆست و ناسیاری کۆنم بوون. شەوێکی خۆشمان رابوارد.

رۆژی دوایی ۱۹۸۰/۹/۳ رەحمان کاژەیی پەیدابوو.براپێشمەرگەکانم بەرێکردەوەو خۆم لەگەڵ مەلا رەحمانی بەرەو عیراق کەوتمەرێ.لە حاجی ئۆمەران رەحمان وەک تەتەری نێوان حکومەتی عیراق وحیزبی دیموکراتدەناسرا، رایان نەگرتین، بەرەو هەولێر شۆڕ بووینەوە.شەو چووینە هەولێر ولە هوتێل هەورامان میوانی حکومەت بووین. سبەی چووینە مەکتەبی حیزبی بەعس.کابرا بەگەرمی بەخێر هاتنی کردم و رەحمان گوتی ئیتر من دەگەڕێمەوە. برادەران دەتگەیێننە بەغدا. دوکتور گوتوویەهەر تا هەولێر بتگەیێنم. رەحمان رۆی. دوای سەعاتێک بەقەولی کاک حەمەدەمینی سیراجی، تولەیەک هات سواری کردم بۆ کەرکوک، لەوی تەحویلی منظمەی دام. زەلامێکی بەقەدرایی هێسترێک وادیاربوو مەسئولی منظمەبوو، بەخێر هاتنی کردم وخێرا بە تەلەفون لەگەڵ بەغدا قسەی کرد و گوتی : « ئوستاز کەریم هاتوەو دەیەوێ بۆ دەرەوە سەفەر بکا.» ناهەنگی ئاخافتن و سواڵ و جوابی و گەرانەوەی مەلا رەحمان لە هەولێر، تارمایێکی گومانلێکراوی خستە سەر بیر وهۆشم و جاروبار هەستی پیلانێک بە خەیاڵمدا دەهات.

رۆژی پێ نەچوو تاکسیەک پەیدابوو، کابرا هات سواری کردم، بێ

ئەوەی کە بلێ بۆ کوێ دەچی و لە کوێ دادەبەزی.گەیشتینە بەغدا، کابرا راست رووی کردە مەنسور و لە هوتێلیک دایبەزاندم.مودیری هوتێل کابرایەک بوو بە ناوی مستەفا جاف.(نەک ئەو کاک مستەفا جافەجوامێرە نیشتمانپەروەری کە لە رێکخراوی نەتەوەیەکگرتوەکان کاری دەکرد.)دوو کوری کوردی خۆش ئەخلاقیش بەردەستی هوتێلەکەبوون.جانتاکانیان برد بۆ ژوورەیەک و:گوتی تۆ لێرە میوانی، لە حکومەتەوە پێیان گوتوم. لە مەهابادەوە برادەرێکی مامۆستایان لەگەڵ ناردبووم بۆ موعالەجەی قاچ. پاش دووسێ رۆژ بێنخەبەی یەکێک هات گوتی تۆ جارێ لێرە بەتا مدیر چاوی پێت دەکەوێ. پاشان بلیتی فرۆکەت بۆدە کرین .باسی معالەجەی لاقی برادەرەکەم کرد، گوتی خەبەرت دەدەینێ.چەند رۆژ پێچوو بردیان بۆ موعالەجە. من مامەوە بۆم دەرکەوت هوتێلی موخابە راتەو هە لاتوەکان ئێرانی لە وێ رادەگرن.فارسی لێبوون دەردی دڵیان دەکرد و من گوێم دە دانێ بێ ئەوەی بزانن کوردم.پاشان لەگەڵ یەکێکیان لە سەلامی بەیانیانەوە گەیشتینە قسەوباسی سیاسی و کابراچی پێبوو هەڵیرشت. من گوتم کوردی ئێرانم و چەند رۆژی تر دەچم بۆ ئورووپا. کابرا کە ناوی چوونی ئورووپای بیست، هەستم کرد حاڵەتێکی بەسەر داهات. گوتی من ئەفسەرێکی شاپەرستم. سێ مانگ پێش رامکردوە هاتوومە ئێرە گرتیانم ماوەی ٢٠رۆژ هەر لێیان نەپرسیم.پاشان دەستیانکرد بە ئەشکنجەو ئازاردانم. دەرۆژ ئازاریان دام. ٢٠رۆژی تردە ژوورێکیان کردم.دوایە هێنایانمەدەر وگوتیان ئەگەر راست دەکەی، دەبێ بچیەوە ئێران و دژی رژێمی خومەینی خەبات بکەی.گوتم: من تەنیا هیچم لە دەست نایەو شارەزای ناوەچەش نیم. دەستێک جلی کوردییان کردە بەرم وبردیانم بۆ کەرکوک.دوای چەند رۆژ بردیانم بۆ قەڵادزە، گوتیان دەتنێرین بۆ لای حیزبی دیموکرات و دەبێ پێوەندیشت لەگەڵ

ئیمە بەردەوام بۆ حەوتونێک لە قەلأدزە رایانگرتم، ئیستاش هێناویانمەوە ئێرە و نازانم چیم بەسەر دێنن.»

گوتم بۆ نەچوویە کوردستان؟

گوتی : وابزانم حیزبی دیموکرات قەبولی نەکردبووم. پا شان گوتی هەرچی بێ ئیمە ئیرانین. تکایەکم لە تۆ هەیە.خزمێکم لە ئوتریشە. بەتیلگراف ئەوەندەی بۆ بنووسە ( فلأن کەس سلأمەتە).ژنومندالم لەتاران بەجێ ماون. بەلام لەگەلٚ ئەو خزمەم پێوەندیان هەیە. ئادریسی دامێ و بەلێنیم پێدا کە تیلگرافیان بۆ بکەم. کابرا سوکنایێکی هاتەدلٚ. بەداخەوە نەکرا ئەم ویستە پچوکەی ئەو ئینسانە بەجێ بگەیێنم. چەند رۆژی تر پێچوو هیچ خەبەر نەبوو.یەک دووجار بەمستەفای مودیری هوتێلم دەگوت کە بپرسی بزانی من بۆ راگیراوم. دەیگوت من کەس ناناسم خۆیان دێن. رۆژێک کە مستەفا لەوێ نەبوو بەیەکێک لە کورەکانی بەردەستی مستەفام گوت :تۆخوا بزانە بۆم ناپرسی من بۆچی لێرە مەحتەلبووم؟.پێیان بلٚێ میوانەکەتان دەلٚێ من دەبێ سەفەر بکەم. تۆزێ نێو دەفتەرەکان گەڕا وتەلەفونێکی دیتەوە وژمارەکانی سوڕاند و هەستم کرد چرژا.ئەوەندەی گوت : لە هوتێلەوە تەلەفون دەکەم.گوشیەکەی داناو گوتی : دەلێن غەلەتە، کێ ئەو ژمارەی داوە بەتۆ؟.

دووروژ پێچوو، رۆژێک کەس لە وێ نەبوو، بیرەی بۆ هێنام. گوتی لەسەر ئەو تەلەفونەی تۆ کەم مابوو سەرم تێدا بچێ.بانگیان کردم ،گوتیان ئەو ژمارەیەت لە کوێ بوە؟ پاشان گوتیان جارێکی تر تەلەفون بکەی خۆت دەزانی. لە بەغدا بێکار سەری دوست و برادەرانم دەدا و دۆست وناسیارم بەسەر دەکردنەوەو دەستیشم وەهیچ کوێ رانەدەگەیشت. بازاڕێکی مودێرنی گەورە لە مەنسور دروستکرابوو، رۆژێک لە وێ

دەسوڕامەوە تووشی مەلا سولەیمانی عەبباسی بووم.پرسیم لێرەچەدەکەی؟
-ما شێنێکم هێناوە بیفرۆشم. لێرە قسەم لەگەڵ مەکە. یەکێکم بەدوایە.
دوای نیوەڕۆ لێرە بتبینمەوە. لێک کلابووین.دوای نیوەڕۆ چوومەوە
شوێنی گۆرین. مەلا سولەیمان هات گوتی: ئەوە ١٥ڕۆژەلێرە ماومەوە.
بۆم دەرکەوتوەکە بە عس خەریکە کوێ‌ـار جاشەکانی لای پژدەر چەکدار
دەکاو دەیاننێرێتەوە کوردستان و دەبەوی جیا لە حیزبی دیموکرات
شەڕیان پێ بکا.ناوی دروسێ کە سیشی گوت.هەروەها چەند کوردی
ئێرانی کە لە شەری ٣مانگەدا هاتبوونە عیراق، ئە وا چەکیان دەداتێ
ودەیاننێرێتەوە بۆ شەڕ و ئاژاوەنانەوە.هێندێ خەبەری دیکەشی گوت و
ئیساری کرد کە خەبەر بدەمەوە حیزب. دوایە گوتی دەبێ بڕۆم، ئەگەر
لە جێیەک تێک هەڵەنگوتین مەمدوێنەو لێم لادە.من جارێ ناتوانم
بگەڕێمەوە.

دۆستێکی دڵسۆز و کورد و نیشتمانپەروەر خەبەری دامێ کە شەو
لەماڵی دۆستێکی دڵسۆز دانیشین.تەنیا چوار کەس دەبین و تاقور
لۆقیش دەچین تا ئەماتبینن.بەو ماڵەم دەزانی. خۆم گەیاندێ،ئەوانیتر لە
وێ بوون. بەر لە هەموو شت داخ و پە ژارەیان لە جیابوونەوەی تاقمی
حەوت کەسە دەربڕی.پاشان گوتیان زە بیحی بێ‌شوێنە و لە وەتی لە لای
ئیوەگەراوەتەوە ، کەس بە شوێنی نازانێ. گوتم پێویستە لە کن
مەلاعەولای حاجی سمایلی سۆراخی بکرێ. گوتیان زۆر کەس وەدوای
شوێنی کەوتوە دەڵێن کوژراوە.پاشان یەکیان گوتی: خێزانی برادەرێکمان
چۆتە باڵیۆزخانەی سوفیەت. لەوێ پێیان گوتوە: هەر چۆنی بۆتان دەکرێ
خەبەر بدەنە حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران کە چاومان بەکەسیکیان
بکەوێ.پێشنیاریان کرد کە سەرێکیان بدەم بەڵکوو خەبەرێکیان پێ بێت.

شەو درنگ هاتمەوە هوتێل. نامەیەکی دوورو درێژم بۆ شەخسی

دوکتور قاسملو نووسی. خەبەری مەلا سولەیمان وقسەی ئەفسەرەشاپەرستەکەو راسپاردەی باڵیوزخانەی سوفیێت و وردەشت وخەبەری کە زانیبورمن، هە موم کۆ کردنەوەو بیرورای خۆشم لێ زیاد کرد و نووسیم: «تکایە بەهیچ جور بروا بە حکومەتی عیراق مەکەن و هەتا بۆتان دەکرێ و دەتوانن، بەجورێک لەگەڵ حکومەت رێک کەون.مەهێڵن شەر پەرە بستێنێ، بەهیوای درۆ وبەڵێنی بەعس خۆ تووشی شەرێکی قورس مەکەن. ئەوانەی ئێرە جێگای ئیعتیبار نین.»

هێشتا لە مەهاباد بووم کیژە کوردێکی عیراقی کە لە ئێران شوویکردبوو، باوکی کوردێکی نیشتمانپەروەر و دۆستی ئێمەبوو، هاتە دەفتەری تەشکیلات و داوای وەرەقەی ئیجازەی کرد کە بچێتەوە ماڵی بابی و پێشمەرگە مانیعی نەبن.هەرچەندە بریار درابوو بەبێ نووسراوەی کاک ئەمیری قازی پێشمەرگەی سنور تابی کەس رێگا بدەن بچێتە ئەودیو . بەلام کاک ئەمیر لە دەست دانەبوو من نامەم بۆ بنکەی سەر سنور نووسی و بەتەلەفونیش بە برادەرانی پیرانشارم گوت بەرێی بکەن. ئەو کیژە دەگەراوە بۆ مەهاباد.دەرقەتبوو، هەم زوو دەگەیشتەوە، هەم جێگای باوەڕ و دڵنیایی بوو.ئەو شەوەی من نامەکەم نووسی، بەیانی ئەو دەکەوتەرێ. بەیانی زوو چوومە ماڵیان.ئەوەندەی توانیم لە سەر نهێنی کاری وگەیاندنی نامەکە قسەم بۆکرد.نامەم دایەو کەوتەرێ. گەڕامەوە، سەعاتی ١١ چوومە باڵیوزخانەی سۆفیێت.داوام کرد یەکێک ببینم. کابرایەک هات بەناوی سکرتێری یەکەمی سەفارەت خۆی ناساند.پاش ئەوەی کە ناوی خۆم پێگوت ، گوتی ئێمە دەمێکە رامانسپاردبوو کە یەکی حیزبی دیموکرات ببینین.

موسکو داوای لێکردووین کە لە سەر وەزعی ئێستای کوردستانی ئێران ئاگاداریەکی تەواوی بدەینێ. پاشان هاتەسەر هەڵوێستی غەنی

بلوریان و رەخنە یەکی خەستی دور بە دووری لیگرت.

من بەدرێژی باسی ئاوارە یی و دەربەدەری خەڵکی شارەکانی سنەو سەقز و بانەو مەریوان‌و شنۆ و مەرگەوەڕ گەمارۆی ئابوریم کرد. پاشان هاتمە سەر سیاسەتی نادۆستانەی سۆڤیێت سەبارەت بەکورد وچەوتی ئەو سیاسەتەم بە گوێرە ی بۆچوونی خۆم روونکردەوەو گلەییم کرد . کابرا بەگوێرەی عادەتی دزێوی دیپلۆماسی دووپاتی کردەوە کە ئێمە دۆستی کوردین.ئەوەشی لێ زیاد کرد گوتی : ئەوەنیە سکرتێری گشتی ح.د.ک.ا. لە میتینگی مەهاباد دا گوتوویە:«دۆستی لەمێژینەی میللەتی کورد یەکێتی سۆڤیێتی پشتیوانی ئێمەیە . ئەو راست دەکات»

گوتم پشتیوانی بەقسەنابێ‌ئەمڕۆ کورد پێویستی بە یارمەتی و پشتیوانی‌راستە قینە و کردەوەیی هەیە.

کابرا دیاربوو هیچی پێنەبوو.هەر ئەوەندە بوو دەیویست لە وەزعی کوردستان ئاگادار بێ.لای ئێوارێ لە هوتێل دانیشتبووم، کابرای بەعسی هات گوتی: لە دوای تۆهاتوم، ئەبو ئەحمد دەیەوێ بتبینێ.

سواری کودم بۆ موخابەرات. ئەبوئەحمەد مودیری گشتی موخابەراتی عیراق لەگەڵ سێ کەسیتر لەوێ دانیشتبوو.دوای سلاْو ومەرحەبا قاوەیان هێنا، ئەبو ئەحمەد گوتی کەی سەفەر دەکەی؟

-دەمێکە لێرەتان راگرتووم، من تەنیا مانگێک ئیجازەم هەیە و نازانم بۆچی راتانگرتووم؟ لە وەزعی حیزبی دیموکرات وشەڕ و بارودۆخی کوردستان پرسیاری زۆری کرد وگوتی ؟ حیزبی دیموکرات لەگەڵ کام وڵاتی دەرەوە پێوەندی هەیە؟

- ئاگادار نیمە خۆت دەزانی من ئێستا ئەندامی کومیتەی ناوەندی نیم.ئاگاشم لە پێوەندیە کانی دەرەوەنیە.

- وەک ئێمە خەبەردارین ئەندامێکی بەرپرسی حیزبی دیموکرات لە

یەکێ لە پێتەختەکان سەری لە باڵیۆزخانە ی دەوڵەتێکی مەزن داوە. دیارە پێوەندی هەیە.
- نازانم ، بەڵام ئەگەر پێوەندی هەبێ لاموایە هەقی خۆیەتی.گوتی :«باشە،پاسپۆرتەکەت بدە تا بلیتت بۆ بکڕنو ئەگەر پارەشت پێ بە بیاندەیە با بۆت بکەن بەدۆلار.فڕۆکە رۆژی پێنجشەمۆ هەیە، دەتوانی سەفەر بکەی.ئیتر پاسپۆرت و پارەکەیان لێ وەرگرتم و هێنایانمەوە هوتێل. ئیوارێ تەلەفونم کرد بۆ سوفیا تەنیا شلیزی کچم لە ماڵێ بوو. گوتم ؟ رۆژی پێنجشەمۆ دێمەوە چتان بۆ بکڕم؟
- هیچمان ناوێ، هەر بۆ خۆت وەرەوە هیچی دیکەمان ناوێ. شەو برادەرێکم بەژنو منداڵەوە،داوەت کرد پێکەوەنان بخۆین.رۆژی دوایی چورمە کۆڕی زانیاری کوردی دیوانی گۆران و یەکدوو کتێبی دیکەم وەرگرتن وماڵاواییم خواست وهاتمەوە هوتێل.کاک مستەفای مودیری هوتێل هاتە لام گوتی : هاتون گوتویانە بەیانی لە هوتێل دەرنەچی لە دوای دێن. شەو بەر لە نانخواردن دیتم شێخ سەتتار پەیدا بوو.دانیشت و چاک و چۆنی و گوتی: بیستم لێرەی گوتم با سەرێکت بدەم. دیوانی گۆران ونووسراوەیەکی خۆی( مێژووی حیزبی شۆرشگێری کوردستان ) ی بۆ هێنابووم. تۆزێ لە ولاتر مێزێک دانرابوو، چوارکەسێتر هاتن دانیشتن و دەستیان کرد بەبیرەخواردنەوە. هەستم کرد پتر لە پێویست سەیری شێخ سەتار دەکەن. زۆری پێ نەچوو، شێخ جەبباری براشی هات و لەکن ئەوان دانیشت.من شێخ جەببارم نەدیبوو. جارێک لەگەڵ کاک حەمەدەمینی سیراجی دەچووینە لای سەعدونشاکر. لە ژووری چاوەڕوانی دانیشتبووین، زەلامێک وەژوورکەوت و داوای مەعاشی کرد.بەسرتە پێی گوتم : «ئەوەشێخ جە بباری مقدسە » تاشەو درنگ، واتە تا من نەچوومەوە ژوورەکەی خۆم ئەوان نەبزوتن.بەیانی سەعاتی ٨ کابرا یەک

هات سواری کردم بۆ موخابەرات. بردیانمە هۆدەیەک، دانیشتم و ئە بونە حمد هات.گوتی سەرۆک دەیەوێ بتبینێ.مەبەستی بە رزان تکریتیبوو.سەعات ٩ گوتی فەرموو، سەرۆک هاتوە.کە چوینە ژوور یەکی دێزەی گرژی چەموشی خوێن تاڵ دانیشتبوو، سڵاوم کردو چوومە پێش تۆقەیەکم کرد، دیار بوو زۆر بەناسەر سەنگی دەستی هێنا.کورسیەک خاڵیبوو، چووم دانیشتم.ئە بو ئە حمد وەدەر کەوت. بەرزان گوتی:« شلونک... قاسملو شلونە،
- با شم ... قاسملوش باشە...
- جەلال تالەبانی شلونە؟
- من لێرەم و ئاگام لە جەلال تالەبانی نیە. کابرا ماتبوو. پاشان گوتی:
- پێت وایە ئێرە بنگلادێژە؟ ئێرەعیراقە تۆ چۆن دەچیە سەفارەتی بێگانان، نازانی مە متوعە
- من عیراقی نیم. کوردی ئێرانم .ئەندامی حیزبی دیموکراتم...میللەتەکەم لەگەڵ حکومەتی ئێران لە شەڕ دایە.بە ئەرک ومافی خۆمی دەزانم بچمە هەموو سەفارە تێک و هاواری میللەتەکەم راپگەیێنم. ئە بونە حمد هاتەوە ژوورێ. کابرا بێ ئەوەی وەلامی من بداتەوە، رووی کردە ئەبونەحمەدو گوتی: للسبعە(بۆحەوتی). ئە بو ئە حمد گوتی فەرموو. هەستام، کە هاتینەدەر، دووکەسیتر لە وێ وەستابوون. بەوانی گوت: (للسبعە).وەپێش خۆیاندام و لە خوارێ بردیانمە حەسارێک ، لەگەڵ عەرەبێکی سووری کە هەر بەتای بێژامەبوو، سواری ماشێنێکی کۆنی دوو دەرکیان کردین شووشەکانی بۆیاخ کرابوون و هیچ دیار نەبوو،کەوتینەرێ. نازانین بۆ کوێمان دەبەن.لەحەسارێکی زەلام چوە ژوور ودایانبەزاندین. منیان بردە ژوورێکی پیسی پڕ لە دارو تەختەو کۆنە زیلو وکۆنە جا نتاو شتی وا.کۆنە بیژامێکی شڕ و پیسیان بۆ هێنام

گوتیان جلەکانت داکەنە.هەموو لیباسەکانیان لێ وەرگرتم بە کەوشەوەش. چاویان بە ستم و بەکێک دەستی دەکێشام، هەستم کرد چوونە نێو ئاسانسۆر. نازانم لەقاتی چەندبوو راوەستاین. لە بەر دەرگایەک رابانگرتم، دەرگایان کردەوەو بردیانمە نێو دەرگا ، چاویان کردمەوەو پالێکیان پێوەنام و دەژوورییان هاویشتم.ژوورێکی دوومیتر بە رێنوچەند میتر درێژ. دەستشۆری و ئاو تێدا. دوو پەتووی کۆنی پیس لە سەر عەرزەکە، یەک دووجێگا خوێن رژابوو.کونێک لە دەرگادا، مرقەوایەکیان پێوە هەلاوەسیبوو، نەدەکرا دەرەوە ببینی.ئێرگزندیشن لە بەری میچی قایمکرابوو، دەنگی مێشکی ئینسانی دەهاڕی.لاموایە دوای ٣ سەعات دەرگایان کردەوەو گوتیان وەرەدەرێ. چاوین بە ستم وبردیانمەوە ئەو ژوورەی کە خۆم لێ گۆڕیبوو. جلەکانیان بۆ هێنام و پاشان بردیانمە دەفتەر.کابرایەک لەوێ دانیشتبوو، رابوو .تۆقەی کرد و گوتی : (العفو استاذ).هەلەیەکی پچوک بوە، فەرموو بابرۆین، فرۆکە هەیە، سەفەر بکە.بردیانمەوە هوتێل، کابرا لەگەلم هاتە ژوورەکەم و گوتی شتەکانت کۆ وەکە. چەمەدان وکتێب و شرەو برهم تاقەت کرد و دوو کەلیمەم بۆ برادەرەکەم نووسی کە وامن سە فەرم کرد.هاتینەخوار، خواحافیزیم لە مستە فا جاف کرد وسواری ماشێنێکی دبکەیان کردم کە یەکیانم دەناسی، بەناوی سالم و پێشتر کە لە بەغدا بووین زۆری هاتوچۆ دەکردین.کابرا گوتی :(اللەمعک) کەوتینەڕێ.کەمێک رۆیشتین، ئەوەی لەتەنیشتم دانیشتبوو،گوتی: (ئە بوئە حمد گوتوویە بەکن مندا بێ.)لە کۆلانێک بایداوە و لە پڕ گوتی : ئەها ماشێن خۆمان لێدەدا. هاتم ئاوڕ بدەمەوە، سواری سەرمبوو دەمانچەی لە پشت ملی راگرتم و گوتی:(اسکت).بردیانمە ژوورێکی زەلامی وەک گاراژ، چاویان بەستم و سوار ی ماشێنێکی شوشە سواخدراویان کردم و بۆ شوێنی

پێشوو.لیباسەکانیان لێ وەرگرتمەوەو بیژامە کۆنیان بۆ هێنامەوەو بردیانمەوە ژووری گۆرین.١٩رۆژی رەبەق کەس دەرگای لی نەکردمەوە.رۆژێ دووجار بە کونەکەیدا سیغاریان دەدامێ.هەر بەوێشدا شقارتەیان لێدەدا سیغارەکەم داگیرسێنم. بەلاّم لاسکە شقا رتە سووتاوەکەیان وێنەدەدام. نیوەرۆیان گۆشت و برنجیان دەهێنا.بەیانیان نیسک وئێواران چایەک. لە سەرەتاوە لام وایە سێ رۆژان نەخەوتم.هاتووچۆم دە کرد، تا هیلاک دەبووم.جێگاکە رەقبوو، پشتم دێشا، ئەوەی شەو ورۆژ لە مێشکمدا دەنگی دە دایەوەو کاسی کردبووم و بەری نەدەدام وتەکەی شلێری کچم بوو کەگوتبووی: ( بابە هیچمان ناوێ و هەر بۆ خۆت وەرەوە ).ئەم وتەیە مێشکی بەر نەدەدام و نەیدەهێشت تاوێک وەحەسێم.ئیلهامە، حسی شەشەمە، هەستێکی دەروونیە، نازانم، ساخ نەبۆتەوە، بەلاّم شتێکیش هەیە، جاروبار بە مێشک و دلّی مروڤ دادێ و ئاگاداریەکی نادیارت پێدەگەیینێ. پۆستی قەرەوڵی ژووری ئەم دالانە راست لەبەر دەرگای ژوورەکەی منبوو. لێی نووسرا بوو : بێدەنگ و بێ هەست). کەس ورتە ی لە بەر نە دەهاتەدەر.گوێچکەم بە دە رگاوە دەنا، بەڵکوو گوێم لە شتێک بێ. جاروبار بەزەحمەت غە لْبەیەکم دەبیست، یانەگەر خشپەیەک دەهات دەمزانی هاتووچۆ دەکەن.رۆژێکیان بە عادەتی خۆم گوێچکەم بەدەرگاوە نابوو، سەربازێک هاتەوەو وەک لە بیری چووبێ کە نابێ دەنگی لە بەر بێتەدە رێ، بەوانیتری گوت:(عبدالرحمان معدوم). نازانم بۆ خورپەم لە دلّی هاتو ماموستا زەبیحیم هاتە بیر و گوتم وەللهی زە بیحییە.چونکە چەند رۆژ پێش باسیکرابوو کە بی سەرو شوێنە.ئیتر ئەوەشم بۆبوو بە فیکرێک .کە شلێرم لەبیر چوبایەوە، ماموستا زەبیحیم وەبیر دەهاتەوە.

لە پێشدا کە بەرزان گوتبووی بۆچی چوویە بالیۆزخانەی بێگانە زۆرم

بێ گرنگ و جێی ترس‌نەبوو.پاش چەند رۆژ لە پڕ وەبیرم هاتەوە کە من نامەم بۆ دوکتور قاسملو نووسیوەو لە وانەیە نامەکە گیرابێ.جا ئەگەر وابێ، خۆم هیچ کە نەجاتیم نایە، خەمی ئەو کیژەو تووشبوونی باوکی و کەسوکاری، ئەوانەش بوونەسەر باری فیکر وخەیاڵ و دەهات جێگای فیکری شلێری کچم بگرنەوە.خەمێکی دیکەش تێکەڵ بەو لافاوەببوو، داخم بۆ دەخوارد. ئەو رۆژەی گیرام لەگەڵ دۆستێکی گەلێک خۆشەویستم وادەو ژوانم هەبوو کە یەکتر ببینین.ئە وانە گشتیان کۆ بوونەوە . دوای حەوتویەک ژانێکی بێ‌رەزهاو کوشندە لایەکی سینگ و شانو پیلی گرتم و ئاراو قارام لێ هەلگیرا.حاوانەوەم نەبوو، حەجمینم لێ هەلگیرا .بەسەر پێوەدەهاتم و دەچووم و هاوارم دەکرد. دوای هەراهەرایەکی زۆر وپاش دوورۆژان دوکتوریان هێنا.دوونەفسەریش لەگەڵی هاتبوون. ترسی سەکتەو شەلەلم هەبوو. دوای تەماشاکردن، دوکتو گوتی:(تشنج اعصابه).چەند حەبی دامێ گوتی: دوودەنک ئێستا بخۆ، دوایە رۆژێ دوودانە.داوای تۆزێک دەرمانی ئەسپی‌یانم کرد، گوتی: نابێ، عیلاج شوشتن و ئاوە.

حەبەکانم خوارد. نازانم چۆن و کەنگێ، ئەوەندە دە زانم ٢٤سەعات خەوم لێ کەوت. ژانی بەدەنم براو ئەمجار رۆژانە خۆم رووت دەکردەوە و بیژامە پیسەکانم دەشوشت و ئە سپێم لێ فرێدەدان . سەر گەرمیەکی خەراب نەبوو، پێژ امەم دەشوشت وئەسپێم دە ئاوێ داوێشتن. لام وایە بە چوار پێنج رۆژ پا کم کردبوونەوە . شەوێک بوو بەتەقەو دەنگی تەقەمەنی زۆر دەهات، بیرم لەکودیتا دەکردەوە، بەلام خەبەرێک نە بوو.

دوای ١٩رۆژ سەعاتی نۆی شەو دەرگایان کردەوە.چاویان بە ستم و بەراکێش بردیانمە دەرێ و چووین دەئاسانسۆر. لە خوارێ هاتینەدەر و دایانم بەدەستی یەکیتر.دەرۆیشتندا دەمزانی لە دەرگایان رەت دەبین.

لەم ناوەدا نەقورچیان دەگەباندمێ و جنێوصان دەدا و (فارسی مەجو س) یان دەگوت. بردیانمە ژوورێک و هەر بەچاو بەستراوی لە سەر کورسیەک دایاننام.دوای چەند دەقیقە چاویان کردمەوە. ئەفسە رێک زەلام لە پشت مێزێک دانیشتبوو، ٥ زەلامی دیکە هەریەکەی چۆماغێکی وەک دارتەقلە یان لە نێو رانی خۆ نابوو بەریز دانیشتبوون.تەلەفیزیۆن فرۆکەی نیشان دەدا کە [illegible] ن.کابرای ئەفسەر ناو وشۆرەت وکاری پرسیم و گوتی [illegible] ئێمە راپۆرتیان داوە کە رۆژی فلان، سەعاتی فلان تۆ چوویە بالیۆزخانەی سۆفیێتو پاش سەعاتێک هاتوویەدەرێ. ڕاستە،یان نا؟

گوتم ڕاستە لەو رۆژەدا من چوومە بالیۆزخانەی سۆفیێت.

- بۆچی چووی ؟

- خۆت دەزانی ئێستا لە کوردستانی ئێران لەگەڵ حکومەتی خومەینی لە شەڕ داین.ئێمە پێویستە دەنگی خۆمان بەدنیا ڕابگەیەنین.سۆفیێت دەوڵەتێکی گەورەیە و منیش ئەندامی حیزبی دیموکراتم، چووم وەزعی شپرزە ی کوردستانم باسکردوە.

- لەگەڵ کێ ئاخافتنت هەبوو ؟

- نازانم. ئە وان نێوی خۆیان نالێن. ئەوەندەیە کابرا فارسی دەزانی و بەفارسی دەدواین.

- باسی عیراقتان چکرد ؟

- باسی عیراق لەگۆڕێدا نەبوو.نە ئەو لەسەر عیراق پرسیویە و نەمن باسم کردوە

پاش ئەوەندە پرسیار وەرسیڤە، گوتی بیبەنەوە.چاویان بەستم و بۆ جێی جاران.ئەو دیتن و پرسیارە، پە ژارەی بیری گرتنی کیژەکەو دیتنەوەی نامەکەیان لە سەر مێشکم سوک کرد، زانیم نامەکە نەگیراوە.

لام وایە مانگێک تێپەڕیبوو، رۆژێک بانگیان کردم، چاویان بەستم و بۆ خوارێ. لە هۆدەیەک دایاننام، چاویان کردمەوە، دیتم ئە بو ئە حمد دانیشتوە .دەستی کرد بە م وشەحیز ریزراوانەی کە سەدچار بەدرۆ گاوڕێی دەکەنەوە.: (اهلا ، شلۆنک ، شلون احوال و.... )پاشان گوتی خەتای خۆتە بۆچوویە سەفارەتی سۆڤێت و بەئێمەت ڕانەگەیاندوە؟ گوتم «من ئەندامی ئێوەنیم تێکۆشانی خۆم بەئێوە رابگەیێنم.من ئەندامی حیزبی دیموکراتم و چوونی هیچ سەفارەتێکیش تاوان نیە. بەتایبەت کە ئێستا ئێمە لە شەڕداین .من هاتووم سە فەر بکەم، میوانی ئێوەم، لە جیاتی بەرێکردن زیندانیم دەکەن. حیزبی دیموکراتیش بە دۆستی خۆتان دەزانن.» گوتی :« خۆ تۆ ئە ندامی حیزبی دیموکرات نی.لە کونگرە تۆ دیفاعت لە رو س و لە خومەینی کردوە، لە کونگرە هەڵنەبژێردراوی پاشان لە حیزب چوویەدەر ریوری بەتودە بی.

گوتم درۆیە ئاگاداریتان کەمە. من ئەندامی حیزب وبەرپرسی تەشکیلاتی مەهابادم .

گوتی " دوکتور سەعید بە ئێمەی گوتوە .ئەو خۆی ئەندامی حیزبەو ئەڵمانی باش دەزانێ.» کەگوتی دوکتور سەعید گوتوویە، وەشک کەوتم کە درۆ دەکا. چونکە نەمزانیبوو کە صادقی شەرەفکەندی چوویتە عیراق. بەلام کەگوتی : ئەڵمانی باش دەزانێ، بۆم روون بۆوە کە دوکتور حەسەنی شەتەوی کاتێک لە کونگرەی حیزب گەڕاوەتەوە، رووتی کردوونەوە.

پاشان گوتی : تۆ بێ ئیجازەی حیزب سەفەر دەکەی و دەچی لە ئورروپا دادەنیشی کامران لە کەرکوک بەبرادەرانی ئێمەی گوتوە.

– ڕاست نیە. من بەئیجازەی حیزب دەچم و نامەی دەفتەری سیاسیشم پێیە.

گوتی دەزانی ئیستا لەگەڵ خومەینی لە شەڕداین؟تۆ ئەوەدەم پێشنیارەکانی ئێمەت قەبوڵ نەکرد و نەت دەویست خۆشتان دژی خومەینی شەڕبکەن.

- پێم وانیە شەڕتان لەگەڵ خومەینی بەجیددی بێ دەنا منتان لێرە حەبس نەدەکرد.حیزبی دیموکرات لە شەڕ دایە، ئێوەش ئەندامی حیزب دەگرن.گوتی بیبەنەوە. دووبارە بۆ شوێنی جاران. ماوەیەک پێچوو بێ خەبەر،دیسان ژانی سینگ و شان و پیلم دەستی پێکردەوە،دووڕژژان هاوارم کرد، دوکتۆریان هێنا.دوای تەماشاکردن، چەند حەبێکی دا بە کێشکی بەر دەرگا، کە رۆژێ دوو دە نکم بد اتێ.باشبوو بەر حەبانە، ژانەکە دەشکا. شەونکیان سەعاتی ١٠ دەرگایان کردەوە، چاویان بە ستم وبردیانم بۆ ژێر زەمینێکی چۆل و خالی دایاننام.هیچ هە ست و دەنگێک نەدەهات. ترسام کە بمنێرنە بەهەشت، زوریشم پێ ناخۆشبوو .تاوێک پێچوو هاتن، دەستیان گرتم و بەراکێش بردیانم بۆ ژوورێکی تر، دایاننام و چاویان کردمەوە. ئەفسەرێک دانیشتبوو ، گوتی مترجمی فارسیمان بۆ هێناوی. ئەفسەرێکی تر هاتە ژوور، فارسی باشدەزانی. سەرلە نوێ هەر پرسیارەکانی هەوەڵیٚ دووپاتکرانەوە. وەلامەکانیش هەر ئەوەبوون کەگوترا بوون.پاشان گوتم: لە سەر چی منتان ڕاگرتوە، من عیراقی نیم وئە ندامی حیزبیکم کە دۆستی ئێوەیە.گوتی لە سەر حیزبی دیموکرات بۆمان بنوسە.

- چتان لە سەر حیزبی دیموکرات بۆ بنووسم .ئێمە ما وەی حەوت ساڵ لێرەبووین، یارمەتیتان داوین، لەگەڵ حیزبی بەعس پێوەندیمان هەبوە. من بە ر پرسی حیزب بووم، لام وایە هیچی شاراوەمان لە ئێوە نیە. چیتان بۆبنووسم؟

دەفتەر وقەڵەمێکی لە پێش دانام و گوتی بیبەنەوە. بردیانمەوە ژوورە

کەی جاران.دەستم کرد بەنووسین لە بارەی وەزعی زیندان و هەرچی بە خەیاڵم دا دەهات. دووسێ لاپەرەم نووسی.دوایە بیرم لێ کردەوە جییان لێ بکەم.بۆم ناگەنە دەرێ. کزنە بیژامەیەکی شڕم لە بەردایە، چ‌بکوژن و چ‌ئازادم بکەن، هەر دەکەوێتەوە دەستی ئەوان. دراندم و بەدم ئاوی توالێتم دادا.پاشان دەستم کرد بە نووسین لە بارەی ح.د.ک.ا.کە چەندەخۆشەویستی خەڵکەو بەهێزە و حیزبێکە رابردوویەکی خەباتی هەیەو بە کورتی هەرچی توانیم نووسیم و بەرێکیشم پێوەنا.حەوتوێک پێچوو بانگیان کردم ، ئە بو ئە حمد هاتبوو.پرسی: داوایان لێیکرد بووی لە سەر حیزبی دیموکرات بنووسی، کوا چت نووسیوە؟

گوتم ئەوەی زانیومە نووسیومە. ناردی هێنایان. بەکوردیم نووسیبوو، تێی نەدەگەیشت.گوتی ئێمە بڕوا بەتۆ ناکەین. بە حیزبی دێموکراتمان گوتوە کە سەفەرت کردوە. تازەش ژنو منداڵت ناپێنیەوە.راستیشت بەئێمە نەگوتوە کە بۆچی چوویە سەفارەتی سۆڤیەت باسی چت کردوە.

گوتم ئەوەی گوتومە نەمشاردوتەوە. باسی هێرشی حکومەتی خومەینیم کردوە.نامەی حیزبی دیموکراتیشم پێ بوەو بەئیجازەش سەفەر دەکەم.

- کوا نامەی حیزب لە کوێ یە؟
- لە نێو ئە سبابەکانمدا بوە.
- بچوو بیهێنە .

بردیانم بۆ لای جانتاکانم . نامەکەم لە نێو کتێبانـدا دیتەوە.٤ـ٥ئالبۆمی رەسمی پێشمەرگە و میتینگ و کوردستانم پێ بوو، پشکنیبوویان، تەنیا یەک رەسمیان هەڵگرتبوو، کە لە گەڵ مەلامحمدی جوانڕۆیی بوو.نامەکە م هێنا، بەئینگلیزی نوو سرابوو. خوێندیەوە گوتی راستە.بەلام هەموویان دژی تۆ قسەدەکەن. ئەوەی چاویلکەی لە چاوی

- دایەو ناوی کەماڵە، ئەوە کێیە؟
- ئەگەر ناوی کەماڵبێ، دیارە کەماڵە. من خەڵکی ناوچەی مەهابادم و زۆر کەس ناناسم.
- وانیە. هەموو ناوی خۆیان دەگۆڕن . تۆش ڕاستی ناڵێی.
- من کەسێکی وا ناناسم. ڕاستیشم گوتوە.
- بڕوات پێ ناکەین. ئەگەر دەتەوی ماڵو منداڵی خۆت ببینیەوە، دەبێ هاوکاریمان بکەی.
- پێم سەیرە حیزبی دیموکرات هاوکارتانە هاوکاری من دەبێتەچی.
- ئەوە خۆمان دەیزانین. ڕێگای دیکەت نیە،دەتەوێ ڕزگاربی، دەبی هاوکاری بکەی.تۆ لەگەڵ ئێمە ڕاست نەبووی. گوتم من ئەندامی حیزبی دیموکراتم، حیزبی دیموکراتیش پێوەندی هاوکاری هەیە، ئیتر هاوکاری من مانای نیە.

گوتی بیبەنەوە. چاویان بەستم و بۆ جێی جاران. خەیاڵ و بیری جۆربەجۆربەمێشکمدا دەهاتن‌و دەمگوت باشە یانی برادەرانی حیزبی نەیانزانیوە کە من نەگەیشتومەوەو بێ سەرو شوێنم؟ زۆرم بیر لێ کردەوە، هاوکاری چی؟ لەحیزبی دیموکرات دا جێیان لێ شاردراوەتەوە؟.بڕیارمدا ئەگەر ئەو جار بانگم کەنەوە، بڵێم هاوکاریتان دەکەم. ئەوە باشترە نەک پیاو لەزیندانندا برز بێ‌و یا بەخۆڕایی لە بەینی بەرن. حیزبی دیموکراتیش بەقەد بزنێکی گورگانخواردو ، بوی بەپەرۆش نەبێ. بەتایبەت من بڕیارم دابوو کە لە حیزبی دیموکرات دا بمێنمەوە و خەباتی نیو حیزب و خەبات بۆ ئازادی درێژە پێ بدەم. بڕیارمدا خۆم ڕزگار کەم.ئیزێکەی دورحەوتو پێ چوو دەرگایان کردەوەو چاویان بەستم و بۆخواریێ. لە ژوورێک چاویان کردمەوە، ئەفسەرێک دانیشتبوو، گوتی بیرت لێ کردەوە؟
- شتێکم نیە بیری لێ بکەمەوە.تەنیا بیر لەشێوە دۆستایەتی ئێوە

دەکەمەوە لەگەڵ حیزبی دیموکرات.

- ئیمە دۆستی حیزبی دیموکراتین، خاوەن مەبادیئین، بەلاَم تۆ لەگەڵ ئیمەرا ست نی.لە و قسانەدابووین، ئە بوئە حمد هات.ئە فسەرێکی تریشی لەگەڵبوو.گوتی : ئیمە یەک ئامانجمان هەیە، تۆ بۆ هاوکاری ئیمەت لا گرانە؟

لام گران نیە. پیم سەیرە. حیزبی دیموکرات خۆی هاوکارتانە. منیش ئەندامی حیزبی دیموکراتم دەتوانم هاوکاری بکە م.گوتی هەر بەقسەنابێ باوەڕت پێ ناکەین.

- نازانم، بەچی باوەڕ دەکەن، ئەوەندەیە دەڵێم هاوکاری دەکەم.

- ئەگەر نەتکرد؟

- ئێوە حکومەتن و لە نێو حیزبی دیموکراتیشدا دە ستو دەڕوا و ئیمکاناتیشتان هەیە.

چاوێکی لە ئەفسەرەکان کرد، گوتیان راستە.ئیمە دەتوانین نەیاری خۆمان تەمبێ بکەین.ئە بو ئە حمد پەڕەکاغەزێکی سپی هەڵگرت و لە پێشی دانام گوتی بنووسە کە تعهد دەکەم لەگەڵ حکومەتی عیراق هاوکاری بکەم.قەڵەمێکم وەرگرت و بەفارسی نووسیم :« اینجانب متعهد می شوم کەبا حکومت عراق همکاری نمایم». دای بەئەفسەرێکیان، تەماشای کرد و گوتی بیبەنەوە. چاویان بەستم و بۆ ژووری جاران.

لەم لایەشەوە، خێزانم کە چاوەڕوانە رۆژی پێنجشەمۆ بگەمەوە سۆفیا و ئەوە دە پێنجشەمۆش تێپەڕین و سۆراخم نیە، ئەو تیلگرافەی خوراوە دەنێرێ بۆ مامۆستا مەلا محەمەدی شەلماشی لە سولەیمانی و دەنووسێ کەریم بێ شوێنە:

IRAG- SULEIMANE
JAMIA MAULANA HALID BEN VALID
IMAM MULLA MOHAMMAD GAZAI
I KINDLY REGUEST YOU TO SEND ME NEWS ABOUT MY HUSBAND KARIM HISAMI, BECAUSE HE TELEPHONED ME BEFOTE ONE MONTH THAT HE IS COMING TO BULGARIA AND HE HASNT COM YET.
HADIJA

دەنیرێ بۆ مامۆستا مەلا محمدی شەلماشی لە سولەیمانی و دەنووسێ کەریم بێ شوێنە.مامۆستا ش خەبەر دەنیرێ بۆ حیزبی دیموکرات . بەلام کەس گوێ نادات. تا دوکتور قاسملو دێتە بەغدا، کە بچێتە ئوروپا.وەک دوکتور قاسملو دەیگوت : گۆیا ئەو دەپرسێ کەریم چی لێ هاتوە. ئەوانیش دەلێن سەفەریکردوە.دۆکتور دەلی: کەنگێ سەفەری کردوە، بەچ فرۆکەیەک رۆیشتوە،بلیتی لە کوێ کریوە، هەتا ئەوانەم بۆ روون نەکەنەوە ناڕۆم.

ئێستا پێداگرتنی دوکتور قاسملو یا بەلێنی من و یا هەردووکیان بوون،دوای تیزیکەی ٣مانگان دەرگایان لێ کردمەوەو هێنایانمە دەفتەری زیندان، کە ئێستاش نازانم کوێ بوو. کابرایەکیان هێنا بوو،سەرو ریشم بتاشێ. زۆرم هەولدا کە دەستی لێ نەدا نەیانهێشت. تەماشای ئاوێنەم کرد، ریشێکی سپی ، نورانی، دەستم پێداهێنابوو، قەدی گرتبوو، پتر وەریشی پێغەمبەران دەچوو. کابرا ریشی تاشیم و سەری کورت کردمەوە و خۆم گۆڕی و هەر ئەو کابرای لەگەلم هاتبوە هوتێل و شتومەکی پی کۆ کردبوومەوە، ئەم جارەش هەر تەحویلی ئەو دوو کەسەی دامەوەو بردیانمەوە ئوتێلی جاران، راست ئەو ژوورەی کە لێیگیرابوە.بە دوای مندا

کابرای مەسئولیان پە یدا بوو، گوتی دوکتور قاسملو لیرەیە، با بچینەلای.سواری کردم و گوتی: تکا دەکەم بەدوکتور قاسملو مەلێ کە لە موخابەرات گیرابووم. ئیمە گوتومانە، ئەمن گرتوویەتی و ئیمە نەمانزانیوە.چووینە کن دوکتوری، ئەودەم کاک سەلیمی بابانزادە لە عیراق نوینەری حیزبی دیموکرات بوو. نیزیکەی سەعاتیک دانیشتین. دوکتور گوتی : گوتومە تا نەزانم کەنگێ سەفەری کردوە، ویەچ تەیارەیەک رۆیشتوە، ناڕۆم. توزی باسی شەڕی ئیران و عیراق وگرتنی خورەمشاری کرد و ئیتر باسی شەڕی مەهاباد و کوردستانی نەکرد. گوتی لە پاریسەوەتەلەفونت بۆدەکەم.هاتمەوەهوتێل.کە هاتم هیندێ لە ئەندامانی حیزب ،نەخۆش وبریندار لەوێ بوون. رۆژی دوایێ سەلیم هاتەلام.ئەویش لە چنگ درۆ وفریو وڕانەپەڕاندنی کاروبار زالەی بوو ، بەتایبەت لەوەزۆر توورە بوو کە هەمیشە بۆ هاتنەدەری شەخسیش هەر بەدوایەوە بوون. کە هاتینەوە هوتیل کابرا گوتی: تکایە لە هوتێل دەر مەکەوە. پرسیم بۆچی، دەست بەسەرم؟

نا..العفو..استاذ..بیشەرەفی ... بەلام نەوەک بچیە سەفارەتی سۆڤێت و بەوان بیژی گیرابووم.گریانم بۆ خۆمان هات و پێکەنین بەناقلی ئەو تاوانبارانە. گوتم ئەوەنیە دەچمەوەسۆفیا و سەفارەتی سۆڤێت لە وێ ئازادە. ئەگەر بمەوێ، لە وێ دەچم، خۆ مەعمووری ئیوە لە وێ ناتوانێ ڕەدوام کەوێ. کابرا دەنگی نەکرد.لێم پرسی : کەنگێ دەڕۆم: گوتی : سبەی خەبەرت دەدەمێ.

سبەو دوو سبەش چوو، خەبەر نەبوو.چابوو هیندێ برادەرانی لای بانە لە وێ بوون، زمانیان نەدەزانی، یارمەتی زمان و ڕاپەڕاندای کاروباری ئەوانم دەدا. لەگەڵ دۆست وبرادەرانی کورد هیچ پیوەندیم نەگرت. تەنیا شەوێک چوومە مالی کاک رەحمانی چایچی کە لە بەرگەکانی پێشوودا

پاسی جوامێری و پیاوەتی و برایەتی ئە و پیاوەم کردوە. کە چوومە ژوور و چاویان پێم کەوت، خوشکەشەمیێ دەستی کرد بەگریان و جنێو دان بە مەلارەحمانی زاوایان. بەخۆشیەوە کاکەشێخەی دۆستیشم لە وێ بوو. باسی ریندانم بۆ گێڕانەوە،و لە گەڵ کاک رەحمان دەستمان کرد بەخواردنەوە. شەو درنگ دەهاتمەوە بۆ هوتێل ،سەت دینارم لێ وەرگرتن، چونکە هیچ پارەم پێ نەبوو.کاکە شێخەش هە تا هوتێل لەگەڵم هاتەوە. لە رێگا دوورسەت دیناری هێنا دەر و بەزۆری بەسەریدا بڕیم .لە بەر دەرگای هوتێل خواحافیزیمان لێک کرد و بە ئاواتی دیتنەوەی ئەو دۆست و برادەرە هێژایانە رۆژ دەکەمەوە.

دوای چەند رۆژ کابرا هاتەوە پاسپۆرتەکەی بۆ هێنابوومەوە.پاسپۆرتەکەم پاسی یەمەنی دیموکراتی بوو، وادەی تە واو ببوو.کابرایەکیان لەگەڵ ناردم بۆ سەفارەتی یەمەن. کابرا نەهاتە ژوور، لەو کاتەدا یەمەن و عیراق نێوانیان تێکچوبوو.کابرا لە دوور ماشینی راگرت تا گەرامەوە. گوزج پاسەکەیان درێژ کردەوەو گەرامەوە.کابرا پاسەکەی برد کە مۆری چوونە دەری لێبدا.رۆژی دوایی سەعاتی ٩ کابرایەک پەیدا بوو، گوتی دەتوانی بەتاکسی بچیە ئەردەن.پاسەکەی بۆ هێنابوومەوەو پارەکەیان بۆ کردبووم بەدۆلار و گوتی لەگەرانەوەدا بێرەدا وەرەوە. پارەو پەساپۆرتم وەر گرت و هەر ئەو دەم لای خۆ م شەرتم کرد تا ئە و رێژ مە بەعسیە لە سەر حوکم بێ بەتەیارەش بە سە ر عیراقدا نەڕۆم.

بێ راوەستان چوومەکاراژ. تاکسی داوای ١٦دیناری دەکرد هە تا عەمان. رانەوەستام، هێینامە هوتێل و جانتاومانتام هەڵگرت و کەو تینەرێ. بەسانایی لە سنوری عیراق دەرباز بووم و ئاهێکم هاتەوەبەر، لە سنوری ئەردەن نۆرەم هات کە پاسەکەم دا بەکابرا، گوتی بەدینت تۆ

یەمەنی؟ گوتم پاسەکەم تەواوە. تۆ هەقت نەبێ. گوتی فەلەستینی دوودیناران بدە. گوتم بۆ ولاتانی عەرەبی ڤیزای ناوێ، گوتی : بۆ یەمەنی شیمالی نایەوێ. دوو دینارم دایەو جارێکی دیکە ش وەحدەی عەرەبی و امه العربیه واحده م پتر بۆ روونبۆوە. پێمان پێوەنا بۆ عەمان. سەعاتی ٣ی شەو، لەهوتێلێک دابەزیم.بەیانی چوومە نێو بازار و لە خەتێکی هەوابەری جێگا هەبوو ، بۆ ئاتین و لە وێشەوە بۆ سۆفیا.ئیتر گیر نەبووم، بلیتم کڕی و یەکسەر بۆ فڕۆکەخانە. لە فڕۆکەخانەی ئاتین دووسەعات گیر بووم. تەلەفۆنم کرد بۆ ماڵێ، دیسان شلێر هەڵیگرت. خۆشی بیستنی دەنگی یەکترمان نەلەبیر دەچێ و نەبۆم وەسف دەکرێ.

## جارێکی‌تر لە سۆڤیا

رۆژی ٧/١٢ /١٩٨٠ سەعاتی پێنجی ئێوارێ گەیشتمەوە فڕۆکەخانەی سۆفیە.دایکی کەماڵ و منداڵەکان لە وێ بوون و بەدیتنیان رۆژەکانی زیندانم لە بیر بردەوە. بەلام هەڵوێستی جنایەتکارانی حکومەتی عیراقم هەر گیز لە بیر ناچێتەوە.

رۆژی ١٥/١٢/١٩٨٠ چوومە خەستەخانەو حەوتوویەک لە نەخۆشخانەبووم و لووتیان عەمەل کردم.رۆژی ٢٢/ ١٢/ هاتمەوە ماڵێ و چاوەروانی هاتنی ساڵی تازەبووین بزانین چیمان بەدیاری بۆ دێنێ. بێ خەبەری لە ولات نیگەرانی کردم. لە پڕنامەیەکی (بەر پرسی رێکخراوی ژنانی کوردستان)م بۆهات، کە ئەندامی کومیتەی شارستانی مەهاباد بوو. نامەکە لەکاتی شەڕی مەهاباد دا نووسرابوو. چووبووەکوێ و چۆن گەیشتبووەسۆفیا سەیر بوو. خوشکەمەستانە نووسیبووی :«١٧رۆژە تۆ

رۆیشتووی. مەهاباد لە ئاگرو ئاسندا دەسووتێ. ١٥ڕۆژ بەتۆپ و خومپارەو بۆمبا لە عەرز و لە حەواوە لێیانداوە.خەڵکێکی زۆر کوژراوە.قەرار نەبوو هێندەت پێ بچێ.هەتا پێت دەگرێ زوو وەرەوە.برادەران چاوەڕوانتن.» هێندێکیشی بە ئینگلیزی نووسیبوو،باشی تێنەگەیشتم.ئە و نامە یـ ـ ـ ـ ـ . ری بۆمباران و کوشتاری مەهابادی هێنابوو، نیشانی دەدا هەر دوای من شار تووشی شەڕ کراوە و خەڵکێکی ز.. ..اوان سەری تێدا چوە . سەری ساڵمان لە هەوایەکی خۆماڵی ولە بارو دۆخێکی پڕ خەم و پەژارەی وڵات وکوشتاری خەڵکی بێ تاوان دا رابوارد.چونکە هەر بەدوای نامەی بەرپرسی‌تەشکیلاتی ژناندا بەیاننامەیەکی دەفتەری سیاسی حیزبی دیموکراتی کوردستانم پێگەیشت کە جنایەتی سامداری لەشکر وپاسدارانی ئیسلامی لە کوردستان نیشاندەدا. لە بەیاننامەی دەفتەری سیاسیدا بە تاریخی ٥٩/٨/٢(١١/١١/ ٩٨)گوترابوو:« کۆنە پەرستی ڕەشی زاڵ بەسەر نیشتمانی خۆشە ویستدا جارێکی دیکەش بیچمی دزێو وبێزراوی خۆی نیشاندا. دوای جنایەتی کوشتاری خەڵکی قارنێ. ڕۆژی ١٣ی خەزەڵوەر لەگوندەکانی (ئیندرقاش و وسوکەند) ٥٣ کەسیان کوشتوە کە منداڵی چوار مانگەشیان لەگەڵبوە. لە بەیاننامەکەدا گوترابوو « ئەم جنایەتە نەتیجەی راستەو خۆی تەبلیقاتی ژاراوی رادیۆ تەلەڤیزیۆن و بەرێوە بەرانی کۆماری ئـ ـلامـ ، کە ئـ ـاڵ کـ ـ کوردستان بە کا فر وبە دوژمنی ئیسلام دەناسێنن. بە یاننامەکە داوای لە حیزب و ڕێکخراوە ئازادیخوازەکانی دنیا کردبوو کە دەنگی بێزاری خۆیان دژی ئەو جنایەتە بەرزکەنەوە . پاشان لە پاشکۆی بەیاننامەکەدا ناوی کوژراوەکانی گوندەکانی ئیندرقاش و وسو کەند وسۆفیان و کولیچ و سەروکانی بڵاو کرا بۆوە.» .ڕۆژی ١٩٨١/١/١٦ دوکتور قاسملو لە پاریسەوە

تەلەفونی کرد و دوای ئەحوالپرسی و چاکو خۆشی گو تی : « تکایە بچۆ بالیۆزخانەی سۆڤیتی و داوا بکە، بەڵکو هەتا لە ئورووپام ، بتوانم بچمە موسکو وقسەیان لەگەڵ بکەم. رۆژی ٩٨١/١/١٨ چوومە باڵیۆزخانەی سۆڤیت، چاوم بە سکرتێری یێکەم کەوت. بەبۆنەی ٣٥ساڵەی دامەزرانی کۆماری کوردستان بەیاننامەیەکم نووسیبوو، کرابوو بەرووسی. بەیاننیامەکەم دایەو داوای دوکتور قاسملوم پێ راگەیاند. پێمگوت لەکوردستانەوە هاتین شا ان نیە داوامان ئەوەیە، هەتا سکرتێری حیزب لە دەرەوەیە، سەفەرێکی موسکو بکا.کابرا گوتی :«داواکەتان بەموسکو رادەگەبێنم و خەبەرت لێ دەگێڕمەوە. »

رۆژی ٩٨١/١/٢٢ خوێندکارەکوردەکانی لەسۆفیا دە یانخوێند، ویستیان بەبۆنەی ساڵرۆژی دامەزرانی کۆماری کوردستان ئاهەنگ بگێڕن.پۆلیسی بولغارستان رێگای نەدا.رۆژی دوایی نامەیەکم بۆ کومیتەی ناوەندی حیزبی کومونیست نووسی و لەم سیاسەتەچەپەڵە بەتوندی رەخنەم گرت.رۆژی ٩٨١/٢/٢ خوێندکارە کوردەکانی دانیشتووی پلۆڤدیڤ داوەتیان کردم کە میوانیان بم و لە سەر بارودۆخی کوردستان ئاگاداریان بکەم.لەگەڵ ئەو برادەرانە، شەوێکی خۆشمان رابوارد. لەوێ برادەرانی سەر بە پارتی دیموکراتی کوردستانی عیراق بەیاننامەیەکی (کۆمەڵەی خوێندکارانی کورد لە ئورووپا )یان دامێ، کە خوێندمەوە :ا ی لەو هەموو ئاخافتن و ئیدعا و فریودانە لەمەڕ کوردایەتی و مەسەلەی کورد سەرم سوڕما. چونکە ئەو دەم کە برایانی پارتی بە ناوی کۆمەڵەی خوێندکارانی کورد ئەم بەیاننامەیان نووسیبوو لە کوردستانی ئێران ٣٦ گوند لە لایەن حکومەتی ئیسلامی ئێرانەوە بۆمباران کرابوون و کوشتاریان تێدا کرابوو. بەلام ( کۆمەڵەی خوێندکارانی کورد )یەک وشەی لە سەر ئەم جینایەتەی حکومەتی

کۆماری ئیسلامی نەنووسیبوو. ناچار ئەم نامەی خوارەوەم بۆ بەڕێوەبەرایەتی کۆمەڵەی خوێندکارانی کورد لە ئورووپا نووسی:

«الهیئه الاداریه العامه

برایانی بەڕێوەبەرایەتی کۆمەڵەی خوێندکارانی کورد لە ئورووپا. سلاوێکی برایانە، هیوادارم لە تێکۆشان و خزمەت بە نەتەوەکەماندا سەرکەوتوو بن.

بە هەڵکەوت لە پلوفدیف چاوم بە بەیاننامەیەک کەوت کە تشرینی یەکەمی ١٩٨٠ لە لایەن دەستەی بەڕێوەبەرایەتی گشتی (کۆمەڵەی خوێندکارانی کورد لە ئورووپا) لەسەر پەلامار حکومەتی عیراق بۆ سەر ئێران بلاو کراوەتەوە. لەگەڵ مەتن و ناوەرۆکی بەیاننامەکە بە تەواوی موافیقم و پڕ بە پێستی‌یەتی. بەلام ناچارم بیروڕای چەند ساڵ لە مەو پێشی خۆم دووپات کەمەوە کە حەق نیە ناوی کۆمەڵەی خوێندکارانی کورد لە خۆتان بنێن. چونکە کە گوتمان: کۆمەڵەی خوێندکارانی کورد، یانی هەموو کوردستان. حەق وایە رێکخراوێکی ئەم ناوە لە خۆی دەنێ، لە سەر هەموو مەسەلەیەکی کوردستان وەدەنگ بێ.

بەیاننامەکەی ئێوەو نووسراوەی دیکەشتان ئەم واقعیەتە دەردەخا کە ئێوە کۆمەڵەی خوێندکارانی کوردی عیراق سەر بە پارتی دیموکراتی کوردستانی عیراقن و بەس. بە ناو لە خۆنان نە کەس گەورە دەبێ و نە سیاسەتیش دەچێتە پێش. واقعیەت زۆر سەر رەقە هیچ نەبێ لە نێو دێری نووسراوەکاندا خۆ دەنوێنێ. ئێستا ئەو پرسیارە دێتە پێش، دەکرێ رێکخراوێکی خۆی بە نوێنەری (خوێندکارانی کورد لە ئورووپا) بزانێ، کە باسی شەڕی عیراق و ئێران دەکا لە ئاست کوشتاری کوردەکانی ئێران، لە ئاست بۆمبارانی شارو دیهاتی کوردستانی ئێران لە لایەن حکومەتی ئێرانەوە بێدەنگ بێ و خۆ مات بکا؟

برایانی بەرێز من نالێم ئێوە بە گۆ حکومەتی خومەینی‌دا بچن. دەزانم وەزعی ئێوە بۆیە نابێ. ئێمە هەمیشە ئەوەمان لە بەر چاو گرتوە. بەڵام ناتوانم رەخنەی خۆم لەم هەڵوێستەی ئێوە دەر نەبرم. ئەگەر ئێوە ناوی واقعی خۆتان (کۆمەڵەی خوێندکارانی کوردی عیراق سەر بە پارتی)تان نووسیبایە، جێگای رەخنەو گلەیی نەبوو. بەڵام ئەم ناوەی ئێوە لە خۆتان ناوەو لەبەرانبەر کوشتارو وێرانی بەشێکی کوردستان خۆ مات دەکەن لەگەڵ واقعیەت یەک ناگرێتەوە.

برایانی خۆشەویست لەو مانگەدا کە ئێوە ئەو بەیانەتان بڵاو کردۆتەوە ٤٨ گوندی ناوچەی مەهابادو لاجان و شنۆ لە لایەن هێزی هەوایی حکومەتی ئیسلامیەوە بۆمباران کراوە. شاری مەهاباد بە تۆپ و خومپارەو راکێت وێران بوە. پتر لە ٣٠٠ کەس تەنیا لە مەهاباد کوژراوە. لە گوندی ئیندرقاش ٥٢کەسیان لە مزگەوت قەلاچۆ کردوە. ئێوەش وەک گۆیا (نوێنەری خوێندکارانی کورد) لەسەر شەری عیراق و ئێران و پەلاماری عیراق بەیان دەردەکەن، جێگای خۆیەتی و کارێکی باشە. بەڵام ناکرێ ئەو بێدەنگیەتان لە ئاست جینایەتی حکومەتی ئیسلامی ئێران بە هەڵوێستێکی کوردانەو نیشتمانی حیساب بکرێ. لەگەڵ سلاو براتان کەریمی حیسامی ١٩٨١/٢/١٠»

رۆژی ١٩٨١/٢/٣ لە باڵیۆزخانەی سۆڤێتەوە تەلەفونیان کرد گوتیان ١٩٨١/٢/٢٠ موسکو وەڵامی ویستەکانتان دەداتەوە.تەلەفونم کرد بۆ دوکتور قاسملو، پێمگوت : دەبی تا بیستی مانگ چاوەروان بین.رۆژی ٢٠ی فیوریە لە سەفارەتی سۆڤێت داوایانکرد کە بچمەوێندەرێ.کابرا هات و دوای هێندێ شیر وڕێوی گوتی: «موسکو لای وایە رێبەرایەتی حیزبی دیموکرات تازەیە و بۆ ئەوان نەناسراوە. بەباشی لە سیاسەتی دوکتور قاسملو تێناگەن. لە سەر ئەو باوەرەن ما وەیەکی تر چاوەروان

بن. هاتنی ئێستای دوکتور قاسملو رەنگە ئاگامێکی نەبێ.»

ڕۆژی ٩٨١/٢/٢٣ وەڵامی قوڕی کابرام بە دوکتوری گوت و بەدرێژیش نامەم بۆ نووسی. ٩٨١/٣/١ کاک عەزیزی مامڵێ ڕۆژنامەی کوردستانی بۆنارد بووم ودەنگو باسی شەڕی بۆ نووسیبووم.ڕۆژنامەی کوردستان، لەم کاتە دژوارەدا شیعری «تۆ زەردی» مامۆستا گۆرانی چاپکرد بوو. نامەیەکی رەخنەم بۆ نووسەرانی کوردستان نووسی و لە وەڵامی نامەی کاک عەزیزی مامڵێ دا ڕەخنەم لە لاوازی تەشکیلاتی حیزب لە ئورووپا گرت.

لە سەروبەندی نەورۆزی ١٩٨١دا ئەحمەد شەریف برادەرێکی کوردی لوبنان هەڤاڵدەری گۆڤاری (ڕۆژهەڵات) هاتبوە سۆڤیا. داوای کرد لە سەر بارو دۆخی کوردستان وتو وێژێکم لەگەڵ بکا. هێندی پرسیاری ئامادە کردبوون. پاشان وەلامەکانی منیان کردبوو بە عەرەبی و درنگتر لە ژمارەی ٥٥ی گۆڤاری ( ڕۆژهەڵات ) دا بە زمانی عەرەبی بلاویان کردبوە. ئەمەش دەقی پرسیارو وەلامەکانن :

«پ- وەزعی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران لە ئێستادا چۆن هەڵ دەسەنگێنی، بە تایبەت دوای ناکۆکی نێو حیزب لە ئەنجامی پیلان گێران دژی شۆرشی کورد بە ڕێبەرایەتی حیزبەکەتان. ئایا ئەم ناکۆکیە تەئسیری نالەباری خستۆتە سەر ڕێبازی شۆرشگێری حیزبتان؟

و- ئەگەر بڵێم کەم حیزبی وا هەبووە لەم ساڵانەی دواییدا وەک حیزبی دیموکراتی کوردستان ئێران لە لایەن خەڵکەوە پشتیوانی لێ کرابێ لە حەقیقەت دوور نەکەوتووم. ناکۆکی و ناتەبایییەکی لە نێو ح.د.ک دا پەیدا بووە ئیختیلافێکی مەبدەعی و بیروباوەری نیە. ئەو برادەرانەی لە حیزب جیا بوونەوە لە بەیاننامەی خۆیاندا شتێکی ئەوتۆیان نەگوتوە کە لەگەڵ بەرنامەو پرۆگرام و تەنانەت سیاسەتی ح.د.ک جیاوازی هەبێ.

غەنی بلوریان وەک ئەندامی مەکتەبی سیاسی تا ئەو دەم کە جیا بۆتەوە دژی سیاسەتی حیزب نەبووە. کاتێک وەک سەرۆکی دەستەی نوێنەرایەتی ح.د.ک بۆ وتو وێژ لەگەڵ ڕێبەرانی کۆماری ئیسلامی چووبوە تاران، لەگەڕانەوەدا هیوای زۆر بە چارەسەر کردنی مەسەلەی کورد هەبوو. ئەو دەستەی نوێنەرایەتیە هیچ پێشنیارێکی ئەوتۆی نەکردبوو کە کومیتەی ناوەندی دژی بوەستێ.

بە نەزەری من کاک غەنی ئەگەر ناکۆکی بیروباوەڕی هەبایە، دەبوایە لە کۆنگرەی چوارەم بیرورای خۆی دەربڕیبایە. هەر وەک برادەری دیکە هەبوون کە لەسەر هێندێ مەسائیلی فیکری و سیاسی نەزەری خۆیان ڕادەگەیاند. بەڕاشکاوی دەتوانم بڵێم کە ئەو حەوت کەسە بە هەڵە چوون کە لەو کاتە ناسکەو لەم قۆناخەدا کە جولانەوەی ڕزگاریخوازی کوردی پێدا تێدەپەڕێ ڕیزی ح.د.ک ئێرانیان بەجێ هێشت. حیزبێک کە مامە غەنی ٣٥سالی ژیانی خۆی لە پێناوی سەرکەوتنی ئەو حیزبەدا لە زیندان و کوێرەوەریدا بردە سەر.

بۆ دەڵێم ئەو برادەرانە بە هەڵە چوون؟ چونکە بەلای منەوە هەر جورە جیابوونەوەو لەت کردنی ڕیزی ح.د.ک ا. لەم قوناخەدا بە زیانی بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی گەلی کوردە کە بێجگە لە وەدەست هێنانی مافی ڕەوای نەتەوایەتی هیچی دیکەی داوا نەکردوە.

لەباری تەئسیری سەلبیەوە. ناتوانم بلێم جیابوونەوەی ئەو چەند کەسە بێ تەئسیر بووە. بەلاْم لە سەر ڕێبازی بزوتنەوەی شۆڕشگێری گەلی کورد تەئسیرێکی بەرچاوی نەبووە. ئێستا ڕەنگە بۆ ئەوانیش روون بووبێتەوە کە ح.د.ک.ا ئەوەندەی نفوزو ئیحترام لە نێو خەڵکدا هەیە کە جیا بوونەوەی ئەوان نە حیزبی دیموکرات و جولانەوەی کوردی بێ هێز کرد، نە توانی مەسەلەی کوردیش وەک ئەوان دەڵێن چارەسەر بکا.

دیارە بۆ من زۆر جێگای داخە کە ئەو کەسانەی بیروباوەری پێشکەوتنخوازیان هەبێ لە هەڵ و مەرجی ئەمرۆی جولانەوەی رزگاریخوازی دژی ئیمپریالیستیدا ریزی ح.د.ک بە جێ بێلن و مەیدانی خەبات چۆل بکەن. خۆ ئەگەر ئەو برادەرانە ناکۆکی بیروباوەریشیان هەبایە، دەکرا لە چوارچێوەی حیزبیدا بۆ راستکردنەوەی هەڵەو چەوتی رێبەرایەتی حیزب خەبات بکەن. ناکۆکی بیروباوەر تەنیا لە نێو ح.د.کدا نەبووە حیزبی دیکەش تەماشا بکەین لە وانەیە لە نێو رێبەرایەتیدا لە سەر زۆر مەسەلە ئیختیلاف هەبێ، بەلام ئەو کەسانەی لەگەڵ پەیدا بوونی ئیختیلاف ریزی حیزب و مەیدانی خەبات چۆل دەکەن، لام وایە ناتوانن خزمەت بە جولانەوەی نیشتمانی و رزگاری نەتەوەکەیان بکەن، جا با ناوی ئەو حیزبەش لە خۆیان بنێن.

پ- را دەردەکەوێ شەری ئێران و عیراق کە ئێستا ناوچەی کوردستانیشی گرتۆتەوە ئامانجی سەرەکی لە بەین بردنی گەلی کوردە کە لە عیراق و ئێران داوای مافی رەوای نەتەوایەتی دەکا، بێجگە لە ئامانجەکانی‌تر کە دەستگای ئیمپریالیستی نەخشەی بۆ کێشاوە. داخوا لەم بیرورایەدا لەگەڵ ئێمەی؟ رای تۆ لەم بارەدا چی‌یە؟

و- شەری نێوانی ئێران و عیراق هەر وەک هێزە پێشکەوتنخوازەکانی ناوچە رایان گەیاندوە، شەرێکی داسەپاوە کە ئیمپریالیزمی ئەمریکا دەستی تێدایەو بێجگە لە ئیمپریالیزم و کۆنە پەرستی کەسی‌تر کەلکی لێ وەر ناگرێ. شەرێکە بە زیانی گەلانی ئێران و عیراق، زیانێکی زۆری مادی و بەشەری لە هەر تک ولات داوە. بە پێچەوانەی تەبلیغاتی حکومەتی عیراق ئەو شەرەی ئەو هەڵیگیرساندوە نەک هەر بە قازانجی گەلانی عەرەب و بۆ پارێزگاری رۆژهەلاتی عەرەبی نیە، بەڵکو بە قازانجی ئیمپریالیزم و سەهیونیزم و کۆنەپەرستی عەرەبە. ئەگەر مەبەست

شط العرب و کێشەی سنورە لەگەڵ ئێران وەک کاربەدەستانی حکومەتی عیراق ئیدیعا دەکەن، ئەدی بۆچی لە سەر حیسابی لەژێر پێنانی مافی ڕەوای گەلی کورد لە عیراق هەر ئەو حکومەتە لەگەڵ شای ژاندارمی ئەمریکا ڕێک کەوت و وازی لەم مافە هێنا. کەوا بوو ئەم شەڕە ئامانج و مەبەستی تری هەیەو ئیمپریالیزم نەخشەی بۆ کێشاوە. لێدان و لە بەین بردنی شۆڕشی دژی ئیمپریالیستی ئێران و گێرانەوەی ئێران بۆ ژێر ڕکێفی ئیمپریالیزم و هاوکاری لەگەڵ سەهیۆنیزم و کۆنەپەرستی عەرەبی گرنگ‌ترین ئامانجی نەخشەی ئیمپریالیستی‌یە.

بەڵام لە بارەی لە بەین بردنی نەتەوەی کورد، شتێکی ئاشکرایە شۆڤێنیزمی حاکم لە عێراق و ئێران جوڵانەوەی ڕزگاریخوازی کورد بە دوژمنی خۆ دەزانن و بۆ لێدان و لە بەین بردنی بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی و دژی ئیمپریالیستی کورد، نەک هەر لەگەڵ ئیپریالیزم بەڵکو لەگەڵ شەیتانیش ڕێک دەکەون. گەلی کورد تەجروبەی تاڵ و واقعی بەدەستەوەیە. لە پێش ڕێک کەوتنی سەدام- شا لە ئەلجەزایر، دوژمنایەتی ئێران و عیراق گەیشتبوە ئەو پەڕی خۆی. شای ئێران شط العربی داگیر کردبوو. بەڵام بۆ ئەوەی شۆڕشی کورد کە چقڵی چاوی کۆنەپەرستی ئەم وڵاتانە بوو لە ناوی بەرن ئەو شەڕە جنێوو دوژمنایەتیان لە بیر خۆ بردەوە و(قائدی عەرەب و عەمیلی ئیمپریالیزم) یەکتریان لە ئامێز گرت و ڕۆژهەڵاتی نیشتمانی عەرەبیش مەترسی لە سەر لاچوو. ئێستاش ئەو فیکرەی شوڤێنیستی و ئەو سیاسەتەی دژی کوری لە هیچ لایەکەوە نەگۆڕاوە. ئیسلامی (دژی ئیمپریالیزم) لە ئێران لە کاتێکدا لەگەڵ عیراق لەشەڕ دایەو خاکی ئێرانی ئیسلامی لێ‌داگیر کراوە، دوازدە فیرقە لەشکری ناردۆتە کوردستان و دژی گەلی کورد شەڕ دەکا. بێجگە لە پاسدارانی بەناو ئیسلام و بەسیجی مستضعفین و بەکرێ گیراوانی

دیکە کە (دیریاسینیان) لە کوردستان ساز کردوە. ئاغای بەنی سەدر سەر کۆماری ئیسلامی ئێران لە وتارێکی خۆیدا دەنووسێ: «ئەگەر لەشکری ئێران لە کوردستان لەگەڵ کوردەکان شەری نەکردبایە لەشکری عیراق نەیدەتوانی بێتە خاکی ئێرانەوە».

لەسەر ئەو حاڵەشەوە کەحیزبی دیموکراتی کوردستان راپگەیاندوە کە ئەگەر حکومەتی ئێران پێشنیاری شەش مادەیی ح.د.ک.ا. قبوڵ بکا،چەکدارەکانی کورد شان بەشانی لەشکری کۆماری ئیسلامی ئێران بۆ پاراستنی سنورەکانی ئێران دژی پەلاماردەر شەردەکەن، بەلام بەلای رێبەرە موسلمانەکانی کۆماری ئیسلامی ئێرانەوە داگیر کردنی خاکی ئێران لە لایەن عیراقەوە و بەکوشتدانی خەلکێکی زۆری بێتاوان ووێرانبوونی بنکەئابووری و سەنعەتیەکان، باشترە لەوەی تامافی رەوای گەلی کورد بسەلمێنن ورێگا بدەن گەلی کورد لەچوار چێوەی کۆماری ئیسلامی ئێراندا کاروباری نێو خۆی بەرێوە بەرێ.

ئەوەی ئەورۆ پاسداری بەناو ئیسلامی و لەشکری ئێران لەکوردستان دەیکەن، مەگەر ئیسرائیل لە لوبنان و فەلەستین کردبیان. ئەوە وەزعی ئێرانە. بەلام کوردستانی عیراقیش لەوە باشتر نیە.ئەو حکومەتەی ئیدیعا دەکا گۆیا یارمەتی کوردەکانی ئێران دەدا، ئامانج و جەوهەری سیاسەتەکەی لە سیاسەتی شاو رژێمی ئیستا لە ئاست کوردەکان باشتر نیە.بێجگە لە وێرانکردنی کوردستان و ئاوارەکردنی کورد وگواستنەوەیان بۆ جنوب وچۆلکردنی هێندێ ناوچەی کوردستان، گۆرستانی بەناو(مجرمینی)بۆ کوردەکان ساز کردوە.وەختە ئەو ئازادیخوازانەی کورد کە هەموو رۆژێ لە موسل و شارەکانی تر ئیعدام دەکرێن هەر جێشیان لەگۆرستان نەبێتەوە.جا کە وابوو ئەگەر ئامانجی سەرەکی ئەو شەرە، لە بەینبردنی گەلی کوردیش نەبێ،هەر تک حکومەتی لە حاڵی شەردا

لێدانی جوڵانەوەی رزگاریخوازی کورد.بە بەشێک لە سیاسەتی چەپەڵی خۆیان دادەنێن.

بەپێوەندی لەگەڵ شەری ئێران وعێراقدا بۆ جێ نابێ ئەوەش بیرخەمەوە کە لە وەتا عێراق شەری ساز کردوە، هێزە دیموکراتەکانی ئێران و عێراق، کوردستانی و غەیرە کوردستانی لە سەر ئەو شەرە نووسیویانەو بیرورایان دەربریوە، بەهەق پەلاماردەریان مەحکوم کرد وە، بەلاّم بە ناهەق لە ئاست ئەو هەموو جنایەت و تاوانی پاسدار و لەشکری ئێران، لە ئاست بۆمبارانی شاروديهاتی کوردستان بێدەنگبوون و خۆیان ماتکردوە.

پ : پێوەندی نێوان حیزبی ئێوە و هێزەکوردیەکانی تر لەکوردستانی ئێران چۆنە؟ هەروەها لەگەڵ ئەو کوردانەی لەگەڵ رێژیمی ئێران و عێراقدان؟.

و: پێوەندی حیزبی ئێمە لەگەڵ هێزەکوردیەکانی کوردستانی ئێران پێوەندیەکی دۆستانەیە. ئەورۆ هەموو هێزە پێشکەوتوە کانی کوردستانی ئێران و هەموو گەلی کورد لەکوردستانی ئێران کەوتۆتە بەر پەلاماری بێرەحمانەی لەشکری ئیسلام.کە وابوو سەرەرای هێندێ ئیختیلافی سیاسی، هێزەسیاسیەکانی کوردستانی ئێران بۆ دیفاع لە مانەوەی خۆیان و چارەسەر کردنی مەسەلەی کورد دەبێ یەک بگرن و تا رادەیەکی زۆریش لەم بوارەدا سەرکەوتوون

پ- پێوەندی خەباتی نێوان حیزبی ئێوەو هێزەکوردیەکانی‌تر لە کوردستان بە گشتی گەیوەتە چ رادەیەک؟

و :هەر چەند پێوەندی حیزبی ئێمە لەگەڵ حیزب و هێزە کوردستانیەکان هەمیشە دۆستانە بوە، بەلاّم بەداخەوە ناتوانم بڵێم ئەو پێوەندیە گەیوەتە ئەم رادەیە کە شایانی نەتەوەیەکی ژێر دەست ودابەشکراو بێ.نەگەیوەتە

ئەم رادەیە کە شایانی ئەو حیزب و هێزەسیاسیانەبێ کە خۆیان بەرێبەر و رێنوێنی نەتەوەیەکی چەوساوەو بەشخوراو دەزانن.کاتێک باسی پێوەندی هێزەکوردستانیەکان دەکەین،بەنەزەری من پێش هەموو شت دەبێ بەرژەوەندی گشتی گەلی کورد لە هەموو بەشەکانی کوردستان لە بەر چاو بگرین.حیزبە کوردستانیەکان سەرەڕای ئەوە کە زۆر باسی مارکسیزم دەکەن، بەلاّم هەموویان حیزبی دێموکراتی و قەومی شۆڕشگێڕن، هیچیان حیزبی چینایەتی نین، نەتەوەکەیان لە هەموو بەشەکانی کوردستان لە ئاخری سەدەی بیستەمدا لە هەموو مافێکی نەتەوایەتی بێبەشە.سیاسەتی تواندنەوەی نەتەوەی کورد لە لایەن حکومەتە شۆڤێنیستەکانەوە بەرێوە دەچێ.جابەم حاڵە ئەم شێوە پێوەندیە ی نێوان حیزبەکوردستانیەکان لامرایە پێوە ندیەکی ئاساییەو هیچیتر.پێوەندی حیزبەکوردستانیەکان لەگەڵ یەکتر وهەروەها لەگەڵ حیزب و هێزە پێشکەوتوەکانی ئەم ولاّتانە کە کوردستانیان بەسەردا دابەشکراوە، پێویستە لە سەر ئەساسیخەباتی دژی ئیمپریالیستی ووەدەستهێنانی مافی رەوای نەتەوایەتی میللەتی کورد بێ و لە شێوە پێوەندی ئێستا بێتەدەرێ. پێویستە مەسەلەی کورد وەک مەسەلەی یەک نەتەوەی بیست میلیۆنی بەشخوراو باسبکەن و رێگای چارەی بۆ بدۆزنەوە.

پ :لەو دواییەدا سەرهەنگ معمرقذافی سەبارەت بەمافی گەلی کورد بۆ دامەزرانی دەوڵتی سەربەخۆی کورد هەڵوێستێکی ئازایانەی دەوبریوە.لەم بارەوە بیروڕات چیە؟

و:هەڵوێستی سەرۆک قەدافی لە بارەی مەسەلەی کورد ناتوانێ جێگای سوپاسی هەموو کوردێک نەبێ.لە مێژووی نەتەوەی عەرەبدا سەرۆک قەدافی هەوەڵین سەرکۆماروەسەلاّتداری عەرەبەکەوا بەراشکاوی دان بە مافی تەواوی نەتەوایەتی گەلی کورد دادەنێ و داوای دامەزرانی دەوڵەتی

سەربەخۆی نەتەوەی کورد دەکا لەکوردستان.ئەوانەی بەناوی عەرەبچیەتی یا ئیسلام بزووتنەوەی گەلی کورد سەرکوت دەکەن و مافی نەتەوایەتی کورد لە ژێر پێ دەنێن و خۆشیان بەدژی ئیمپریالیزم دەزانن،باشە پیرەوی لە هەلوێست و قسەشۆرشگێریەکانی سەرۆک قەدافی بکەن.چونکە هەروەک سەرۆک قەدافی دەلێ:«بە کوشتار و بەشەر مەسەلەی کورد چارە سەر ناکرێ» . خەباتی گەلی کورد تاسەرکەوتنی تەواو درێژەی هەیە. .گەلی کورد لە کوردستانی ئێران لەم کاتەدا کە سوپاسی هەلوێستی پیاوانەی سەرۆک قەدافی دەکا، هەر لەو کاتەشدا چاوەروانە کە نفوز و دەسەلاتی خۆی بزراوە ستاندنی شەر و کوشتار لە کوردستانی ئیران بەکار بێنێ.

پ: ئێوە ئێستا بە پێشوازی جێژنی نەوروز، جێژنی گەلی کو ردەوە دەچن. هیچ وتەیەکت هە یە بە بۆنەی نەوروزی پیرۆزەوە بۆ گەلی کورد وهێزە پێشکەوتوخوازەکانی وپێشمەرگە ی فارەمان کە رۆژ بەرۆژ لە سەر خاکی کوردستان پاڵە وانە تی دەنوێنن.؟

و: بەخۆشیەوە حیزب و رێکخراو ورێبەری کور ئەوەندە زۆرن و پەیامی نەوروز دەنێرن، هەرچی من بیلێم زیاد یە. کوردستانی ئیران ئەوە سێ نەوروزە لە نێو خوێن و ئاگردا جێژن دەگرێ.لە نەوروزی کوردستانی ئیراندا (هەر خوێنی شەهیدە رەنگی شەبەق شەوق ئەداتەوە).

گەلی کورد لە کوردستانی ئیران لە کاتێکدا جێژنی نەوروز دەگرێ کە زۆربەی شارودێهاتی وەبەر بۆمباران کەوتوە.کەم ماڵ هە یە شەهیدی نەدابێ، وئاوارەو دەربەدەر نەبووبێ. بەلام خەبات نەوەستاوە، بۆنی خوێن خەلکی نەگرتوە، کورد لەسەر ئەستاندنی مافی نەتەوایەتی بەردەوامە.

بەوبۆنەوە لە پێشمەرگە فارەمانەکان کە پارێزەری بوون وشەرەف و کەرامەتی میللەتەکەیانن پیرۆز بایی دەکەم.

سلاو وپیرۆز بایی لەو دایکو بابانە دەکەم کە رۆلە خۆشەویستەکانیان فیدای ئازادی گەل و نیشتمان کردوە.پیرۆز بایێ لە هەموو حیزب و رێکخراوە کوردیەکان دەکەم.هیوا دارم نەورۆز بکەنە رەمزی یەکێتی خەبات و تێکۆشان و مەسەلەی رزگاری گەلی کورد وەک یەک نەتەوە بکەنە بنچینەی سیاسەتی ستراتیژی خۆیان و بەهەموو تواناوە دژی ئیمپریالیزم و کۆنە پەرستی و بۆ دیاریکردنی مافی چارەنووسی نەتەوەی کورد بەدەستی خۆی تێبک

.٢/٣/١٩٨١خوێندکارەکوردەکانی سۆفیا ویستیان نەورۆز بکەن. پۆلیس رێگای نەدا لە نێو شار نەورۆز بکەین. ناچار .٦ـ.٧ کەس بە ئوتوبوس چووینە(بۆرۆڤیچ) شوێنێکی توریستی، هوتێل و رەستوران و یاسەفا. شەو ورۆژێکی فرە خۆشمان رابوارد.

رۆژی ٤/٥/١٩٨١ چوومەبرلین. برادەرانی کوردستانی تورکیا بۆ کۆبوونەوەیەک بانگیان کردم کە خەریکبوون دژی حکومەتی تورک خۆ پیشاردان ساز بکەن. نوێنەری ١٤ رێکخراوی کوردی بەشداریان کردبوو، بەداخەوە رێک نەکەوتن. لە بیرلینەوە لەگەڵ کاک عەزیزی مامڵێ قسەم کرد ، گوتی دەفتەری سیاسی خەبەری داوە کە بگەرێیەوە.گوتم لێرە کارم نەماوە ، ئامادەم بگەرێمەوە. بەلام بۆ گەرانەوە ، پارەم پێویستە.کاک عەزیز هەر لەوێ بەتەلەفون بەحوسێنی شیلازەری گوت: چوار هەزار مارکم بداتێ، ئەو بۆی دەنێرێتەوە.حوسێن گوتی باشە، من ئەو پارەیەت دەدەمێ، بەلام تۆ دەبێ هەشتا مارک بدەی بەمن.

- بۆ چی هەشتا مار کت بدەمێ؟

- چونکە تا کاک عەزیز ئەو پارەیەم بۆ دەنێرێتەوە، لە بانگ سوتی دێتە سەر.!!

ئاگرم گرت. هەرچی بە سەر زارم دا هات پێم گوت . وام لێکرد گوتی

تۆیە، سبەی پارەکە وەر دەگرم، بۆت دینم. سبە ی چوومەسەردانی برادەرێکی سنەیی بەناوی پە رویز و چاوەروانیبووم حوسێن پارەم بۆ بینێ.لە پڕ تەلەفونی کرد ،گوتی: کاک کەریم بانک تەنیا ٣ هەزار مارکی دامێ. گوتم درز دەکەی بۆم بێنە و گیر مەبە. پارەکەم وەرگرت و گەرامەوە بۆسۆفیا و ئیتر حوسێنیشم قەت نەدیتەوە . ئیوارەی ٩٨١/٥/١٣ کاک کەریم ئوتروشی لە سۆفیاوە تەلەفونی کرد و گوتی :«دوکتور محمد سالح جومعە لێرە یە، دەیەوێ بێتەلات » گوتم :فەرموو، بەخێر بێن . ئەو شەوە دوکتور محمدکەریم شکاکی ش میوانم بوو.سەعاتی ٩ی شەو دوکتور محمد سالح جومعەو کاک کەریم ئوتروشی پەیدا بوون.دوای بەخێر هێنان وچاخواردنەوە، دوکتور محمد سالح دەستی پێکرد و گوتی : «لە لایەن رێبەرایەتی پارتی یەوە هاتووم کە واز لە قاسملو بێنی و بێیەوە لای ئێمە.ئێستا غەنی بلوریان وبرادەرانی لای ئێمەن. ئێوە پێکەوە دەتوانن حیزبی دیموکرات نەجات بدەن.قاسملو دوا رۆژی نەماوە.»

لەرادەبەدەر بەقسەکانی تێکچووم .گوتم‌کاک دوکتور ئەگەر لە ماڵی خۆم نەبای جۆرێکی دیکە وەڵامم دەدایەوە. ئێوە لە جیاتی بۆ یەکگرتنەوە هەنگاو ها وێن بۆ تێکدان کار دەکەن. بۆ من مەسەلە شەخسی قاسملو نیە، مە سەلە خەبات و حیزبی دیموکراتە.لەتبوون وجیابوونەوە، یارمەتی بەبزووتنەوەی کورد ناکات.ئێوە دەبوایە لەم بارەوە دەرسی بەنرخ وەربگرن.» دوکتور بەنابەدڵی رۆیشت.

لە سۆفیا بووم کاک سەلاح بەدرەددین تەلەفونی کرد و گوتی: « لە سوریا دەیانەوێ بتبینن. بەسەفارەتی خۆیان گوتوە، کە داوەتت بکەن بچیە شام.رۆژەکانی ئاخری مانگی پێنج بوو لە سەفارەتی سوریاوە ،تەلەفونیان کردو داوایان کرد کە سەرێکی سەفارەت بدەم.کە

چووم بەگەرمی بەخێر هاتنیان کردم و قاوەیان هێناو کابرا گوتی :«ئوستاذ ! دیمشق حەزدەکا لەگەڕانەوەدا سەرێک لە وێ بدەی ، ڕەنگە چاو پێکەو تنت بۆ مە سەلەی کوردستانی ئێران خێری هەبێ.»

گوتم مانیعم نیە.ئەگەر بەلوبناندا بگەڕێمەوە.گوتی کەی سەفەر دەکەی؟ جارێ نازانم . هێندێ کارم ماوە. نە مویست کابرا بزانێ کەی دەڕۆم.

## سەفەر بۆ بێروت

ڕۆژی ۹۸۱/٦/۱۲ لە فڕۆکەخانەی سۆفیا خوا حافیزیم لە مندالەکان کرد. کاتی ماچکردنیان کەمالْ گریا.سواری فڕۆکە بووم بۆ بێروت.برادەرانی کاک سەلاح لە فڕۆکە خانەچاوەڕوانبوو ن.یەکسەر چوومەدەفتەری حیزبی کاک سەلاحی.ئەو دەم بارەگای حیزبەکەی لە بیروت بوو، گۆڤاری ڕۆژهەلاتیان دەردەکرد.هێندێ برادە ری کوردی تورکیا، ئەندامی «پارتی کرێکاری پێشە نگی کوردستان» لەلای کاک سەلاح بوون ولام وایە لەلای فەلەستینیەکان مەشقی پێدە کردن.من لەمالی کاک سەلاح میوان بووم. ڕۆژی ۹۸۱/٦/۱۳ چومە لای هاورێ عیسمەت چاوید، ئەندامی دەفتەری سیاسی حیزبی کومونیستی لوبنان، لە سەر باس و لێکدانەوەی وەزعی کوردستان، هەر تکمان لە سەر ئەو باوەڕە بووین کە یەکیتی ریزەکانی حیزبی دێموکرات ئە رکی بنچینەیی ئێستامانە.ڕۆژی دوایی لەگەلْ کاک سەلاح چوومەلای نایف حەواتمە.لە باس و شیکردنەوەی وەزعی ئێراندا گوتی :« بەهیچ جۆر نابێ چەکدابنێین.لە پێوەندی لەگەلْ عیراقدا ئیحتیات بکەن.بەتوندی لە هەلوێست و جیابوونەوەی غەنی بلوریان

ڕەخنەی گرت و گوتی : ئێستا ئەگەر دەستم وەغەنی بلوریان ڕاگەیشتبایە، لێم دەپرسی،لە بزووتنەوەی رزگا ریخوازی کوردیدا نەخشت چیەر لە جولانەوەی کومونیستی ئێراندا چ دەورێکت هەیە؟.گوتی دەستەی نوێنەرایەتی حیزبی تودە لێرەبوە، بە راشکاوی پێمان گوتون کە لە سەر مەسەلەی کورد و هە لوێستی حیزبی تودە سەبارەت بە حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران لەگەڵ ئێوە ئیختیلافمان هەیە.پاشان بە(تەیسیر)ی گوت ، ئەوەدەم بە رپرسی پێوەندییەکانی دەرەوەبوو، لەگۆڤاری (الحریە) وتووێژ ێک لەگەڵ هاورێ کەریم بکەن .

گوتم: رەفیق نایف من ئێستا لە حیزبی دیموکراتدا مەسئولیەتێکم نیە، پێویست ناکا لەگەڵ من وتووێژ بکەن.گوتی گرنگ نیە تۆ بۆ ئێمە هەمیشە خاوەن مەسئولیەتی.گۆڤاری الحریە لە ژمارە(٢٣, ١)١٩٨١/٧/١٣ دا دەقی پرسیار وەلامەکەی بلاو کرد بۆوە.نایف حەواتمەگوتی:«پێش رۆیشتنیشت جارێکیتر یەکتر دەبینینەوە. من لام وایە پێویستە هەولبدرێ مە سە لەی کورد وەک مەسەلە ی نەتەوە یەکی بیست میلیۆنی بێتە گۆرێ. لەم رێگایەدا، هەرچی لە دەستمان بێ، یارمەتی دەکەین . پاشان هاتن یەکدوو رەسمیان لێ گرتین.

رۆژی دوایی ئەبوئەیاد بۆ نانخواردنی نیوەرۆ داوەتی کردم.لەگەڵ باس و شیکردنەوەی وەزعی کوردستان، گوتی: لە سە ر ئەو باوەرەم کە دروشمی خودموختاری بگۆرن و داوای سەربەخۆیی کوردستان بێننە گۆرێ.گوتی کاتت بۆ وەردەگرم، چاوت بەئەبو عمار بکەوێ.ئەگەر دەتەوی بەسەفیری لیبی دەلێم بتبینێ، قسەی لەگەڵ بکە بەڵکوو یارمەتی ماڵیتان بدەن. ئە وان پارە یان زۆرە دەبێ ئیستیفادە یان لێ بکەن.»

گوتم‌پێم خۆشە چاوم بەئەبو عمار بکەوێ، بەلام چونکە لەلایەن

حیزبەوە پێم ئەسپێراوە ناتوانم باڵیۆزی لیبی ببینم. پاشان دەمانچەیەکی ساختی چێکوسلۆڤاکی بەدیاری دامێ کە هەم دەمانچەبوو، هەم دەبوە ئەفتۆماتیکی پچوک.رۆژی ٩٨١/٦/١٦ کاک سەلاح بەدرەددین گوتی: ئەفسەرێکی سوری لە لوبنان خەبەری داوەمێ کە لە شام چاوەڕوانی کەریمی حسامی دەکەن. کابرا دەیەوێ لەگەڵت بێ بۆ شام . منیش لەگەڵت دێم .رۆژی ٩٨١/٦/١٧ لەگەڵ کاک سەلاح بەدرەددین سواری ماشێنی ئەفسەرێکی سوری بووین و چووینە شامی شەریف.! یەکسەر بردیانین بۆ ئەمنی قەومی.کابرایەک بەناوی ڕواڵەتی (عەدنان) یاریدەدەری ئەمنی قەومی پێشوازی لێ‌کردین.دوای بەخێر هێنان گوتی:«ئیمە موشتاق بووین بێرەدا بێیەوە پێشنیارمان ئەوەیە کە بچیەوە تاران.پاسپۆرت و بیتاقەت بۆ ئامادە دەکەین، پیاوەکانی ئیمە ، عەلی سەنجاری و باقر یاسین لە تاران پێشوازیت لێ دەکەن.پێش ڕۆیشتنت دەتوانی سەرۆکیش ببینی. ئیمە بۆ چارەسەر کردنی کێشەی کورد لە ئیران یارمەتی دەدەین.»

گوتم زۆر سوپاس بۆ داوەتەکەتان. بەلام لام وابوو، بۆ دۆزینەوەی چارەسەر کردنی مەسەلەی کورد لە کوردستانی ئێران منتان بانگ کردوە.من کارێکم لە تاران نیەو ناتوانم بچمەوەتاران. من داوام ئەوەیە کە سەرۆک حافظ ا سد نفوذی خۆی بۆ ئا شتبوونەوەی حکومەتی ئێران و حیزبی دیموکرات بەکار بێنێ و مەسەلەی کورد لە ڕێگای هێمنانەوە چارە سە ر بکرێ .حیزبی دێموکرات نایەوێ حکومەتی ئێران لە شەڕی کوردستاندا لاواز بکا.»

گوتی : « حکومەتی ئێران لەگەڵ قاسملو دانانیشێ و گفتگۆ ناکات.

- مەسەلەی کورد، مەسەلەی شەخسی قاسملو نیە.قاسملوش بروا ناکا لەگەڵ حکومەت دانیشێ. نوێنەرانی حیزبی دیموکران دەتوانن لەگەڵ

نوێنەرانی حکومەت دانیشن و لە ڕێگای ئاشتیەوە، چاری مەسەلە بکەن.»

- دەتوانی پێشنیارەکانی حیزبی دیموکرات بۆ ئێمە بنووسی.؟

هاتمە هۆدەیەکی تر و بەیارمەتی کاک سەلاحی شەش ئەسڵی پێشنیاری تازەی حیزبی دیموکراتم هێنا سەر کاغەز:

- دیاریکردنی ناوچە ی کوردستان، بەپێی زۆربەی دەنگی دانیشتوانی ناوچە کە.

- پێکهێنانی شورای سەرانسەری کوردستان.

- بەرەسمی ناسینی زمانی کوردی.

- دانانی پولیس و ژاندارم لە خەڵکی مەحەللی.

- تومارکردنی ئەومافانە لە موتەممەمی قانونی ئەساسیدا.

- دیاریکردنی بودجەیەک بۆ ئاوەدانکردنەوەی ویرانیەکانی کوردستان.

بۆ دەستپێکردنەوەی وتووێژ ئەم شەرتانەی خوارەوە پێشنیار دەکەین:

١ - ڕاگەیاندنی شەڕ وە ستاندن

٢ - بە رەسمی ناسینی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران

٣ - بردنەدەری پاسداران لە شارەکانی کوردستان

نووسراوە کەم دا بەکابرا وداوام لێکرد کە بۆ ڕاوەستانی شەڕ و دەستپێکردنەوەی وتووێژ هەنگاو بنێن. کابرا گوتی تـــو تا وەرگرتنەوەی وەڵام میوانی ئێمەی و لە هوتێل شیراتون جێگات بۆ ڕاگیراوە.

گوتم زۆ ر سوپا س. من لە بیروت کارم زۆرە دەبی بچمەوە لوبنان. ئێوە دەتوانن بەهۆی رەفیق سەلاحەوە خەبەرم لێ بگێڕنەوە.

شەو لەدیمشق میوانی یەکێک لە سەرکردەکانی فەلەستینی بووین کە دۆستی کاک سەلاح بوو.بەیانی چوویندەرەوەی شام. ناوچەیەکی هەتا بڵێی خۆش و باسەفا. دارستان و پڕ لە هوتێل و ڕەستوران، شوێنێکی

تووریستی و دلگیر.لە رەستورانێکدابەزین، بیرەی سارد و خواردنی بەتام وچێژی سوری و لوبنانی.دوای نیوەڕۆ گەڕاینەوە بۆ بێروت.

رۆژی ٩٨١/٦/٢٥ تەلەفونم کرد بۆ کاک عەزیزی ماملێ،گوتی کاک مستەفای شەڵماشی هاتوە چۆتەسۆفیا و لەوانەیە بێتە بیروت.شەوی ١٩٨١/٦/٢٧ بەگوێرەی وادە ی بۆیاندانا بووم، بردیانم بۆ کن یاسرعەرەفات . باسی بارودوخی کوردستان وگەمارۆی ئابوری وسەپاندنی شەڕم بۆ کرد.رەخنەی لە سیاسەتی خومەینی گرت. گوتی: لە سەفەری دواییمدا لەگەڵی تێکچووم.خومەینی باسی فتوای کرد. گوتم، ئەگەر مەسەلەی فتوا بێ، من مافی فتوا دانم هەیە، چونکەمن کوڕی موفتی فەلەستینم.پاشان سەفەری سوریەم بۆ باسکرد. گوتی : چۆن رێزات بچیە سوریە. چاکت نەجاتی بوە. بەسە ر سەرۆکانی عەرەبدا هاتەخوار و گوتی (حکام العرب، کلهم خونە).پاشان گوتی: بۆ مە سەلەی کورد هەرچی لەتواناماندا بێ دەیکەین.خواحافیزیم لێکرد ر گەڕامەوەماڵە کاک سەلاحی.

رۆژی ٩٨١/٧/٤کاک مستەفا ی شەڵماشی لە سۆفیاوە تەلەفونی کرد و گوتی تکایە سەفەر مەکە تا من دێم بۆ بیروت.گیر بووم و تا ئەوهات بەیاننامەی کومیتەی ناوەندی سەبارەت بە بۆمبارانی زیندانی دۆڵتوێ هاتبوو، بەیارمەتی کاک سەلاح کردم بەعەرەبی و بڵاو کرایەوە .

رۆژی ٩٨١/٧/١١ کاک مستەفای شەڵماشی هات . کاک مستەفا نەشارەزا و تەناسراو بوو. ئەوەی لە دەستم هات یار مەتیمدا. لەگەڵ خۆم بردمە لای حیزب و رێکخراوەکانی لوبنانی و فەلەستینی و وەک ئەندامی دەفتەری سیاسی ناساندم. پیاو هەق بڵێ لە گەڕانەوەدا گوتبووی: یارمەتی داوم . هەرچەند سەفەرەکەشی لە گەڕان بەدەر هیچ بەرهەمێکی نەبوو.لە بێروت لەگەڵ برادەرانی کوردستانی تورکیا، (ئالای

رزگاری)کاک سەلیم و کاک ئیبراهیم بورمە ئاشنا.بەجیددی داوایان کرد کە دانیشتنێکمان هەبێ.لەگەڵ کاک مستەفا رۆژێک بەهەورا لەگەڵیان دانیشتین، دەستیان کرد بەپرسیاران ، داوایان دەکرد من وەڵامیان بدەمەوە.گوتم من ئێستا لە حیزبی دیموکرات دا هیچ مەسئولیەتێکم نیە، دەبێ کاک مستەفا وەڵام بداتەوە. ئەوانیش دەیانگوت ئێمە پرسیار لەتۆ دەکەین.باسێکی دۆستانەمان هەبوو، بەڵام پاشان کاک مستەفای شەڵماشی دەیگوت تۆ بەئانا نقە ست گوتوتە لە حیزبی دیموکراتدا مەسئولیەتم نیە. ئەوە بۆ کوتانی حیزب بوەو پرستیژی حیزبی پێ دێتەخوار.واتە کاک مستەفاش وەک زۆر کەسیتر لە سەر ئەو باوەرە بوو کە کورد نابێ لە ژیانیدا راست وێژ بێ !!

من ئیتر لە لوبنان کارم نەمابوو. هەموو حیزب و رێکخراوەکانی لوبنان و فەلەستینیم دیتبوون.لای هەموانیش گوتبووم دیداری من حیزبی نیەو خسوسی یە.لەو ماوەیەدا میوانی کاک سەلاح بووم و هەمیشە برادەرێک وەک پارێزەر لەگەلم دەگەرا، لەرادە بەدەر پێمەوە ماندوو بوون و خزمەتیان کردم. برادەرانی کوردستانی تورکیا لەوێ بوون، لەگەڵیان بورمە ئاشنا.بەتایبە ت لە ناسین و دیتنی عەلی شیر ، ئەندامی پارتی کرێکاری کوردستانی تورکیا (پێشەنگ)

گەلێک شاد بووم و کەلکم وەر گرت. ئاگاداریەکی پڕ بایەخی لە سەر وەزعی حیزبە کوردیێەکانی کوردستانی تورکیا دامێ.بۆ تێپەرین بەتورکیادا، رێنوێنی و یارمەتیەکی باشیان دام.دیارە من بەتەنیا بووم. کاک سەلاح بەدرەددین گوتی نابێ بەتەنیا برۆی، برادەرێکی ئێمە لەگەڵ خۆت بەرە.کاک سەلاح لەو ماوەیەدا یارمەتیەکی زۆری بە برادەرانی حیزبی دیموکرات کردبوو، ئەم پیاوەتیەشی لێ زیاد کرد. هەر لەو کاتەشدا بەبەردێک سێ کێلی شکاند. یێکەم منی گەلێک بەر منەت کرد

کە لەم ڕێگا دور ودرێژ ەدا بەتەنیا نەبم و شایانی سوپاسە لەلای منەوە. دووەم برادەرێکی دەنارده لای حیزبی دیموکرات و هاوکاری و پشتیوانی خۆی ڕادەگەیاند. سێیەم ئەو برادەرەی دەینارد، تۆزێ سەر بزێو بوو، دەیویست ماوەیەک لە دەستانی بحەسێنەوە.ئیستا بۆ تێپەڕین بە تورکیادا، پاسپۆرتی حیسابی پێویست بوو، کە ڤیزای گەرەک نەبێ.دۆست و برادەری دڵسۆز هەبوون، پاسپۆرتیان بۆ ساز کردین .

## بەرەو وڵات بە تورکیادا

ڕۆژی ١٦ /٧/٩٨١، ئە و ڕۆژەی فرۆکەکانی ئیسرائیل بیروتیان بۆمباران کرد، نیو سەعات دوای بۆمبارانەکە، لەگەڵ ( ڕێبەر) ی برادەری هاو سەفەر بەتاکسی بیروتمان بەرەو شام بەجێ هێشت.لە بیروت چاوم بەکاک کەریم ئەحمەد و ئەبو موخلیس کەوت. گوتیان لە شام چاوەروانت دەبین. لە دیمشق چوینە مالی خەزوری کاک سەلاح بەدرەددین. برادەرانی کومیتەی ناوەندی حیزبی کومونیستی عیراق، شەو داوەتیان کردم. زۆربەی ئە ندامانی کومیتەی ناوەندی لەوێبوون.شەوێکی دۆستانەو ڕەفیقانە ساز کرابوو. لە سە ر خواردن و خواردنەوە ، لەگەڵ عادل حەبە ئەندامی کومیتەی ناوەندی لێمان بوو بەکێشە. کابرا چەند ساڵ لەتاران گیرابوو.فارسی باش فێر ببوو. وشکەسۆفیەکی ڕەقی نەخاراوی خومەینی و حیزبی تودەبوو. لام وابە شیعەگەریش نەختێ پالی پێوە نابوو، دیفاعێکی لە خومەینی دەکرد،هیچ دەروێشێک ئاوا دیفاع لە شێخی دەستبڕ ناکا. پەلاماردانی حیزبی دیموکراتیشی لێ دەکردە ئاویتەو هێرش بۆ سەر دوکتور قاسملو.ناچار بەقەولی(مەلا بزۆی پیاوی

سمایلاغای سمکۆ)بالتز وەدەمانچەم بۆ دانا و بەتوندی شکاندمەوە.باسەکەمان بوو بەدەنگ لێ هەڵێنان. ئاخرەکەی هاوڕێ سابیت گوتی : ( رەفیق کەریم ، ئەو فەرمایشاتانەی هاوڕێ عادل بیرو رای خۆیەتی و پێوەندی بە هەڵوێستی حیزبی ئێمەوەنیە.ئێمە سیاسەتی حیزبی تودە لە ئاست مەسەلەی کورد و حیزبی دێموکراتی کوردستان بەراست نازانین. بەخۆشمانیان گوتوە.باشبوو عادل حەبەی بێدەنگ کرد. شەو درنگ مالاوایم لێ خواستن و چوومەوە مزلەکەی خۆم.

شەوی دووەم کۆمەڵێک لە لاوانی کوردی شام هاتنە لام.دانیشتنێکی فرەخۆش و دۆستانە. پرسیاریان گەلێک بوون. بەلام پرسیاری بنچینەییان ئەوەبوو، داخوا لە قۆناخی ئێستادا، ئەرکی لاوانی کوردی سوریا، خەباتی چینایەتیە، یان خەبات بۆ مافی نەتەوەیی؟. لام وایە بەگوێرەی تێگەیشتنی خۆم قۆناخی ئێستای خەباتی گەلی کوردم بۆ روونکردنەوەو خەباتی نەتەوایەتیم بەپلەی یەکەم دانا ...چونکە لەناخی خەباتی نەتەوایەتی نە تە و ە ی کوردا،تارادەیەکی زۆر خەباتی چینایەتیش شەقلی دیارە. باسێکی شیرین و بەتا مان هەبوو. هەستم کرد چاو پێکەوتنەکەیان بەدڵبوو. بۆ منیش شەوێکی فەرامۆ ش نەکراو بوو.

رۆژی ١٩/٧/٩٨١ سواری فرۆکەبووین بۆ قامیشلی. کاک شێخ موسی برادە ری (پێشەنگ)لە فرۆکەخانە کارلەکەی قامیشلی چاوەروانمانبوو.چووینە نێو بازاری قامیشلی دیاربوو، لە چەشنی تێکەڵپێکەڵی بازار ، ئاخافتن وهێندی جل و بەرگ شاری کوردانبوو. بەلام کەوای درێژ وحەگال وپێی پەتی، رەنگی عەرەبیشی تێهەڵسوو بوو.کاک شێخ موس ناوی هوتێلێکی گوت، لە دیاریەکر لە وێ بنیەخوار. ئادرێسێکیشی دامێ کە بۆ یارمەتیدان پێوەندی پێوە بکرم.بەپێیان چووینە سەر سنوور. ولاتێکە خەڵکێکە، بەلام عەرەب و

تورک لە ولأت و خاکی خۆت داوای پاس و ناو ونیشانت لێدەکەن. پۆلیسی سوریا مۆرێکی لە پاسەکانداو تێپەرین. نۆرەی تورک ئە فە ندی هات.دەستیکرد بەپشکنین. هیچمان پێ نەبوو . چاوی بەسیغاری رێبەری کەوت. قوت بوو، دەستی تێکدەهالأن. پاکەتە سیغارێکم دابە هەمووشت لە جێی خۆی بوو. (گیرش)ێکی لە پاسەکاندا و چووینە نسیبەین .شارۆچکەیەکی پچوکی فەقیرانە، دەتگوت تۆزی نیگبەتیی بەسەردا باریوە.تاکسیەکمان گرت بۆ دیاربەکر.لەو دەشتەپانو بەرینە، بۆ هەوەڵجار شتی وا ببینم. لە هەر چەند کیلۆمیترێک چە ند دیرەکی ئاسنیان بەرز کردوونەوە ، وەک هێلانە حاجیلە شوێنی زەلامێکیان چا کردوە و عەسکەرێکیان تێدا قەتیسکردوە بەدووربین دەڕوانێتە ئەو دەشت و مەزرایە. لە دوورەوە لە سەر گردی نێو شاری ماردین، ئیزگەیەکی راداری ئەمریکاییان دیارە. لە ماردین بە بەر قەدی گردی نێو شاردا تێ پەرین و دوای ماوەیەک گەیشتینە دیاربەکر.چوینە ئەو هوتێلەی کە پێمانگوترا بوو.ژوورێکیان داینێ، چایان بۆ هێناین و تاوێک حەساینەوەو چووینە نێو شار.دیاربەکری شۆرشوان و ناوەندی شۆرش و راپە ڕینی کوردانم بەشاری هەژار و فەقیران هاتەبەرچاو.لە دیتنی ئەو هەموو زارۆکە ناسک و نازدارە کە یا سواڵیان دەکرد و یا پێلاویان ڕەش دەکردەوە و یا ئاویان دەفرۆشت، تەزووم بەلەشی دادەهات. دەروازەو شوورەی دیوار وقەلاتی‌دیار بەکر ،مەزنەتی مێژووی کەونارای نەتەوەی کوردیان بیر دەخستەوە.لە نێو دەروازەیەکی شار رەسمێکم گرت . ڕۆژی دوایی شوێنی پێوەندی کرتنم دیتەوە، برادەرێک بەناوی ئەحمەد هاتەلامان وبوو بەچاوساخ و رێنوێن، پیاوێکی تێگەیشتوو، دڵسۆز و روح سوک.لە هەمووی گرنگتر قاوەی بۆ دۆزینەوە کە هاو سەفەرەکەم مەگیرانی لێ دەکرد و بۆمان ببوە مەسەلەیەکی گرنگ.

رۆژی ٩٨١/٧/٢٢چوومەگوندی سۆفیا لای کاک عومەر چەتین، فرا وینمان لای ئەو خوارد و شەو گەڕاینەوە بۆ هوتێل و بریارماندا بەیانی بڕۆین.برادەرانی (پێشەنگ) برادەرێکیان دیاریکرد کە هەتا (وان) لەگەڵمانبێ و تەسلیمی برادەرانی ئەوێمان بکا.بەیانی سواری ئوتوبو س بووین ولەبیتلیس لاماندا،چامانخواردەوە. بەداخەوە نەمتوانی لەو بنا و میعماری و خانوانەی بیتلیس رەسم بگرم. لای ئێواریێ گەیشتینەوان.لە ڕێگا و لەنێو شارەکان، لەزۆر شوێن دیار بوو دروشمی (د.د.قەدە ) نووسرا بوو بەلام پۆلیس رەشی کردبوونەوە. لە وان برادەرێک بە ناوی مەلا ئەحمەد هاتە هوتێل و ئیدی بوو بە هاوڕێ و چاوساغ و رێنوێنمان.لەگەڵ مەلائەحمەد هاتینە سەر ئەو بڕیارە کە برادەرێک بنێرینە گەوەڕ، تا لەگەڵ برادەرانی خۆیان ڕێگای دەرباز بوون بۆ ئەو دیو تاقی کەنەوە.ئێمە ش لە وان دانیشین تا خەبەرمان بۆ دێنەوە.مەلا ئەحمەد بردینی بۆ سەر گۆلی وان. لە دەرەوەی شار، مالی برادەرێکی خۆیان بەناوی دوکتور سالح. ئێوارە لەوێ مەلەمانکرد و دوای نانخواردن گەڕاینەوە بۆ هوتێل.رۆژی دوایی دیسان لەگەڵ مەلائەحمەد و یەکدوو برادەری دیکە چووینە تەماشای کلیسای (ئاخ تەمەر)کە چەند کیلۆمیتر لە نێو دەریا دروست کراوە. مێژووی دروستکردنی دەگەڕێتەوە بۆ ٨٠٠ سال لە مەو بەر. گردێکی بەردەلانی پڕ لەگاشەبەردی زەلام، بەزەحمەت خۆلی لێ وەگیر دەکەوێ، لە نێو دەریا قوت بۆتەوەو چەند داربادامی لێ شینبوەو هیچی تر. ئەرمەنی کلیسایان لە سەرئەو گاشەبەردانە دروستکردوە.سەیرێکی کلیساو دەوروبەر و نێو بەردانمان کرد و گەڕاینەوە بۆ وان.کە چووینە هوتێل، دوو برادەری خەلکی باشقەلا هاتبوون، لە هوتێل چاوەڕوانی ئێمەبوون.ئیتر گیر نەبووین، هەر ئەو ڕۆژە سواری ئوتوبوس بووین، بۆ گەوەڕ.لە ڕێگا دەیانپرسی ، وەک توریست دەر باز

دەبووین.تاریکدا هاتبوو، گەیشتینە گەوەر.برادەرانی باشقەلا، چوون دوو برادەری دیکەیان هێنا، نەیانهێشت گیر بین کەوتینەڕێ بۆ گوندی بەردەرەشی، ماڵی کاک شەهابەددین. پیاو یکی تێگەیشتوو، جوامێر،روو خۆش ، ماڵێکی خانەدان و گەورەماڵ. شەهابەددین ئەندامی (د.د.قەدە) بوو. دوای شۆرشی گەلانی ئێران یارمەتیەکی زۆ ری بۆ سەنتار و تاهیرخان نارد بوو. چووبوە ئە و دیو، ٨ مانگ لەکن سەنتاری مەمەدی و لای تاهیرخان مابۆوە. پاشان گەرا بۆوە گوندەکەی خۆی و بەقاچاخی دەژیا. شەو میواندارییەکی کوردانەیان ساز کرد و دوای نانخواردن هاتینە سەر ئەو باسە کە بەکوێدا بڕۆین. شەهابەددین پتر پرسیاری ئەوەی دەکرد کە لە گەڵ پارتی دیموکراتی کوردستانی عیراق نێوانم چۆنە؟.دەیگوت ئەگەر ترسی ئەوانمان نەبێ، تادەگەینە گەلاڵ بەهاسانی دەڕۆین.من پێشنیارم کرد کە بمانگەیێننە (گوستا) بنکە ی حیزبی کومونیستی عیراق . شەو تادرنگ باسەکەمان درێژەی هەبوو، ڕێگای دەرباز بوونمان نەدیتەوە.باسی سیاسیش دەهاتەنێو. بەتایبەت برادە رێکی ئە وان بەناوی عیسمەت،ماموستا بوو، باسەکەی دەبردەوە سەر سیاسەت و بەگوێرە ی عادەتی برادەرانی کوردستانی تورکیالە مارکسیزمیش دوور نەدەکەوتەوەو من لاموابوو زۆر باشێشی نەدەنگاوت. خۆش ئەوەبوو کە دەبوو بەسیاسەت، زمانەکە دەبوو بەتورکی. ڕێبەری هاو سەفەرم ڕەخنەی دەگرت : چما بەتورکی دەپەیڤن؟. گوتم ڕێبەر گیان لێرە سیاسەت بە تورکییە.دەیگوت نابێ.!!

شەو درنگ بوو، جێگا ڕاخران و ئێمە نوستین بێ ئەوەی لە سەر ڕۆیشتن بڕیارێک بدەین.دیاربوو پاش ئێمە خۆیان بڕیاریاندابوو کە بەڕۆژ لەوێ نەمێنین. سەعاتی چوار ونیو بوو، ڕاستیان کردینەوە کە بڕۆین.

پێم سەیربوو. بڕیاری ڕۆیشتن نەدرا بوو. ناچار ڕابووین، خۆمان

کزکردەوە . پرسیم بەکویندا دەڕۆین؟ گوتیان بەلای هەرکیاندا و بەسنوری عیراق و تورکیادا بۆ شنۆیە.بارگینێکیان هێنا ، جانتاو شرەو بڕەیان لێ قایم کرد ، شەهابەددین و عابدین ، چەکیان لە خۆ شە تکدان وسولەیمان و سالحیش بێ چەک کەوتینەرێ . زۆر دوور نەکەوتبووینەوە ، وەهەورازی کەوتین. چ هەوراز ، رژد و سنگ دەر پە ریو ، بەردەلان ، کەمێک ڕۆیشتین ڕێبەری هاوسەفەرم خۆی بەعەرزی داداو گوتی ناتوانم هەنگاو هەلێنم . ناچار سوارمانکردو تازە زەردە وەسەران دەکەوت ، لە بستوی بەردە ڕەشی وەسەر کەوتین. لە ڕادەبەدەر هیلاک بووم و بەزەحمەت پشووم دەردەبڕی. تاوێک دانیشتین.خۆر دەهات سەری لە ئاسۆوەدەردەناو دەشتی گەوەری نورانی دەکرد. تەماشای دەشت و مەزرای سەوز وسووری پڕ لە دەخلْ و دان و دارستانی گەوەر ، هیلاکی رێگای لە بیر پیاوی دەبردەوە. لەو بەرزاییە ڕەسمێکمان گرت کە وا لەنێو لاپەڕەکانی ئەم نوسراوەیەدا بەرچاو دەکەوێ.دوای حەسانەوە ، کەوتینەڕێ ، تووشی خزمێکی شەهابەددین بووین ، لە هەواری دەهاتەوە.دووبارگینی پێبوون. یەکیانی لێ وەرگرت وناردی بۆچادران ، گوتی نان و چامان بۆ بێننە سە ر سەرچاوەی. ئاوێک دەهاتەخوار ، چوینە سەر سەرچاوەی ئاوەکە. ئاشگێڕێک هەلْدەقولی ، ڕوون وەک چاوی قرژالی . سارد ، شیرین ، لە خواردنەوەی تێر نەدەبووی. زۆری پێ نەچوو دوو کیژی بالاْ بەرزی شۆخی جوانچاک لە چادرانەوە پەیدا بوون.نان و پێخۆر و کەتری و چادانیان هێنا بوو دەستیانکرد بەچا لێنان و ئێمەش دەستمانکرد بە خواردن.تائێمە لەنان و چا خواردن بووینەوە ،شەهابەددین ناردی سێ ولاْخی دیکەشیان هێناو سواربووین لە هەورازی (سەری بڕی) سەرکەوتین . لە وێ تووشی شوانان بووین. ئەوانیش چایان بۆ لێنابین.هەورازمان لە بەر نەمابوو. ولاخەکانیان ناردنەوە، تەنیا

هێسترێکیان گێڕایەوە جانتاو رێبەریان سوار کرد. لەپێ کەوتبوو، نەدەڕۆیشت. بەم مەڵبە ندەدا تێپەڕین کە شەڕی براکوژی پارتی و یەکێتی نیشتمانی لێکرابوو.ئەوانەی لەگەڵم بوون کارەساتە داخدارەکانی ئەو شەڕەیان بۆ باس دەکردم . ئێوارەیەکی درنگ، شەکەت و هیلاک، بەزەحمەت هەنگاوم داویشت، لەتەلانێکی رژد و هەڵدێر چووینە خوارێ و لە (کیوەرۆک) گەیشتینە رەشماڵی هەرکیان.دەپازدە چادر لە سەر روبارێکی پڕئاو وپاسەفا هەڵیاندابوو.لە سەر ئاسیاری شەهابەددین، چووینە ماڵی محمد ئاورێک شەو لە ماڵە محمدی بەگەرمی پێشوازیان لێکردین. لەم هۆبەیە بێجگە لە برادەرێک بەناوی (حاجی) چ پیاوی دیکەی تێدا نەبوون.پیاوەکان گشتیان چووبوونەوە گوندی بۆ گیا دروون و کۆ کردنەوەی تفاق و دەخڵو دانی زستانێ. شەهابەددین گەڕایەوە کامرایەکی پچووکم بەد یاری دایەو هەر گیز پیاوەتی‌ئەو فەرامۆش ناکرێ. . پاشان حاجیمان ناردەگوندی (بیداوێ )کە ولاخمان بۆ بێنێ و بە سنووری تورکیا و عیراقدا، (واتەبەنیشتمانێکی داگیر کراودا، کە داگیرکەران سنووریان بۆ داناوە) بچینە (گوستا) بنکەی حیزبی کوموتیستی عیراق و لەوێشەوە بچینەگەلاز و شنۆیە.بۆ هەوەڵجار دیتم کە کۆشتیان لە سەرگاشەبەردان هەڵدەخست، وشکیان دەکردەوە بۆ زستانێ.ئێمە دوو رۆژان چاوەروانبووین تا حاجی هاتەوە. رۆژی دوایی ژنی هۆبە لێم کۆ بوونەوە کە دوکتورم ودەرمانیان دەویست. هەرچە ندی سوێند و هاوار کە دوکتور نیم، فایدەی نەبوو. هێندێکم حەب ودەرمانی ژانە سەر پێبوو، هەریەکە ی دوودەنکم دەدانێ و سەریان سوک دەکردم.حاجی لە بیداوێ گەڕایەوە. گوتی: لە بە ر بەفرێ ولاخ دەرناچن. پێویستە بەپێیان بچین. رێبەر پێی چەقاند، گوتی ناتوانم. بەتایبەت کیف و جانتاشمان پێ هەڵنەدەگیرا.ئێستا لەو هۆبەیە و لەو کوێستانە زەنوێرە،

ڕێنوێن و یاریدەدەرمان تەنیا و تەنیا حاجی بوو.حاجیش خۆی شوانی یەک لەو ماڵانەبوو. بە هاواڵ شوانەکەی گوت، تائەوز میوانانە بەرێنەکەم ، نایەمەوە بەرمەڕێ.حاجیمان نارد بۆ یەکدوو گوندی دیکە، ولاغ وەگیر نەدەکەوتن.ڕێبەری هاڤاڵم ڕۆژانە دەنوست و منیش بەدەم ڕووباریدا هەڵدەکشام و سەیری ئەم نیشتمانە جوانەم دەکرد.هەر ڕۆژەش ماڵێک داوەتیان دەکردین.ڕۆژی سێیەم بوو، یەک لە خاوەن ماڵەکان هاتەوە. ئیتر بردینیە ماڵی خۆی،گوتی سبەی موختار ودوو کەسیتر دێنە ئێرە. شەڕێک کراوە، دەچن بۆ شەمدینان، بەڵکوو موختار لەگەڵ خۆی بتانبا و بەرتیلێک بدا بە ژاندارم و بەرێتان بکا.

زۆری پێنەچوو، موختار لەگەڵ دووکەسیتر پەیدابوو.دەستکرا بەپرسیار و بەخێر هێنان و من باسی سەفەر ودەرچوونی خۆم بۆکردن.داوام لەموختار کرد کە ڕێگای ڕۆیشتنمان بۆ بدۆزێتەوە.موختار هیچی نەگوت،دوای نانخواردن چوونە سەر ڕو باری. برادەری خانەخوێ زووتر هاتەوە،گوتی ئەوانە لە تۆ وەشک کەوتوون، کە نەکا سەر بەجەلال تاڵەبانی بی.ترسم هەیە بەگرتنیشت بدەن.کە لە سەر ڕووبار گەڕانەوە، بەموختارم گوت: من لە ئورووپاوەدێم و دەچمە کن مەسعود بارزانی.میوانیی ئەوم. ئەگەر تووشی هیچ دەردەسەرییەک بم،تۆ بەر پرسی.موختار گوتی: تەنها ڕێگە شەمدینان پڕ دژوارە. مەعموری نوێ هاتینە. گوتم دوو ولاغمان بۆ پەیداکەن بۆ لای گەوەڕ دەگەڕێینەوە. ناکرێ هەر لێرە گیر بین.

موختار گوتی: دوو هێستران ژتەڕا دەشینم، ئێوە بەرێتەوەگەوەڕ.زۆر سوپاسم کرد، حاجی یان لەگەڵ خۆ برد و لای ئێواری حاجی لەگەڵ زەلامێک و دوو هێستران هاتەوە.شەو لەوێ ماینەوە، ڕۆژی دوایی بەیانی ماڵاوایی‌مان لە خاوەن ماڵ و لەهۆزیە خواست و بەرەو (بەردەڕەش) ماڵی

شەهابەددین گەڕاینەوە.

ڕۆژی ٩٨١/٧/٢٧ لای ئێواری گەیشتینەوە بەردەرەشی.هەر ئەو ڕۆژە ناردمان لە دوای سالح و سولەیمان لە گەوەڕ کە گیر نەبن و بێن بۆ لامان.برادەری چووبوو، هاتەوەگوتی: گوتوویانە سبەی دێن.ڕۆژی دوایی لای نیوەڕۆیە بەسواری کامیۆنێک پەیدابوون.سواری کامیۆنیان کردین بۆ گەوەڕ.لەوێ نەیانهێشت ئێمە دابەزین، دوویرادەری تر بەناوی (تاهیر و نەواف) لەگەڵمان سواری کامیۆن بوون، بۆ گوندی(بلأن باسان). لەوێ لە ماڵی (عەبد ولاّ ئەسلأن) هاتینەخوار.ماڵێکی سەر ئاواڵەو پاک و خاوێن. دیار بوو مەکۆی بەڕێکردنی قاچاخ و لێقەوماوانە.زۆر زوو چایان ساز کرد.پاش ماوەیەک عەبدولاّ هاتەوە.بەگەرمی بەخێر هاتنی کردین. چاییمانخواردەوە گوتم: دی، عەبدولاّ، ئێستا بێژە پێمان کەنگێ و چۆنمان بەرێ دەکەی.؟

عەبدولاّ گوتی:«دوو ئەسپی من هەنە، سوارتان دەکەم، ئەم ڕێگایە گەلێک هەوراز و نەستەمە، بەپێ نەکارن سەر کەون.بەپێش قەرەقولدا دەڕۆین، شەو دەتانگەیێنمە گوندی(گوزران) لە دیوی خۆتان. ئێوەش گەرک ١٥ هەزار لیرە بدەنەمن».گوتم پارە عیلاجی دەکرێ، بەلأم چۆن بەڕۆژ.بەپێش ژاندارمدا دەمانبەی؟ گوتی : ئەوە ئیشی خۆمە. سەگباب ..٤ هەزار لیرەی لەکن من داناوە، دەکارێ دەنگ بکا؟.

ولأخیان هێنان، سوار بووین و لە دەرەوەی گوندی بەپێش پۆستی ژاندارمەدا تێ پەڕین. ژاندارم لە.بەردەرگا وێستا بوون.زۆر نەڕۆیشتبین،گەیشتینە، گەلی (سپیند دەرە). چیایەکی ڕۆد و هەڵدێر وهەورازێکی سەخت ودژوار.لە هێندێ جێ لە ترسی هەڵدێرانی بارگینەکە، دەهاتمەخوار. سەعاتی ٩ی شەو لە سنووری (دوگە) سەرکەوتین و چووینە نێو سەربازی تورکان کە لە سەر سنوور بوون. سەرباز لێمان

هالاّن.عەبدولاّ ئەسلاّن وەک ئەفسەرێک دەنگی دان، لێمان کشانەوە. چەند دەقیقەیەک ونبوو، پاشان هاتەوەو بەدیوی کوردستانی خۆماندا شۆڕ بووینەوە . سەعاتی ١٢ی شەو لەگوندی(گۆران) لە حەسارێکی گەورە لە دەرگامانداٚ مالّی .فەخرەددین) ، عەبدولاّ ئەسلاّن پێی دەگوت:(فەرخە دین ) دیار بوو خزمی یەکتر بوون.فەرخەدین دەرگای لێ کردینەوە، بەو شەوە نان و چایەکی کوردانەی سازکردو رووخۆشی و بەخێر هێنانی هیلاکی و ترسی ڕێگای لە بیر بردینەوە. عەبدولاّ هەر بەو شەوە گەڕایەوە . ئێمەش لێی ڕازاین. بەیانی فەخرەددین گوتی: « دەبێ ببورن ، فەعلەی گیادروونم هەن و ناتوانم بەجێیان بێلّم. پێویستە لە کنیان بم. کوڕێکی مێر مندالّی بانگ کرد کە خزمەتمان بکا.خێزانی سەماوەری هێنا و نان و چایەکی جوانی ساز کرد و پرسی بۆ فراوین چتان بۆ ساز کەم، هەموو تشت هەیە.؟

گوتم هەرچی خۆت دەخوازی، بەلاّم ئێمە گەرەک بڕۆین. گوتی تافراوین نەخۆن ناڕۆن. ژنی فەرخەدین جلی شکاکی لە بەر دابوو. گوتم دەتوانم بەو جلانەوە رەسمێکت لێ بگرم؟

- ئە رێ دەتوانی. بەلاّم ڕاوەستە، ژنی دراوسێی من هەنە ، بلاّ بانگیان کەم رەسمی هەموان بگرە. ڕۆیشت، پتر لە دوو سەعاتی پێچوو نەهاتەوە. لە کوڕەکەم پرسی: ئەو ژنە چی بەسەر هات؟. گوتی : لەگەلّ دووژنی دیکە، هەروا جلی خۆ جوان دەکەن. لە پڕ هەر سێک هاتنە ژووری. بەراستی شاکاری جوانی لیباسی ژنان بوو. خۆشیان جوانبوون هیچ، جلەکانیان ئەوەندەی تریان جوان کردبوون.چەند رەسمم لێ هەلّگرتن ، هاو سەفەرەکەم رەسمەکانی بردەوە لوبنان و لام وایە لە یەکێک لە ژمارەکانی گۆڤاری (ڕۆهەلاّت)دا چاپکرابوون.

نانێکی باشی بۆ ساز کردبووین. دوای نانخواردن کوڕەکەم ناردەتێو

گوندی، گوتم بچو بزانە کێ ماشێنی هەیە تا هەشتیان سوارمانکا، پارەشی دەدەینێ. کور چوو هاتەوە گوتی: پیکاپێک هەیە تا گوندی هەشتیان داوای ٢٠ تمەنی دەکا.باشە با بچین. کە چووینە حەساری کابرا لێمان وەدەر کەوت وتی: «تەنەکەریمی حسامی ؟»

- بەلێ... راست خۆیەتی.

- ماشێن بۆ تەیە؟

- ئەرێ... بۆ منە و دەخوازم بچمە هەشتیان.کابرا وەک پیاوان ماشێنی هەڵکرد و چووینە ماڵی فەخرەددین ، شتومەکمان هەڵگرت و خوا حافیزیم کردو کەوتینەرێ. لە گوندێکی خوارووتر پێشمەرگە راپانگرتین و بە شۆفیریانگوت برۆ بۆ مە.قەرِ دوورتر لە سەر تەپۆڵکەیەکبوو.بەشکاکی بانگی کرد گوتی: ئەفسەری ئیرانیە، بۆ لای ورمێ دە چی.مەسئولی مەقەرِ هاتە دەر و هاتە پێشمان.ماشێنی راگرت و گوتی : وەرنە خوارێ

- بو بێینە خوارێ؟

- ئێوە ناسناکەین. گەرەک پرسیار بکەین. لەو قسانەدابووین، چەند پێشمەرگەی هێزی پێشەوا لە دوور ناسیانم . غاریاندا. هاتمەخوار، ماچ و بەخێر هێنان و کابرای شکاک واقی ورما. پێیان گوت : ئەوە فلان کەسە.چووینە مەقەرِ، تاوێک دانیشتین، چایان لێنا، تۆزێ وەزعی ولاتم پرسی،دوای چاخواردنەوە، مەسئولی مەقەرِیش لەگەڵم سوار بوو ، چووینە هەشتیان.کە چووم رەحمانی حاجی ئەحمەدی و تاهیری عەلیار و رەحیمی محەمدزادە لەوێ بوون. هاتبون بەخێر تەشکیلات دابمەزرێنن و تێکۆشانی حیزب پەرەپێبدەن.بەلام تووشی وەزعێکی نالەبار ببوون. لەلایەک پێشمەرگەیەک مەلا رەزای پیاوی تاهیرخانی لە زینداندا کوشتبوو، تاهیرخان توورەو هارۆژابوو.لە لایەکی تر مەسەلەی هێنانە دەری مەیتی مەلا مستەفای رەحمەتی قەومابوو، بارزانی رێگای شنۆ - برادۆستیان

گرتبوو، هاتوو چۆیان بۆ نەدەکرا. بنسیمیان تێکچوو بوو، نەیاندەتوانی بیئێرن چاکی کەنەوە. چەند کەسیان لە لا کەوتبوونەوە کە دەیانویست بچنەوە لای دەفتەر دەر باز نەدەبوون. کەریم خالْدار دەگەلْ پۆلێک پێشمەرگە هاتبوونە ئەمْ ناوچەیە. لای ئێواریْ چوومە نێو پێشمەرگەکان و تۆزێ باسی ئوورووپام بۆ کردن و ئەوانیش لەم ڕووداوانە تێگەران بوون.شەو لە هەشتیان لە مالێکی دەولەمەند نان وخوانمان بۆ ساز کرابوو.ڕەحمانی حاجی ئەحمەدێ ئیسرارێکی زۆری هەبوو کە بەکن مەسعود بارزانیدا بچمەوە و بەلْکوو وابکەم کە لە شەڕی براکوژی دوور کەوینەوە .هەر وەها ئیسراری بوو کە دە فتەری سیاسی تێبگەیێنم لە شەڕ دەگەلْ بارزانیان خۆ بپارێزن.دەیگوت شەر زیانێکی زۆرمان لێدەدا و شەر لەگەلْ بارزانیان ناکرێ.برادەرانی دیکەش هەر لە سەر ئەو باوەڕەبوون، بەلاْمەسەلە ئەوەبوو، من چۆن دەرباز دەبم.بارزانی ڕێگایان گرتوە.بەتایبەت خەلْکی سەر بەحیزبی دێموکرات و لای مەهاباد ناتوانن بو لای شنۆیە تێپەڕن.چەند کەس هاتبوون بەئیجازەی حیزب بچنە ئورووپا.دەبوایە بچنە سێرۆ عیسمەت دەری بەڕێیان بکا.ئەوانیش کەوتبوونەوە.برادەراني‌تەشکیلات خواهیشتیان کرد نامەیەک بۆ عیسمەت دەری بنووسم بەلکو ئەوانە دەرباز بکا. نامەیەکم بۆ نووسی و داوام لێکرد کە بێتە گوندی (کوڕانە) چاوم پێی بکەوێ.لە وەلاْمدا نووسیبوویەوە : ناتوانم لە سێرۆ دەرکەوم. داوای کردبوو من بچم . بیرم کردەوە ، مەسەلەیەکی پێوەندی بەمنەوە نەبی، چیم لێداوە.بەبرادەرانم گوت:ئێوە لێرە بەرپرسی کاروباری حیزبن، خۆتان چاری مەسەلەکان بکەن و فیکریش بۆ من بکەنەوە کە تێپەڕم و بڕۆم.

گوتیان هیچمان لەدەست نایە، لە ماوانەوە تا دەگاتە سیلوانە پاسدار و جاشی ڕەشیدبەکی هەرکی گرتوویانە.لە وێشەوە تا دەگاتە دزە، بارزانی

گرتوویانە. گوتم ماشێنێکم بۆ پەیداکەن من بەنێو بارزانیاندا دەڕۆم خۆ نابێ‌هەر لێرە بمێنمەوە.

- نابێ، دەتگرن و تەقەت لێ دەکەن و ...هتد

- قەیناکا، با بمگرن، ئێوە ماشێنێکم بۆ پەیدا کەن ڕێگا لە ئەستۆی خۆم. دۆستێکی جوامێری حیزبیان هەبوو ناردیان ،،ناچەلیک وەک پیاوان بەسواری جێبێکی ساز و ئامادەوە پەیدابوو.ئامادەیی خۆی ڕاگەیاند. ئەمجار تەگبیر لە وەدەگرا کە چۆن لە ماوانە تێپەڕین کە جاش و پاسدار ڕێگایان گرتوە؟. گوتیان برادەرێکمان لە ماوانەیە، ڕەنگە شارەزابێ، بەلاّم براکەی جاشەو تفەنگی پێیە. گوتم قەیناکا. ڕاست دەچینە مالّی جاشەکە و دەلّێین بەڕێمانکە. بەخۆشیەوە موافەقەتیان کرد . ئەمجار ئەوانەی هاتبوون بەتورکیادا بچنە ئورروپا و حاسیە ببون، گوتیان دەبێ ئێمەش لە گەلّ خۆت بەری . لاموایە دوکتور ڕەشیدێکبوو خەلّکی بۆکان و کورێکبوو بەناوی کەمالّ نارنجۆکی لەدەستیدا تەقیبوو، عەلی بنیسیمچی ، بنیسیمیان لێ خەرا ببوو، یەکی دیکەش. ساز بووین بڕۆین، کاک ڕەحیمی محمدزادە گوتی نابێ بەتەنیا بڕۆی، منیش لەگەلّت دێم تا شنۆیە. زۆرم هەولّدا و گوتم تۆ مەیە با تووشی کێشە نەبی، من دەڕۆم و هەرچی بێ قەیناکا.بەهەلّوێستێکی گەلێک پیاوانە، قەبولّی نەکرد و لەگەلّمان سوار بوو، پێشمەرگەیەکیشی لە گەلّ خۆی هێنا. ئێوارەی ١٩٨١/٧/٣١ لە سەر خوای گەورە بەرەو شنۆ کەوتینەڕێ. تاریک داهاتبوو گەیشتینە گوندی (ماوانە)، مەکۆی جاش و پاسداران.چووینە بەر دەرکی برادەری ناسیاوی حیزب. دابەزین، کابرا پیاوانە بەخێر هاتنی کردین و لە پێشدا بێستانێکی لە بەر دەرکێ بوو، چوو خەیاری ناسک و فێنکی هێنان و دەستمانکرد بەخەیار خواردن. چوو براکەی بانگ کرد. برا هات، تفەنگێکی درێژ دەشانیدا ، گوتمان ڕێگا شارەزای و دەبێ لە

گوندیمان وەدەر خەی. کابرا دەیگوت : « ئەز جاشم، بەلام جاشێکە باشم. » گوتم تۆ جاش نی، تۆ مرۆڤێکی ولات پارێزی، مەبێژە ئەز جاشم. دێگوت : نا .. کاکە .. ئەز جاشم ،لێ جاشێکە باشم ».

بەکورتی، جاشی باش لەگەڵمان سوار بوو تا بە قاچاغە ڕێدا لە گوندی وەدەر خستین و چووینە سەر جادەی شنۆ ـ برادۆست.خوا حافیزی لێ کردین و گەڕایەوە. ئێمەش سوپاسمانکرد و ئێستاش هەر سوپاسی دەکەم.زۆر تێ نەپەڕیبووین، لە پڕ بارزانی دەنگیاندایین.ڕاوەستاین. یەکێ دانەتاشراوی تووڕە و تۆسن، هاتەپێش . بێ ئەوەی سڵاوێکیکا یا مەرحەبایەک دەستی پێکرد : دابەزن،.. چکارەن .. لایتەکان بمرێنن ، چاوی لە ژووری ماشین کرد، پێشمەرگەی بەتفەنگەوە دیت، شێت بوو، : ئەو تفەنگە چیە.. ئەو بێسیمە چیە؟ ناچار وەدەنگهاتم. گوتم : ئەو هەرا و گوڕەت لە چیە؟ ئێمە وا ویستاوین، ئەگەر پرسیارێکت هەیە فەرموو ،بپرسە تا جوابت دەینەوە.من فلانکەسێکم، لە ئورووپاوەدێم و دەچمە کن مەسعودی ئەوانەش هەڤاڵی منن. ئێمە دانابەزین. تۆش هەرا هەرا مەکەو بچو بپرسە.بێژە کەریمی حسامی لە ئورووپاوە هاتوە. کابرا تۆزی هاتەوە سەر خۆ، ڕایکرد ، دوورتر لە ئێمە دیار بوو، تەلەفوونیان هەیە، دوای چەند دەقیقە هاتەوە سەر و دەوری ماشێنەکەی دەداو شتی بێجێی دەپرسی و ئێمەش وەلامێکمان نەدەدایەوە. زۆری پێنەچوو، ماشێنێک هات، وەپێشمان کەوت بۆ سیلوانا. لە بەر دەرگای ژوورێک ڕاوەستاو دابەزین، دیاربوو ژووری میوانانە.عبدالمهیمن هات، بەخێر هاتنی کردین، نان و چایان ساز کرد. هاو سەفەرەکانم جار وبار سرتو خورتێکیان دەکرد و تۆزێک وە نیگەران دەچوون.دوای نان و چا بە عبدالمهیمن ـ م گوت : من لە بەر دیتنی کاک مەسعود بێرەدا هاتم، دەمەوێ چاوم بەکاک مەسعود بکەوێ و بڕۆین. شەو درنگەو دەبێ،

تێپەڕین.

– بۆ کوێ دەڕۆن، نە میوانی ئێمەن؟

– بەڵێ میوانین، بەڵام هەر ئەوەندە تا کاک مەسعود دەبینم، ئەخۆ دەبێ بڕۆم و دەچمەوە دەفتەری سیاسی. تۆزێک داما، پاشان گوتی : بچم بزانم .

ئەو رۆژی. هەستم کرد نیگەرانی برادەران پتر بوو.یەکیان گوتی،: دە رچوو، تازە پێوە بووین.چوون وگە ڕانەوەی سەعاتێکی خایاند، بەڵام بۆ ئێمە بەمانگ حیساب بوو.

عبدالمهیمن هاتەوە،گوتی: « مەسعودم نەدیتەوە. ئەگەر دەخوازی ئەندامانی مەکتەبی سیاسی وا لە واژانن، تا بنێرم بێن و لەگەڵ ئەوان نسە بکە. »گوتم : من بۆ دیتنی مەسعود هاتبووم، ئەگەر ئە و ناخوازێ ـن ببینێ، منیش کارم بە مەکتەبی سیاسی نیە » من شارەزای دەسەلاتی ـەکتەبی سیاسی پارتی بووم و دەمزانی ئەوانیش هەر وەک ئەندامانی دەفتەری سیاسی و کومیتەی ناوەندی حیزبی دیموکرات هەر ناویان هەیە و هیچیتر. هەوڵی من ئەوەبوو بەڵکوو بتوانم تۆزێک بە دستی کاک مەسعود ئە و گڕ و کفی مەترسی شەری براکوژی کەم کەمەوە.بەداخەوە نەکرا. گەلێک لە دڵم گرانهات. وەختێک مەسعود پێویستی بەدیتنی من هەبوو، داوای کرد، من لە بەر خاتری ئەو چوومە قبرس، بەڵام ئێستا من هاتوومە ماڵی ئە و نەیویست خۆم پێ نیشاندا. دە ڕسێکی پچووکیش نەبوو.گوتم کە وایە ماشێنێکمان لەگەڵ بنێرە تا لە دزە تێ دەپەڕین. ئەوەشم لێ زیادکرد و گوتم : کاک رەحیم بیرەدا دەگەڕێتەوە ، تکایە رابکە بە سلامەتی تێپەڕێ، بۆ برادۆست.دیارە ئەوانیش پێیان ناخۆشبوو، ئەوان لە ئورووپا ئارد بوویان کە من واز لەحیزبی دیموکرات بێنە و بە ڕێگای جەیتی تاقمی حەوت کەسەدا ...

ماشێنێکی پڕ لە بارزانی کەوتە پێشمان و بەرەو دزە.کە لە سیلوانا دەردەکەوتین تووشی دەستەی بارزانیان بووین کە ئە فسە ری ئێرانی مەشقیان پێدەکردن.لە دزە تێ نەپەڕیبووین، ماشێنەکە گەڕایەوە. کەمێکی تر ڕۆیشتین، بارزانی لێمان ڕاپەڕین.ڕاپانگرتین. یەکی پیرە هاتەپێش و هەر چەندی گوتمان لە سیلوانە بووین و تا ئێرە بارزانیمان لە گەڵ هاتوون، فایدەی نەبوو. خوداو راستان یەکی گەنج هات، تێمگەیاند و گوتم لە سەر ڕێگا سەیتەرە هەیە. ئەگەر بارزانیمان لەگەڵ نەهاتوون، چۆن گەیشتووینە ئێرە.ماڵی ئاوەدان بێ، چوو بەزمانی خۆیان پیرەی حاڵیکرد و ڕێگایان بەردا. لە دزە تێپەڕین، پێشمەرگەی حیزب لە سەر ڕێگا بوون، شەو در نگ گە یشتینە شنۆیە. چووینە هوتێلێک . بەیانی کاک ڕەحیم کیر نەبوو گەڕایەوە. پاشان بیستمەوە سەرەڕای ئەوەی قەولیان بەمندابوو، کاک ڕەحیمیان گەلێک ئەزیەت دابوو. سێ ڕۆژ لە شنۆیە مامەوە. کاک حوسێنی مەدەنی بەر پرسی تەشکیلات بوو. پێشنیاری کرد کە ڕۆژی جێژنی ڕەمەزانێ لە مزگەوتی جامیعە لە سەر باوودۆخی وڵات و دەنگدانەوەی خەباتی حیزبی دیموکرات قسەبکەم.مزگەوت پڕبوو لە خەڵک، بەدرێژی ئەوەندەی توانیم لە هەموو بارێکەوە قسەم کرد.ڕۆژی پێشتر فەرماندەی سوپای پاسداران لە مەهاباد لە وتارێکدا گوتبووی « کەریمی حسامی وازی لە حیزبی دیموکرات هێناوەو چۆتەوە ئورووپا » من لە وتارەکەمدا گوتم : با فەرماندەی سوپای پاسداوان بزانێ کە وا لە مزگەوتی شاری شنۆلە سەر سیاسەتی دژی ئیسلامی ئەوان خەڵک روون دەکەمەوە. چووم لە دوکانێک لیباسی کوردی بۆ ڕێبەر بکڕم. پارەیان لێ وەر نەگرتم، چووم بەدروومدا ، پارەیان وەر نەگرت. ڕێبە ر سەری سوڕ مابوو، دەیگوت : ئەز نەزانم عەلاقاتێ تە لەگەڵ ئەم خە ڵکە چوایە.ڕۆژێک چوومە چەپەراوێ، سەردانی مەلا

زەینەڵی کە تازە لە زیندان ئازاد کرابوو.ڕۆژێکیان چووەمە تەشکیلاتی حیزب سەردانی کاک حوسێنی مەدەنی، دانیشتبووین ، پیاوێک هاتەژوور و بەکاک حوسێنی گوت : خودا هەڵناگرێ، تاردووتانە، لە خەڵک پرسیارو کردوە. من ئەو مێشەم لە پێش شۆرشی ئێراندا لە ئادراغا کریوە، پارەکەم داوە.ئێستا کومیتەی حیزبی دەستی بەسەر داگرتوە، بەم بیانوە کە مڵکی ئاغایە، تۆش نامەت نووسیوە جواب نادەنەوە.من لەو ماوەیەدا هەر وا سەیرم دەکرد. کە لە قسەکانی بۆوە، گوتم : ئەرێ برا تۆ مەحمودی هەمزە ئاشەوانی نی؟

بەرێ وەڵا ڕاست هەوم، بۆیە حیزب ئاوا پاداشم دەداتەوە.ئیتر ڕابووم، غارمدایەو دەستم کردە ملی و بێ ئیختیار گریانم هات. هەمزە ئاشەوانی باوکی دوای ڕوخانی کۆماری کوردستان یەکێ لە هەوەڵین ئە ندامانی کومیتەی زیندووکردنەوەی حیزبی دێموکرات بوو لە مەڵبەندی سندوسی.لەسەر تێکۆشانی حیزبی لە گوندی دەر کرابوو، کەوتبوە زیندانێ. ئەو مەحمودە تازە دەگەیشتێ، بۆ شنۆ ولاجان و سندوس، پەیکی حیزبی بوو، شەو ورۆژ ڕانەدەوەستا.ئێستا ش کەس تەیدەناسی و ناهەقیشیان لێ دەکرد.سەر بردەی مەحمودم بۆ کاک حوسێن باسکرد، گورج نامەیەکی دیکەی بۆ نووسی. من سەفەرم کرد و نازانم دایانەوە یان بەزۆر لیچیانەوەکرد.

## بەرەو دە فتەری سیاسی .

ڕۆژی ١٩٨١/٨/٣ برادەرانی تەشکیلاتی شنۆ پێشمەرگەو ماشێنیان بۆ ئامادە کردم و بە جەڵدیان و گردەسور دا، هاتینەوە خاڵدار و بە بانوی دریکەو لاوێندا، سەعاتی ٩ی شەو گەیشتینە ترکەشی. لە نیزیک گوندی خەرمانێک دیار بوو، لاماندو پرسیم : کێبەتان بە ماڵی برایمی مام وەتمانی دەزانن؟( ئەو مام وەتمانە لەبەرگی یێکەمی بیرەوەریەکانمدا باسم کردوە.) یەکیان گوتی :« ئەوەخەرمانی ئەوانەو منیش کوڕی وانم. سوارم کردو چووینە ماڵی برایمی مام وەتمانی.وای لەو خۆشی و شادیەی لەو کاتەدا بۆ هەموومان ڕوویدا. دوای ٣٠ ساڵ لێک هەڵبڕان و بێ خەبەری لە پڕ لە ماڵە دۆست و برادەرێکی خۆشەویستت وەژوور کەوی.ماڵ وەک جاران قەڵەباڵغ و گەورەتریش بوو. منداڵ گەورە ببوون و ژنیان هێنابوو، مێردیان کرد بوو. زۆریان بەحاڵ دەیانناسیمەوە. هێندێک هەر لە دایکو باوکیان ناویان بیستبووم. لەو ماڵە گەورەیەدا تەنیا (ئایشێ) نەمابوو کە لەکاتی خۆیدا وەک ئەستێرەیەک لەو ماڵەدا دەدرەوشا.دابی ڕەسەنی کوردەواری، دەستکرا بە ڕامووسانی دەست و باسکان. نان و خواتێکی مەنگوڕانە ساز کرا. برادەرانی لەگەڵم بوون لەم هەڵوێست و میوانداریە واقیان وڕمابوو.لای بەیانی توانیمان چاوێک گەرم بکەین. ڕۆژی دوایی هەر چەند کاک برایم هەوڵیدا کە بمێنمەوە و بحەسێمەوە، گیر نەبووم هاتمە میراوێ، لە کن سەعیدی سوڵتانیان لامدا. ڕە سوی نادری هاتەلام، یەک دوو حەیرانی بۆ گوتم نووسیمنەوە.ملازم تاهیر وشەریف لە حیزبی سوسیالیستی کوردستانی عیراق هاتنەلام و باسی بارودۆخی لای

خۆیانیان کرد.دوای نیوە ڕۆ سوار بووم ڕۆژی ٩٨١/٨/٤ لە دۆڵی پشتی شیوەجۆ کە بە(دوڵی دیموکرات) ناسرا بوو،گەیشتمەوە دەفتەری سیاسی.

لەم دۆڵە سەوز و جوان و دارستانەدا، دەفتەری سیاسی و چاپەمەنی و کادری رادیۆ و میوانخانە کۆ کرا بوونەوەو لە باری خانو وپە سیو وجێ وڕێ وەزعێکی ڕێکو پێکیان ساز کرد بوو.لەو خانوانەی نیزیک دەفتەر لەگەڵ دوو براداری دیکە جێگایان بۆ دیاری کردم.هە وەڵ کارم ئەوەبوو راپۆرتی سەفەری خۆم وەک چوونی لوبنان و دیتنی یاسرعەرە فات و ڕێبەرانی تری فەلەستینی و سەفەری سوریا و دیتنی کابرای سوریا وڕتو وێژ لەگەڵ گۆڤارەکانی لوبنان و لادانی کن مەسعود بارزانی، بۆ دەفتەری سیاسی بنووسم.پاشان لە نامەیەکی جیاوازدا ، باسی زیندانی بەعس وبەڵێنی هاوکاری و دەقی ئەوەی بۆ ئەبو ئەحمەد م نووسیبوو، هێنامە سەر کاغەزو داوام کرد بەر لە هەموو شت، دەفتەری سیاسی دەبێ هەڵوێست و بڕیاری خۆی لە سەر ئەم نووسینەم پێ ڕابگەیێنێ.چوومە لای دوکتورو نامەکانم دایە و گوتم تکایە لە پێشدا لە سەر ئەم نووسراوەیە نەزەر بدەن.من دەمەوێ سەفەرێکی لای شامات و مەهاباد بکەم. دوای بڕیار و هەڵوێستی دەفتەری سیاسی لە سەر ئەم نووسراوەیە، بڕیاری کار کردن دەدەم .

دوکتور گوتی: جارێ بحەسێوە. تا دوای ٢٥ی گەلاوێژ سەفەر مەکە.جارێ ڕۆژانە وتارێک بۆ رادیۆ بنووسە. برادەران ڕەخنەیان هەیە، بزانین دەڵێن چی؟.ئەوەی سەر نجی ڕاکێشنام ، (یاسای سزادانی گشتی)بوو. ئەندامانی کومیسیونی بازرەسی و یەکدوو برادەری تر کە پێشتر لە بواری حقوقی و داد پەروەریدا کاریان کرد بوو، هێندێ مادەو بەند و خاڵی (قانونی مجازاتی عمومی)زەمانی شایان کرد بوو بەکوردی

و لەگەڵ پاش و پێشکردنی وشەو زلراو و کەم و زیاد کردنیان ، کۆیان، کرد بۆوەو بەناوی (یاسای سزادانی گشتی) بلاویان کرد بووەو خەڵکیان پێ سزا دەدا و دەفتەری سیاسیش پەسندی کرد بوو.دوای خوێندنەوەی بە بۆچوونی خۆم پێم وابوو ئەم یاسایە بۆ دەوڵەتێکی سەقامگرتوو دەبێ، نەک بۆ حیزبێکی دەفتەر بە

کۆڵ و هەر رۆژە لە دۆڵێک و لە بن رەوەزە بەردیک. سزای ١٠ ساڵ و ٧ساڵ و ٣ساڵیان بۆ تاوانبار دانابوو، لە کاتێکا حیزب خۆی نەیدەتوانی چەند مانگ لە شوێنێک سەقامگرتوو بێ.من لام وابوو سزادان لە حیزبێکی شۆرشگێڕ و لە کاتی شۆرش و شەری چەکداریدا، دەبێ.بە گوێرەی تاوان تەمبێ و رێنوێنی و جەریمەی نەغدی وئەگەر گەیشتە خەیانەتیش ئیعدامی خێرا و گورج بێ. ناندان بە حەپسی و گواستنەوەی بۆ کەلێن و قوژبنی چیار دۆڵ و موخاریجی پارێزگاریان، تەنیا دەبێتە بارێکی گران لە سەر شانی حیزب.لەم جەغز و چوار چێوە بۆ چوونەدا، وتارێکم نووسی و دام بە دو کتور سەعید کە بەر پرسی رادیۆ وچاپەمەنی و هەموو شتێک بوو.رۆژی دوایە گوتی:وتارەکە شتی راست و بابەتی زۆر تێدایە. دوکتوریش تەماشای کرد، بەڵام چونکە تازە پەسند کراوە و بلاو کراوەتەوە، لە سەر را دیۆ رەخنەی لێ بگیرێ، ئەویش بەو شێوەیە کە هیچت بۆ نەهێشتۆتەوە، مەسلەحەت نیە.واتە.ئەوەی پەسند کرا ئەگەر چەوتیەکەشی دەربچێ،نابێ هەڵەی راست بکرێتەوە.!!

شەوی ١٠/٨/٩٨١ داوایان لێکردم لە هۆڵی میوانداری لە سە ر دەنگدانەوەی بارو دۆخی کوردستان و خەباتی حیزب باسێک بکەم . دوکتور قاسملوش هاتبوو،دانیشتنێکی سەرنج راکێش بوو. شەو لەگەڵ سوڵتاناغای دۆستم پێکەوە بووین.

١٢/٨/٩٨١ کەماڵ بورکای، سکرتێری پارتی سوسیا لیستی

کوردستانی تورکیا هاتە دەفتەری سیاسی، شەو لای دوکتور بوو، بەیانی هاتەلای من، باسێکی گەرمی مەسەلەی کوردمان هێنا گۆڕێ، بیرو رامان لێک نیزیک بوو. ۹۸۱/۸/۱۳ دەستەیەک لە لاوانی لاجان و بەری پیرانان هاتبوونە دەفتەو. داوایانکرد لەگەڵ من دانیشن. بەدرێژی لە سەر ئەرکی لاوان و کار لە نێو گوندییەکان و خۆ فێر کردنیان باسم بۆ کردن. دوایە رەسمیان هەڵگرت. لای ئێوارێ کاک ئەمیری قازی هاتەلام. لە سەر وەزعی تەشکیلات و کاری چاپەمەنی و تەبلیغات و هەڵسوڕانی پێشمەرگە قسەمانکرد. کاک ئەمیر گوتی: « هەتا دوکتور قاسملو سکرتێری حیزب بێ، حیزبی ئێمە نایێتە حیزب. من لۆس بووم» ٢٥ی گەلاوێژ جێژنی دامەزرانی حیزب لە خواروی خانوەکان گیرا. خەڵکی گوندەکانی دەوروبەر تێکرا هاتبوون. رۆژی ۹۸۱/۸/۱۷ ماموستا مەلا رەحینی عەبباسی بۆ شایی ژنهێنانی وەسیمی کوری لێی گێڕا بوونەوە، لەگەڵ کاک نەبی قادری چوونە واوان.بێجگە لە خەڵکی گوندی و برادەرانی حیزبی، مەلایەکی زۆریش کۆ ببوونەوە.نیوە رۆ لە مزگەوتی واوان داوایان لێکردم لە سە ر باروودۆخی بزووتنەوەی کوردستان و دەنگدانەوەی لە دەرەوەی وڵات باسێک بکەم. وتارەکەم پێشوازیەکی گەرمی لێکرا.بە ماموستا مەلا رەحیم. م گوت: تەبلیغاتێکی زۆر بۆ چوونی حەج دەستپێکراوە، کوردەکەش خۆی بۆ دەکوتێ.دڵێم لە مزگەوت بەتایبەت کە ئەو مەلایانەش تەشریفیان هەیە، باسێک لە سەر نەچوونی حەج لە بارودۆخی ئێستای کوردستاندا ، دابەزرێنم.چونکە پێموایە لە بارودۆخی ئێستای کوردستاندا کورد حەجی لە.سەر نیە. ماموستا گوتی : قسەکەت راستە. بەڵام ئەگەر من باسێکی ئاوا بکەم تەئسیری پتر دەبێ، چونکە مەلام. فەرمایشاەکەی ڕاست بوو، بەڵام بەداخەوە، خستیە پشت گوێ و باسی نەکرد.زەماوەندێکی گەورەشمان ساز کرد، بەڵام

مامۆستا نەیهێشت ڕەشبەڵەک بگرێ و خودا گیری ئەو هەموو کیژ و ژنانە بوو کە ڕاوەستا بوون و بزگەڕێک ڕەشبەڵە ک دڵەکوتەیا نبوو .
ڕۆژی دوایی لەگەڵ چەند برادەرێک چووینە میراوێ، لەگەڕانەوەدا، لە واوان چووینە قەراخ ڕووبار و بەخواردنەوەو کەبابی مەزرایە تۆڵەی ڕەشبەڵەکمان کردەوە.بۆ بەیانی کە دەهات بڕۆین چەند برادەرێکی حیزبی هاتن لە کاروباری حیزبی وتەشکیلاتی سکاڵایان هەبوو، گوتم کاکە، بۆ دەفتەری سیاسی بنووسن، من چکارە نیم.
ڕۆژی ١٩/٨/٩٨١ لە دەفتەری سیاسی بانگیانکردم بۆ کۆبوونەوەو باسی سەفەری خۆم.کە چووم گوتم بەر لەهەموو شت دەمەوێ بڕیار و بیروڕای دەفتەری سیاسی لە سە ر ئەم نامەیە بزانم کە بۆم نووسیون و بۆ بەعسیشم نووسیوە و لە زیندان داوەمە. دوکتور قاسملو گوتی : من لە لایەن دەفتەری سیاسیەوە ڕادەگەیێنم کە ئەو نووسراوەی لە زیندان نووسیوتە، هیچ تەئسیری نیەو جێگای باس نیەو بە هیچی دەزانین. »
بەدرێژی باسی سەفەری خۆم کرد. گوتم: لە هەموو شوێنێ بەناوی شەخسی قسەم کردوەو گوتومە لە لایەن حیزبەوە قسەناکەم و لە حیزبی دیموکراتدا هیچ مەسئولیەتێکم نیە.دوکتور قسەکانی مستەفای شەڵماشی دووپات کردەوە، گوتی: ئە و کارەت بۆ شکانی حیزب کردوە. دوکتور سەعید بدڵ ڕەخنەی ئەوەبوو کە پارەی سەفەرم لە عەزیزی مامڵێ وەر گرتوە.گوتی: « نازانم بەچ هەقێک تۆ چوار هەزار مارک لە نوێنەری حیزب وەردەگری؟ »
گوتم بەو هەقەی کە ٤٠ ساڵە لەو ڕێگایەدا فیدا کاری دەکەم. هەقی خۆمە بۆ خەرجی سەفەری حیزبی ١٠هەزار مارکیش وەرگرم. بەڵام تۆ بەچ هەقێک حیساب لە من دەکێشی؟ من دەبێ بپرسم ئە وانەی تا دوێنێ لە ڕێژیمی شادا خزمەتیان کردوەو هاتوونە سەر حازری، بەچ هەقێک لە

پاریس راست و چەپ بێی دادەدەن؟»

دوکتور قاسملو گوتی : ئەوە جێی باس نیە. ئێمە بڕیارمانداوە کە مودیریەتی رادیۆ وەئەستۆ بگری.دیارە برادەرێکی دەفتەری سیاسی بەر پرسی سیاسی رادیۆ دەبێ.گوتم جارێ من پرسیارم هەیە. من بە ر پرسی تەشکیلاتی مەهاباد بروم. بەئیجازە سەفەرم کردوە. برادەرێکیش لە جێی من دیاریکراوە، تا دەگەڕێمەوە. نازانم چۆن پاشملەی من کونفرانس دەبەستن و یەکیتر دەگەن بە بەر پرسی تەشکیلات؟ کەی ئە وە شێوەی دیموکراسی نێو حیزبیە؟ گوتیان تۆ زۆرت پێچوە. گوتم لە کام رێکخراوی تر کونفرانسی حیزبی گیراوە،؟ دوکتور قاسملو گوتی: مەسەلەی تەبلیغات بۆ ئێمە گرنگە، تۆش لە کا ری رادیۆ ونووسیندا دەستت هەیە، برادەران وایانداناوە ئە و کارە بکەی.

گوتم من لەبەر کار ڕانآکەم. لە گەڵ پاراستنی رەخنەو ئیعترازم لە و کارە نا حیزبیەی ئێوە، کا ری رادیۆ قەبوڵ دەکەم. ئێستا دەمەو ێ سەفەرێکی لای بۆکان و مەهاباد بکەم، کە گەرامەوە دەست بە کار دەکەم. رۆژی ٩٨١/٨/٢١ رێبەری هاو سەفەرم دەگەڕاوە بۆ لوبنان. چوارهەزار تمەنم بۆ وەر گرت و نامەم بۆ ماڵەوە نووسی و بەرێم کرد. رۆژی دوایی لە گەڵ برادەرێک بەرەو بۆکان کەوتینەرێ. لە کیتکە لای پشمەرگەکان لاماندا. برادەرانی بانە بریندار یان هێنا بوون بۆ بیمارستانی حیزب لە قالوێ.چەند رەسمێکیان هەلگرت، دوای نیوەرۆ کەوتینەرێو نەگەیشتبووینە گوندی گلێنان، دیتمان برینداریک لە تەنیشت ڕێکا بە تەنیا کەوتوە. هاتمەخوار، پرسیم چیە بۆلێرە تەنیای؟.گوتی: خەلکی گەنەدارم. پاسدار تەقەیان لێ کردوم و بریندار بووم. کابرایەک پیکابی هەبوو، قەرار بوو بمگەیێنێتە بۆکانێ، پاشان لیرە دایناوم و رۆیشت ولێرە ماومەوە. ناو ونیشانی کابراو رەنگی ماشینەکەم پرسی و سوارم کرد. پێم

لە بنزینی نا، بەڵکو بگەمە کابرا. لەگڵێنان لە بەر دەرکی سۆفی ساڵح ناوێک راوەستام. پرسیاری ما شێن و پێشمەرگەم کرد، پێشمەرگە لە گوندی نەبوون، ماشێنیان پەیدا کرد و بریندارەکەم نارده قالوێ، نە خۆشخانەی حیزب. لە ماڵی سۆفی چایێکم خواردەوە و شەو چوومە بۆکان میوانی کاک سەلیمی باپانزادەبووم. سبەی چوومە تەشکیلاتی حیزب و دوای نیوە ڕۆ چوومە تالاو، لای دۆستی بەڕێزم سوڵتاناغا.
ڕۆژی ٩٨١/٨/٢٥ لە بازاری ئە میراباد، رەحیم کەپەکەندی ماشێن و پێشمەرگە ی ساز کرد و بۆ تەشکیلاتی مەهاباد. لە شیلاناوێ لامدا سەرێکی ماموستا هێمنی بدەم، پێشمەرگەکان پێیان سەیر بوو. گوتیان چۆن دەچیە کن هێمنی خۆ دژی حیزبە. گوتم نە و دژی حیزب نیە، دانیشتوە، حەیف نیە بیرەدا تێپە ڕین و سەری هێمن نەدەین. کە چووینە بەو دەرگا، ماڵێکی چۆل و هۆل.گوتیان چوونەتە مەهاباد. ڕۆیشتم بۆ تەشکیلاتی مەهاباد. لە سەرەوەی کۆنەدێ، خیوەتیان هەڵدابوو.شەوێک لای وان مامەوە. رۆژی دوایی دەگەڵ کاک عومەر و کاک مستەفای قازی هاتمەوە بۆ دۆڵی دیموکرات. تفەنگێکی کەلاشنیکۆفم لای کاک قاسمی قازی بەجێ هێشتبوو، وەرم گرتەوەو هێنامەوە لای خۆم.
ڕۆژی٩٨١/٨/٢٧ ئەبو سەرباز و مەلا محمدی جوانڕۆیی هاتن، باسی شەڕی یەکێتی و سوسیالیستیانکرد کە چەند کەسیان لێک کوشتوە. نامەیەکم بۆ کاک عەزیز محمد تووسی و بۆم روونکردەوە کە بۆ ئەوەی لەزیندانی بەعس بەفیرۆیی نەچم و خۆم نەجات بدەم، بەنووسین بەڵێنی هاوکاریم پێداون. لە بەر ئەوەی خۆم بەدۆست و بەجێگای بڕوای حیزبی ئێوە دەزانم، پێم باشبوو ئاگادارتان بکەم و خۆشتان لەبریار رهەڵوێستگرتن دا خاوەن دەسەلاتن.»
ڕۆژی ٩٨١/٨/٢٩ دوکتور قاسملو لەگەڵ دوکتور سەعید بدل

برادەرانی كارمەندی ڕادیۆ یان كۆ كردەوەو منیان بەبەرپرسی بڵاو كردنەوەی وتارەكانی رادیۆ ناساند. دەبوایە چەشنی بڵاو كردنەوەی وتارەكان، كێ بیانخوێنێتەوەو پاش و پێشكردنیان سەر پەرشتی بكەم.مەبەستی بنەڕەتی دەفتەری سیاسی، باشترە بڵێم مەبەستی دوكتور قاسملو لەو كارە دوور خستنەوەی من بوو لە كار وباری تەشكیلاتی و لە دم تێوەردانی سیاسی و لەنیزیكی خەڵك. بیانوێكی بێ بەڵگەش نەبوو. رادیۆ یەكێ لە بنكە هەرە نهێنیەكانی حیزب بوو. نەدەكرا هەموو كەس بە جێگا و شوێنی بزانێ. ئەوانەی لە رادیۆ كار دەكەن دەبێ لە خەڵك نەدیار بن. هەر بۆیەش چەند جار برادە رو كادری حیزبی و ناسیاری نیزیك لە ڕێگای دوورەوە دەهاتنەلام، پێیان دەگوتن لێرە نیە، لە سەفەر دایە. پاشان نامەیان بۆ دەنووسیم كە هاتین چاومان پێت بكەوێ، كارمان هەبوو، لەوێ نەبووی.!! بۆ قایمكاری پتر، دوور لەدەفتەر و لەمیوانخانە ولە هاتوچۆی خەڵك ژوورێكیان دابوومێ، تەلەفوونیشیان هێنابوو . بێجگە لە پۆلای نانوازادە مامەقالەی دەبباغی و كاك ئەبوبەكری هیدایە تیش، دراوسێی ئەملاو لامبوون.

من بەقەولی مەلاعەولای حاجی سمایلی سەربردەی خۆم دەنووسمەوە، بۆ روونبوونەوەی ئەم باسە چەند نموونە دێنمەوە و دەچمەوە سەر ڕێچكەی باسەكەم.میرزا عەولای نیشكۆلان مەسئولی بنكەی سەر ڕێگای پێش دەفتەری سیاسی بوو. یەكدوو نووسراوەی منی خوێند بووتەوە، دەهات كتێبم دەدایەو جار وبار چایەكێشی لە لام دەخواردەوە.ڕۆژێكی باسی كوێخا ئەمەری قەلەڕەشەم بۆ گێڕاوە، (ئۆمەر پاشا) كە چۆن دژی حكومەتی عەجەم ڕاپەڕیوە. گوتی بەخۆم دەگەینەیەك.بڕیارماندا ڕۆژێك پێكەوە بچین سەری بدەین. من دەمویست هێندێ پرسیاری لێ بكەم. ڕۆژێك میرزا عەولا هات، دانیشتین گوتی : دەمەوێ شتێكت لێ

بپرسم، بەینی خەمان بێ. بۆ چێ پێیانگوتوم، ئەگەر کەسێک هاتە لای ، کاک کەریم ، هەتا بەدەفتەر نەڵێی ڕێگای مەدە. بێتەسەری». گوتم باشترە لەدەفتەر بپرسی.ئەمە شێوەکار و سیاسەتی ئەم حیزبەیە.ئەوان خەڵک ناناسن، ئاگایان لە رابردووی حیزب و تێکۆشانی خەڵک نیە . زۆر گوێ مەدەیە، هەر کە س هات و ویستی من ببینێ، تەلەفوونم بۆ بکە، دێمە خوارێ دەیبینم.

ڕۆژێک میرزا عەولا تەلەفونی کرد گوتی: برادەرێک هاتوە دەیەوێ بێتە کن تۆ، بەناوی (هەمزەی عەلی حاجی)بەکاک سەعیدم گوتوە، گوتوویە بزانە چی دەوێ، بانەیەتەسە رێ. تەلەفونم کرد بۆ دوکتور سەعید گوتم :« ئەو برادەرە یەکێک لە تێکۆشەرانی ساڵە کانی پەنجایە. لە سەر تێکۆشانی حیزب لە خەلیفەلیان دەرکراوە.دوای ڕوخانی ڕێژیم لە جەڵدیان یەکێ لە تێکۆشەرانی حیزب بوە. کوری لە سابڵاغ شەهید کراوە، ئێستا هاتۆتە دەفتەری سیاسی ڕێگای نادەن بێتە سەرێ.ئەوە چ سیاسیە تێکە. ؟گوتی تەلەفونی لێ بکە، با بێتەلات. میرزا عەولا کاک هەمزەی لەگەڵ پێشمەرگەیەک نارده لام.کە چاوم پێ کەوت، زۆر نارەحە تبووم. بیرم لەوە کردەوە کە ئەم خەڵکە فیداکارە کەوتۆتە بە ر دەستی کێ و چۆن پاداشیان دەدەنەوە. کاک هەمزە کوری شەهیدکرا بوو، شەش مانگ بو پارەی شە هیدانیان نەدابوو بەژن و منداڵی شەهیدەکە .

نموونە ی دووەم.نامەیەکی کاک مەلا محەمەدی عوسمانیە، هاتۆتە دەفتەر، بەڵام ڕێگەی نەدراوە بێتە لام. مەلا محەمەدی عوسمانی دەنووسێ:«زۆر بەرێز کاک کەریمی حسامی سڵاوێکی پچوکانە پێش کەش بەئێوەی تێکۆشەر. هیوام وایە لە ش ساغ و بێ بەلا بی. چەند ڕۆژێکە لێرە ماوینەوە کارمان هەیە.بەدڵ حەز دەکەم چاوم پێتان بکەوێ، بەڵام کار هەیەو ناکرێ.ئەگەر کارێکە ئەمرێک هەبێ بۆ ناوچەی ئەغەدە

ئامادەم.زۆرم پێ خۆشبوو کاک دوکتور خەلیقیشم دیتبایە، بەرەک گوێمان لە قسەی خۆشی ئێوە بایە. قەرار بوو لەگەڵ برادەرێک بێین بۆ لاتان، دوراودورر سلاوتان لێ دەکەین. لە دواییدا سلاوی دوو بارە.! پچوکتان محەمەدی عوسمانی»

نمونەی سێیەم : لە وەتی سەید حەسەنی هاشمیم ناسیوە، خۆشم ویستوە، ئیرادەتم هەبوە، لام وایە ئەگەر خوای تەعالا مەلائیکەتی لە سەر زەوی دروست کردبان، یەکیان کاک سەید حەسەن دەبوو.لەو جیاو کەژە زۆر پێکەوە دەبووینو دەچووین پنگەر کیار گزلمان کۆ دەکردەوە دەمانخوارد. یە کجاریشمان باسی سیا سەت نەدەکرد.ئەو مشاوری کومیتەی ناوەندی بوو، منیش ئەندامێکی سادە.تازە باسی سیاسەتیش قایدەی نەبوو.ئەو هەناوی بۆ کوردایەتی رەشببوو، بەلام بەقەولی ماموستا مەلا حوسێنی مەجدی هەر گوێ بوو، زمان نەبوو.منیش زمانبووم و گوێ نەبووم . قسەی خۆشمان دەکرد و جارویار لەلای من لێو تەر کردنێکیش وەگیر دەکەوت لە سایەی دۆست و برادەری دلسۆزمەوە فەتاحی کاویان‌کە بەر پرسی کومیسیونی بازرەسی بوو، سەید حە سەنی پاکی راستی دلسۆزی هەناو سوتاوی خستە بەر رەخنەو پەلامار کە هاتوو چۆی کەریمی حسامی دەکا و مێشکی تێک دەچێ.! جاسەیر ئەوە بوو ئەگەر ئەوە کردەوەو ئاکاری پاشملەی هێندێکیان بوو، بەرەو روو لە زمانلووسیدا دەستی عەجەمانیان لە پشتەوە دەبەست. نمونەی چوارەم نامەی کاک سدیقی فەروخی‌یە کە ٩٨٢/٢/٢٥ .لە دەفتەر بوە ، پێیان گوتوە لێرە نیە . ئەوەش نامەی کاک سدیقی فەروخی‌یە یەکی لە کادرە باش و تێکۆشەرەکانی حیزبی دێموکرات بوو.: « بۆ گەورەو بەرێزم کاک کەریمی حسامی پێشکێش بێت. هاورێ لە گەڵ جوانترین سلاوی شۆرشگێرانە هیوام سەرکەوتنی جەنابتە لە ستراتیژی درێژ خایەندا. بە رێز

جێگای داخە کە لەگەرانەوەمدا بەخزمەت نەگەیشتم و نازانم بۆ کام گوند سەفەرت کرد؟ بۆ ئاگاداریت : ئەمن بەهۆی چەند گیروگرفتێک هاتمە سەر ئەو بڕوایە کە ئیستعفا بدەم و زۆر دەرگیر بووم لە گەڵ دوکتور سەعید و پا ش .۲ ساڵ خەبات و تێکۆشان، .۲ ساڵ ژیانی دژوار و دەر بەدەری ، پاش هەزاران کەندو کۆسپ تاوانباریان کردم بە بەرتیل خۆری حکومەتی عیراق. زۆر عاقڵ بووم لەوە زیاتر توانام نەماوە. ئیتر هاتمە سەر ئەو باوەڕە کە خزمەت بەژن و منداڵی خۆم بکەم باشترە لە وەی من کوێرەوەری بچێژم و جەنابی سەعید بەدەڵیش ملی پێ ئەستور بکا لە شورای نیشتمانی . باش ئاقڵ بووم و قەراری تیهایی خۆم داوە . ڕەنگە زوریشت پێ ناخۆشبێ چونکە بە پاشە کشەی لە قەڵەم دەدەی. ئەمما راستی ئەوەیە کە ئیتر بۆ من جێگایەک لە حیزبدا نەماوە. بە فەرزی مەحاڵ(خود موختاری) وەر گیرا . بینە موقایسەی بکە دوکتور سەعید دەبێتە چی ر من دەبمە چی؟ بە .۲ ساڵ بومە ئەندامی کومیتەی شارستان . بە .٦ ساڵیش جێگری کومیتەی ناوەندی . ئەو دور ڕەقەمە دەکاتە .۸ ساڵ . خۆ من بە هەزار گێرەو کێشە ۳٤ ساڵم تەواو کردوە. سەر و ریش و سمێڵم سپی بوە . کە واتە ( چوار پێنەم) بکەن باقی ساڵەکانی .۸ ناژیم. بەڵام دەمەوێ ئەوەت عەرز بکەم کە وەک ڕەفیقێکی پچوکت نامەم هەر بۆ بنووسی و فەرامۆشم نەکەی . من تا کۆتایی ژیانم هەر شاگردی تۆم و قەت فەرامۆشت ناکەم.» دڵسۆزت صدیقی فروخی ، ١٣٦١/١٢/٦.

ڕۆژی .۹۸۱/۸/۳ خەبەرمان بۆ هات کە لە مەرگەوەر بارزانی چوونە سە ر بنکەیەکی پێشمەرگەی حیزب ، لە پێشدا گوتویانە میوانین، کە چوونە لایان، دەرفەتیان لێ هێناون و هەر هەشتیان کوشتوون. خەبەرەکەمان لە رادیۆ بڵاو کردەوە. چوومە کن دوکتور قاسملو گوتم:

لەگەڕانەوەدا بەناوچەی برادۆست و مەرگەوەڕدا هاتمەوە. هێزی پێشمەرگەی ئێمە نە لە باری چەندی و نە لە باری چۆنی توانای بەر بەرەکانی بارزانیانیان نیە. ئەوان خاوەنی ئەزمون و تاقیکردنەوەی شەڕی دوور ودرێژن. بەتایبەت ئیستا ئە رتەش و پاسداریش لەگەلیانن و لە باری چەک و قورخانەشەوە یارمەتیان دەدەن. بێجگە لەوەش نابێ حیزبی ئێمە هەڵەی برادەرانی کوردستانی عیراق دووپات کاتەوە و خۆمان تووشی شەری برا کوژی بکەین. لام وایە باشترە ڕێگای سازان بدۆزینەوە و خۆمان لەشەر بپارێزین. بە تایبە ت حاجی ئەحمەدی مشاوێری خۆشت زۆری پێداگرت کە ئەوەت لەگەڵباس بکەم.

دوکتور گوتی: ئەوە شەڕی براکوژی نیە. ئەوان ئیستا جاشن. لە هەورامانەوە پێشمەرگە دەنگ دەدە م ، بەیەکجاری لە ئێرانیان وەدەر دەنێم و دەو دیویان دەکەمەوە.»

گوتم ئەوەمان پێناکرێ، با لەگەڵ ئەوان تووشی شەڕ نەبین. باری قورسمان لە سەر شانە. دوکتور گوتی:« بەماموستام گوتوە ( مەبەست مەلا عەولایە) لە سەر خە یا نەتی ئەوانە بەمیللەتی کورد شتێک بنوسی، لە رادیۆ بلاوی دەکەینەوە، بەخەڵکیان دەناسێنین.»

باسەکەمان بێ نەتیجەبوو. لەو ڕۆژانەدا رەحمانی حاجی ئەحمەدي کە کرابوو بەدمە سئولی شیمال، ناوچەی بەجێ هێشتوەو گەڕاوەتەوە . لقی کەریم خاڵداریش پاشەکشەی کرد بوو، بەزەحمەت خۆی گەیاندبۆوە دەفتەری سیاسی . پێشمەرگە هیلاک و شەکەت لە دەشتایی بەر دەفتەر لێی کەوتوون. لە دەفتەری سیاسی خەتاکان دەخەنە سەر ئەستۆی رەحمانی حاجی ئەحمەدیکە گۆیا ڕایکردوە. رەحمان هاتە دیوەکەی من، نەخۆش بوو، چەند رۆژی پێچوو سەفەری کرد و دیار بوو نەیدەتوانی لەوێ بمێنێتەوە

ڕۆژی ۹۸۱/۹/۵ کاک سەعدی موهتەدی و کاک محەمەدی ئیلخانیزادە و سەید عومەری زەمبیلی ،سەبارەت بە کێشە ی حیزب و کۆمەڵە هاتبوونە دە فتەر. هاتنە دیوەکەی من. لە سەر ڕێگا دۆزینەوە بۆ کوردستانی ئازاد و سەربەخۆ باسێکی گەرم وشیرینمان هەبوو. پشتیوانیان لەوتارەکەی من کرد کە لە بیروت لەژمارە٥٤ی گۆڤاری ڕۆژهەڵات دا بڵاو کرا بۆوە. بەم بۆنەوە بێ جێ نابێ یادی نامەی دۆست و برای بەڕێزم کاک مەلا محمدی جوانڕۆیی بکەم کەبەبۆنەی بلاو بوونەوەی ئەم.وتارە، لە سوریاوە بۆی نارد بووم. مەلا محمد دوای ساخو سلامەتی نووسیبووی: « برا گیان ، لە گۆڤاری (ڕۆژهەڵات) ژمارە٥٤ ایاری ٨١ وتارەکەتم خویندەوە.گەلێکم پێ باشبوو ئەو دەروازەیەت کردەوە. بەلام دیارە چەند پێم خۆشبوو، ئەوەندەش کورت و تەسکبوو.واتا تێرت نەکرد بوو لە دە لائل و موادی بەهێز کردن. تەنها ئەو نووسراوەتم دیوە. هەرچەندە هاوڕێیان باسیان بۆ کردم کەندەوەت کردوە ونووسراوەی تریشت هەیە. بەلام نەک هەر من، زۆر کەس هەیە نەیاندیوە. لێرە ڕۆژهەلاتم دا بەزۆر شەخصیات و هێزەکان، زۆریان پێخۆشبوو. هەوڵمدا چەند لایەکیان لەم بابەتەوە شتێک بنووسن، نازانم سەرئەنجام بە کوێ دەگات. هاوڕێیان زۆر سلاوت لێ ئەکەن. زۆر کەسانی هێزەکان لێرەن، گەلێکیان ڕێزیان هەیە.گەلێکیان گلەییان زیادی کردوە لە سەر کابرای لای من و تۆ، وە ترسیان لێی هەیە.... »

بۆ ئاگاداری خۆێنەرانی بەڕێز بەشی دووەمی وتاری باسکراو لێرەدا بلاو دەکەمە. بەداخەوە برادەرانی گۆڤاری ڕۆژهەلات بەشی یێکەمی وتارەکەیان بۆ نەناردوومەوە کە ئەوان کردبوویان بەعەرەبی بۆ بلاو کردنەوە. بەقەولی زانای هەڵکەوتووی کورد کاک مەسعود محمد:« هەر شتە و هەر دیاردەو ڕووداوێک باری مێژوویی خۆی هەیە، جا با دوایە

پێنجەوانەشی دەربکەوێ.» ئەوەش دەقی وتارەکەیە:

«.... لە وتاری پێشوودا کە بە کورتی باسی کۆنگرەی ٢٦ی حیزبی کۆمونیستی یەکێتی سۆڤیەتی کرابوو داخی خۆمان لەوە دەر بریبوو کە بۆچی دەبێ نوێنەری نەتەوەیەکی .٢ملیۆنی لە رۆژهەلاتی نیزیک و ناوەراست لە دراوسێیەتی گەورەترین ولاتی سۆسیالیستی جیهان، نەتەوەیەکی کە بە درێژایی مێژوو لە پێناوی وەدەست هێنانی مافی نەتەوایەتی و دیاریکردنی چارەنووس خەباتی کردووە لەو کۆبوونەوە مەزنەیەدا بەشدار نەبێ.

خۆ ئەگەر بڵێین تەنیا حیزبە کۆمونیستەکان بەشدار بوون وانییە. لەو ١٢٣ دەستەی نوێنەرایەتیە زۆریان کۆمونیست نەبوون. زۆریان گەلەکەیان قەت ژێر دەست و بەشخوراو نەبووە، ولاتیان نەکەوتۆتە بەر بۆمباران و وەک کورد بە کۆمەڵ خەڵکیان لێ نەکوژراوە. نەک هەر ئەوە کە نوێنەری گەلی کورد لە کۆنگرەی حیزبە کۆمونیستەکانی ولاتانی سۆسیالیستیدا بەشدار نابێ، بەڵکو زۆر رێکخراو و کۆمەڵی نێو نەتەوەیی و دیموکرات هەن کە سەر بە حکومەت و دەولەتان نین و رێکخراوی کۆمەلایەتین و نوێنەریخەڵک بەشداریان تێدا دەکەن.. وەک : رێکخراوی جیهانی لاوانی دیموکرات، یەکێتی نێو نەتەوەیی خوێندکارانی جیهان، رێکخراوی هاوکاری گەلانی ئاسیاو ئافریقا، شورای ئاشتی جیهانی و......هتد. وەک دەبینین نوێنەری نەتەوەیەکی زۆر لێکراوی .٢ملیۆنی لە هیچ یەک لەم رێکخراوانەدا بەشدار نیە.

بۆ چی؟ کورد نەتەوە نیە؟ ژێر دەست و بەشخوراو نیە؟ دژی ئیمپریالیزم نیە؟ وەلام مەنفییە. رەنگە تاوان و گوناهی گەلی کورد هەر ئەوە بێ کە بە دەستی ئیمپریالیزم و نۆکەرانی ئیستیعمار نیشتمانەکەی دابەشکراوەو هەموو ریستوو داوخوازێکی عادلانەی بە گوللەو کوشتار

وەلاْم دەدەنەوە. یان تاوانی ئەوە بیْ کە ولاتەکەی دەولەمەندەو مەلبەندیکی ستراتیژیەو دراوسیی ولاتی سۆسیالیستی‌یە. سەبر ئەوەیە نەتەوەی ۲۰ ملیۆنی کورد لە کاتیکدا ئەمە حالیەتی کە سیستمی ئیستعماری لەبەر یەک هەل وەشاوە، میللەتانی جیهان لە چنگ ئیمپریالیزم و کۆلۆنیالیزم نەجاتیان بووە. نەتەوەی ئەوتۆ سەربەخۆییان وەدەست هیناوە کە ژمارەی خەلْکەکەیان ناگاتە ۲۰۰هەزار کەس.

ئەو مەسەلە بۆ زەحمەتکیشانی کورد لە گۆری‌دایەو لە هۆیەکانی دەگەرین و پرسیار دەکەن و بەلاْم وەلاْمی پرسیارەکانیان بە روونی وەر ناگرنەوە.

هیندیْ کەس دەلْین کوردستان موستعمەرە نیە. یانی بە قسەی ئەوانە چونکە کوردستان موستعمەرە نیە دەبیْ هەر ژیر دەست و بیْ بەش بیْ. ئەو کەسانە بیر لەوە ناکەنەوە کە ئەگەر کوردستان بە رەسمیش موستەعمەرە نیەو لەو بەری دەریاکانەوە نەهاتوون داگیری بکەن، پیوەندی ئەم حکومەتانەی کوردستانیان بە سەردا دابەشکراوە لەگەلْ گەلی کورد پیوەندیکی ئیستعماریەو خراپتریشە. هیندیْ کەسی دیکەش بە ناوی پیشکەوتنخوازی و تەنانەت لە ژیر پەردەی بە رووالەت مارکسیستیشدا نەزەریان ئەوەیە چونکە ئیمپریالیزم ماوەو لەم ولاْتانەدا خاوەنی نفوزو دەسەلاتەو خەباتی دژی ئیمپریالیستی خەباتی سەرەکییە، ئیتر کوردی کلۆلْ و بەشخوراو نابیْ داوای مافی نەتەوایەتی بکا، نابیْ بە زمانی خۆی بخوینیْ، نابیْ کارو باری خۆی بەریوە بەریْ و بە کورتی نابیْ دەنگی لەبەر بیتە دەریْ. ئەو مارکسیستانە یان لە خۆ دەگۆرن یا تیْ ناگەن. ئەگینا خەبات بۆ وەدەست هینانی مافی نەتەوایەتی، خەبات بۆ رزگاری نەتەوەیەکی ژیر دەست نەک هەر لە خەباتی دژی ئیمپریالیستی جیا نیە، بەلْکو بەشیکی گرنگی خەباتی دژی ئیمپریالیستیشە. دەکریْ

لەو مارکسیستانە بپرسین: داخوا ئەم گەلانەی ئاسیاو ئافریقا کە ئازاد بوون و سەربەخۆییان وەدەست هیناوەو لە لایەن ولاتانی سۆسیالیستی و هێزە پێشکەوتنخوازەکانی جیهانەوە پشتیوانیان لیٚ دەکریٚ بە جارێک ئیمپریالیزمیان فەوتاندوەو رەگ و ریشەیان دەرهێناوە یا هێشتا لەم ولاتانەدا ئیمپریالیزم هەروا کلکی تۆز دەکا؟ دیارە داتاشینی ئەم تیئۆریە کە چونکە خەباتی دژی ئیمپریالیستی لە گۆڕیٚدایە کورد نابیٚ داوای هیچ بکا، لە ئەساسەوە تیئۆری بورژوازی خاوەن دەسەلاتەو هیچی‌تر. ئەم گەلانەی ئازاد بوون باشتر دەتوانن خەباتی دژی ئیمپریالیستی لە سایەی پشتیوانی ولاتانی سوسیالیستی‌یەوە بەرێوە بەرن. ئەو مارکسیستانە ئەگەر لە خۆ نەگۆڕن یا بە قەولی لینینی مەزن «لەترسی ئەوەی بە ناسیونالیزم تاوانبار نەکرێن و نەکەونە موقفی بورژوازی حاکم» باش دەبیٚ بزانن لە ولاتانی فرە گەلّدا تەنیا ئەم کاتە خەباتی دژی ئیمپریالیستی بەراستی بەرێوە دەچیٚ و دەتوانیٚ سەرکەویٚ کە مافی گەلانی ژێر دەست بە رەسمی ناسرابیٚ و هەموو نەتەوەکانی خەلّکی ئەم ولاتە وەک یەک بە مافی نەتەوایەتی خۆیان گەیشتبن.

ئەوانەی خۆ بە مارکسیست دەزانن و لە خەباتی رەوای گەلانی زۆرلیٚکراو لە ولاتانی فرەگەلّدا بۆ وەدەست هێنانی مافی رەوای نەتەوایەتی پشتیوانی ناکەن لە ژێر پەردەی مارکسیزمدا لەگەلّ بورژوازی میللەتی حاکم لەسەرکوت کردنی جولانەوەی رزگاریخوازی نەتەوەی زۆر لیٚکراوو پیٚ شێلکردنی مافی نەتەوایەتی ئەم گەلانە بەشداری دەکەن. لینین دەلیٚ: «تەواوی حیزبە کۆمونیستەکان دەبیٚ راستەوخۆ بە جولانەوەی شۆرشگیری نەتەوەکانی ژێر دەست یا ئەو گەلانەی لە بەرانبەری مافدا وەک یەک بیٚ بەشن، بۆ نموونە بە ئیرلەند یا رەشەکانی ئەمریکاو هیتر، هەروەها بە موستەعمەرەکان یارمەتی بکەن. بە بیٚ ئەم

شەرتەی دوایی کە گرنگی تایبەتی هەیە، هەموو چەشنە خەباتێک دژی زولم لە نەتەوە ژێر دەستەکان و موستەعمەرات، وە هەر جورە ناسینێکی مافی جیابوونەوەو پێک هێنانی دەولەت بۆ ئەوان هەر وەک ئێمە لە بارەی حیزبە ئینترناسیونالیستەکانی دووهەم دەبینین، پەردەیەکە بۆ داپۆشینی درۆ». لینین نووسراوە گشتیەکان جلدی ٣١ لاپەرەی ١٢٥.

ئەم قسە بەنرخەی لینین بۆ هەموو سەردەمێک هەر لە جێی خۆیەتی. گەلی کوردیش لە ئیرلەندە ولە رەشەکانی ئەمریکایی حالی باشتر نیە. هیندێک لە کوردە ناسیونالیستە تۆخەکان تەواوی دیزەو گوزەی ژێر دەستی و بەشخوراوی کورد لە سەری ولاتانی سوسیالیستی‌دا دەشکێنن و گۆیا ولاتانی سۆسیالیستی لە بەر خاتری بەرژەوەندی سیاسی و بازرگانی خۆیان یارمەتی بە گەلی کورد ناکەن. ئەو کەسانە لە بەر هەستی دڵسۆزی و بێ کەسی گەلەکەیان لە لایەک و لە بەر ورد نەبوونەوە لە مەسەلە سیاسیەکان و نەناسینی سیاسەتی نێو نەتەوەیی ولاتانی سوسیالیستی لە لایەکی‌ترەوە تووشی ئەو بۆ چوونە چەوتە دەبن و دەیانەوی هەروا بە ئاسانی خۆ لە چنگ بیرکردنەوە رزگار بکەن و بۆ ناسینی هۆیەکانی ژێر دەستی گەلی کورد خۆ ماندوو یا پیاو خراپ نەکەن. لە نێو گەلانی دواکەوتوودا زۆر باوە بۆ ئەوەی خۆ بە مەسەلەکانەوە ماندوو نەکەن تاوانی رووداوەکان دەخەنە سەر ئەستۆی بێگانەو خۆیان بە خەتابار نازانن. خاوەنی ئەم جورە بیرو باوەرە یەکەم پێویستە ئەوەندە بزانن کە ولاتانی سۆسیالیستیش وەک هەموو گەل و ولاتێک سیاسەتی تایبەتی خۆیان هەیەو پێش هەموو شتێک قازانجی نیشتمانی خۆیان لەبەر چاو دەگرن. دووهەم ئەگەر بە ئینسافەوە تەماشا بکەین بۆ مان دەر دەکەوێ کە پاش شەری دووەمی جیهانی هیچ گەل و نەتەوەیەک نەبووە کە بە بێ یارمەتی ولاتانی سۆسیالیستی ئازاد بووبێ

و لە خەباتی رزگاریخوازی دژی ئیمپریالیستیدا سەرکەوتبیٚ. ئەم سیاسەتەی ولأتانی سۆسیالیستی بۆ هەموو کەس روون بۆتەوە گەلی کوردیش بە نۆرەی خۆی تا ئەو دەمەی سیاسەتێکی روون و عاقلانەی هەبووە لە یارمەتی ماددی و مەعنەوی ولاتانی سۆسیالیستی بیٚ بەش نەبووە. کە وابوو لە [illegible] کە خەلکیتر تاوانبار بکەین با غیرەتی ئەوەمان هەبیٚ پیٚ لە هەلەو چەوتیەکانی خۆمان بنیٚن. برایانە رەخنە لە خۆمان بگرین لە وەزعی خۆمان بکۆلینەوەو ریٚگای چارە بدۆزینەوە.

ماکسیم گۆرکی نووسەری ناوداری رووس دەلیٚ: «بۆ تیٚگەیشتنی وردی ئەو مەسەلەیە کە لەگەلٚ کیٚ شەر دەکەی، چت دەویٚ و لە چی دەگەریٚی؟ هیچ ریٚگایەکی دیکەت نیە بیٚجگە لەوە کە دەبیٚ خۆت بناسی». ئەمە قسەیەکی زۆر بەنرخە. بەر لە هەموو شتیٚک بۆ رزگاری لەم وەزعە نالەبارە کوردیش دەبیٚ خۆی بناسیٚ، بزانیٚ چی دەویٚ، دۆست و دوژمنی خۆی بناسیٚ، ریٚگای راست بدۆزیٚتەوە. ناسینی دۆست و دوژمن لە خەباتی رزگاریخوازیدا زۆر گرنگە.

ئەگەر زۆر بۆ دوایە نەگەریٚینەوە گەلی کورد بەلانی کەمەوە سەد سالە بە شێوەیەکی تا رادەیەک ریٚک و پیٚک لە پیٚناوی ئازادی و مافی نەتەوایەتیدا خەبات دەکا. لەم ریٚگایەدا دەیان هەزار رۆلەی فیدا کردوە. راستە لەو ماوەیەدا خەباتی رزگاریخوازی گەلی کورد گۆرانیٚکی گرنگی بەسەردا هاتووە، لە شیٚوەی عەشایری و سەرکردایەتی دەرەبەگ و شیٚخ و مەلایان (ئەگەر ئیٚستا مەلا و شیٚخ با نەدەنەوە) هاتۆتە دەرو حیزبیٚ دیموکرات و پیٚشکەوتنخواز پیٚک هاتوون و خاوەنی پیٚرەو پرۆگرامی پیٚشکەوتوو، بەلأم ئەگەر لەگەلٚ زەمان و مەکان و گۆرانی وەزعی جیهان و ئازادی گەلان بەراوردی بکەین کورد هیچی نەکردووە، لە جیٚگای خۆی وەستاوە و دوا کەوتوەو ژیٚر دەست ماوەتەوە. لە ماوەی ئەو سەد سالەدا

سەد دەولەتی نەتۆ پێک هاتوون کە ئەو کاتەی کورد خەباتی دەکرد ئەوان وەک گزیتە دەفرۆشران. بۆچی وایە؟ زەحمەتکێشانی کورد لە وەڵامی ئەم پرسیارانە دەگەرێن.

بەلای منەوە ئەگەر رێبەری حیزبە کوردستانیەکان تورە نەبن، ئەو حیزب و رێکخراوە قەومی و دیموکراتیانەی لە کوردستاندا دامەزراون، هەرچەند بە نووسین وبە قسە هیچیان تێدا نەهێشتۆتەوە، بەلام نەیانتوانیوە لە مەیدانی جیهانی و نێو خۆدا دۆست و هاوکاری راستەقینەی خۆیان بدۆزنەوە. نەیانتوانیوە لەگەڵ دۆست و پشتیوانی راستەقینەی گەلی کورد یەک بگرن تا بتوانن بە باشی بە گژ دوژمنی راستەقینەدا بچن. نەیانتوانیوە ئامانج و ستراتیژیەکی روون بۆ خەباتی گەلی کورد دیاری بکەن. هەمیشە ستراتیژیان فیدای تاکتیک کردووە. تاکتیکیش ئەگەر جارووبار تا رادەیەک چووبێتە پێش، نەگەیوتە ستراتیژی و تێکشاوە.

یەکی‌تر لە هۆیەکانی بەجێ مانی حیزبە کوردستانیەکان لە قوناخی خەباتی رزگاریخوازیدا سەرلێشێواوی فکریە. هەر ئەو سەرلێشێواویە بۆتە هۆی ئەوە کە دۆست و دوژمنی خۆیان بە باشی نەناسن و خۆساخ نەکەنەوە. لە سەر دوو رێیان و سێ رێیان دا بوەستن و دڵ لە دڵ بدەن و نەزانن بە کام رێگادا برۆن. لە مەیدانی جیهانی و گەلانی ولاتانی دنیای سێهەمیشدا نموونەی ئەوتۆمان بە دەستەوەیە. حیزب و رێکخراوە کوردستانیەکانی ئێمەش لە ژێر تەئسیری پەرە گرتووی سۆسیالیزم و لە ترسی ئەوەی کە نەوەک بە ناسیونالیست تاوانباریان بکەن، هەموویان خۆیان بە مارکسی دادەنێن. لە کاتێکدا ناسیونالیزمی نەتەوەی ژێر دەست و بەشخوراو بێجگە لە پاتریۆتیزم (نیشتمانپەروەری) هیچی دیکە نیە. ناسیونالیزمی کورد ئەگەر بلێ لێمانگەرێن بە زمانی خۆمان بخوێنین

و کاروباری خۆمان بەرینە بەرین بۆ کافر دەبێ؟ بۆ دەبێ ئیعلامی جیهادی دژ بکرێ و ولاتەکەی بۆمباران بکرێ؟ بۆ؟.

حیزب و رێکخراوە کوردستانیەکان هەموو باسی مارکسیزم دەکەن. بەلام هەر لەو کاتەشدا نەیانتوانیوە لەگەڵ حیزبە کۆمونیستەکانی ولاتانی خۆیان رێک بکەون. با لێرەدا ئەم راستیەش بلێین کە بێجگە لە حیزبی کۆمونیستی عیراق هیچ یەک لە حیزبە کۆمونیستەکانی ئەم ولاتانەی کە کوردیان تێدا دەژی لە حاست چارەسەرکردنی مەسەلەی کورد هەڵویستێکی تەواویان نەبووە و کەمتەر خەمیان کردوە.

حیزب و رێکخراوە کوردستانیەکان هەموو خۆیان بە رێبەرو (طليعة)ی نەتەوی کورد دەزانن. باوەر ناکەم هیچ نەتەوەیەکی ژێر دەست و بەشخوراو بە قەدرایی گەلی کورد حیزب و رێکخراوی رێبەرو (طليعة)ی هەبێ، هەر ئێستا ماشاللە لە هەموو کوردستان و تەنانەت لە دەرەوەش حیزب و ریکخراوی کوردی وەک کارگ لە زەوی هەڵ دەتۆقن. بەلام هیچ یەک لەو حیزب و رێکخراوانە نەیانتوانیوە زەحمەتکێشانی کورد بە تەواوی لە دەوری خۆیان کۆبکەنەوە، مەسەلەی کورد وەک مەسەلەی نەتەوەیەکی دابەشکراو و بێ بەش بێننە گۆرێ و کاری بۆ بکەن. توانیویانە لە نێو یەکتردا دوو بەرەکی ساز بکەن، بەلام نەیانتوانیوە پێکەوە هاوکاری بکەن و ستراتیژیەکی هاوبەش و تێکرایی بۆ چارەسەر کردنی مەسەلەی کورد بدۆزنەوە. لە سەر بەرنامەیەکی کارو تێکۆشان بۆ خەباتی گەلی کورد «لەگەڵ پاراستنی سەربەخۆیی تەشکیلاتی حیزبەکەیان» رێک بکەون. بەداخەوە هەر یەکە بۆلایەکی دەکێشێ. هەر یەکە دەیەوێ کەرتێک لەو گەلە بەشخوراو زولم لێکراوە بۆ لای خۆی رابکێشێ و لەگەڵ بەشێکی‌تر بیکاتە دوژمن.

رۆژنامەی سەندی تێلگراف ۲ی دیسامبری ۱۹٦۲ نووسیبووی:

«گرنگترین گیروگرفتی کوردەکان کێشە و ناکۆکی نێو حزبیانە بۆتە کۆسپی پێک هێنانی کوردستانێکی خودموختار».

ئەوانە واقعیەتێکی تاڵ و داخدارن و کەس ناتوانێ حاشایان لێ بکا. جا بەم حالە ئەوانەی گلەیی لە ولاتانی سۆسیالیستی دەکەن کە گۆیا یارمەتی گەلی کورد نادەن و ئەوانەی داخی ئەوانە دەخۆن کە بۆچی نوێنەرانی گەلی کورد لە رێکخراوە جیهانیەکاندا بەشدار نین لە پێشدا دەبێ خۆیان وەلامی ئەو پرسیارە بدەنەوە کە یارمەتی بە کێ بکەن؟ بە کام حیزب و هێزی کوردی؟ نوێنەری کام حیزب و هێزی کوردی لەم رێکخراوانەدا بەشدار بێ؟. لام وایە وەلامی ئەم پرسیارانە نادۆزرێتەوە. چونکە بەداخەوە هێشتا هێزێکی ئەوتۆ لە کوردستان نەهاتۆتە سەر شانۆی سیاسەت کە بتوانێ نوێنەری راستەقینەی گەلی کورد بێ و لە مەیدانی جیهانیدا وەک نوێنەری نەتەوەیەکی ۲۰ملیۆنی خۆ بناسێنێ.

دەردی داخداری کورد هەر ئەوەیە کە هێزی کاریگەری گەلْ لەبەر یەک بلاو بووە. بێگانە لە زۆر لاوە دەستی گلاوی خستۆتە ناوو دوژمنیش کەلکی لێ وەرگرتووە. کەنگێ ئەو هێزە یە تەوژمە کۆ دەکرێتەوە، کەنگێ رێبەرانی حیزب و رێکخراوە کوردستانیەکان بۆ مەسلەحەتی گەلەکەیان واز لە بەرژەوەندی شەخسی دێنن و بۆ یەک ئامانج و مەبەست، بۆ دانانی ستراتیژیەکی دروست و زانستی، بۆ خەباتێکی یەکگرتوو دژی ئیمپریالیزم و کۆنەپەرستی، بۆ وەدی هێنانی مافی رەواوی گەلی کوردو دیاریکردنی چارەنووسی بە دەستی خۆی یەک دەگرن پرسیارێکە دەبێ رێبەرو بەرپرسی حیزبە کوردستانیەکان وەلامی بدەنەوەو ئەوان لە بەرانبەر نەتەوەکەیاندا بەرپرسن.»

رۆژی٦/٩/٩٨١ دوکتور سەعید نامەیەکی دامێ لەنامەکەدا نووسرابوو:«( هاوڕێی بەرێز کاک کەریمی حسامی:بە سلاوێکی

هاورنیانەوە . هەر وەک ئاگادارن کونگرەی پینجەمی حیزب قەرارەلەمسالدا پیکبی.بۆ بەرێوە بردنی کاروباری پیکهاتنی کونگرە لەلایە ن کومیتەی ناوەندی‌یەوە کومیتەی تایبەتی ئامادەکردن دیاری کراوە، کە ئە وکومیتە ی ئامادەکردنەش خۆی لەچەند کومیسیون پیکهاتوە.

بەلەبەر چاو گرتنی لیۆەشاوەیی و لی زانی ئیوەی بەرێز بەشانازیەوە،پیتان رادەگەیە نریٚ کەلەلایەن کومیتەی ئامادەکرد نەوەبە ئەندامی کومیسیونی ئالوگۆری پیویست لە بەرنامەو ئە ساسنامەی حیزب هەلبژیراون. تکایە نەزەری خۆتانمان لەسەرئەندمە تی لەکومیسیونی ئاو براو وهاوکاری کردنتان لەو کومیسیونەدا پیٚ رابگەیەنن و ئەگەر قەبولی ئەو ئەرکە گرنگەتان بۆ دەگونجیٚ،بۆ بەشداری لە هەوەلین کۆبوونەوەی کومیسیوندا لە بەیانی ٢٢ی خەرمانانداتەشریفتان لە بنکەی دە فتەری سیاسی حازر بیٚ . بەسوپاسەوە . براتان سەعید بدل ٦٠/٦/١٤.

ئیوارەی ئەو رۆژە مەلا ناصح و عبدالخالق زەنگەنە هاتن. هەمرو هەر لەهەولدان کە پارتی شەڕ پەرە پیٚ‌نەدا.رۆژی ٩٨١/٩/٩ کاک عەلی حەسەنیانی هاتەلام. باسی ئەوەی دەکرد کە لەتەشکیلاتی بۆکان چەندە دزی کراوە، چووم تە حقیقاتم کردوە، بەلام لیٚ پرسینەوە نیە و کەس جواب ناداتەوە.

ئەمرۆ نامیلکەی ( خەیانەتەکانی قیادەی موەقەت)یان بۆ ناردم کە لەرادیۆ بلاوی کەینەوە. بە رەسمی لەرادیۆدا دەست کرا بە نووسین و بلاو کردنەوە لەسەر قیادەی موە قە ت . پیمانگوترا ناوی پارتی تەهینین.تەنیا بەناوی قیادە موەقەت باسیان بکەین.

رۆژی ٩٨١/٩/١٠ دوکتور قاسملو تەلەفونی کرد و گوتی: کۆمەلیک مەلا هاتوون، لە بن دارە گویز جیٚیان بۆ چا کراوە. وەرە

بابچین بزانین چییان دەوێ. ڕەنگە زۆریان بناسی.»
- ئەوە ئیە کاک جەلیل لەوێیە و بەر پرسی تەشکیلاتیشە. ئیتر هاتنی منی بۆ چیە؟
- تۆ لە کاک جەلیل گەڕێ. من ئەوە دەچمە خوارێ، تۆش وەرە.
کەچووم کۆمەڵێک ماموستای ئایینی بوون، تەشریفیان هینا بوو. زۆربەیانم دەناسی و لەساڵەکانی ٥٠ و ٥١ دا فەقێ بوون و بانگی ئازادیخوازی و کوردایەتیم بەگوێدا خوێند بوون.بەخێر هێنانێکی گەرم وگوڕ و دیدارێکی خۆش.دوکتور نووسراوەیەکی بەدەستەوەبور دایمێ، گوتی : ئەو نووسراوەیە بخوێنەوە بزانە ماموستایان چ دەفەرموون.» گوتم جەنابت و کاک جەلیل تەماشاتان کردوە نیتر من تەماشای چبکەم بێگومان شتی خەرابی تێدا نیە. نووسراوەکەم وەر گرت و خوێندمەوە.ماموستا داوایان دەکرد کە یەکێتی ماموستایانی ئایینی پێکبێ و بەسەر کردەوەکانی حیزبی دیموکرات و هێزە سیاسیەکاندا چاوەدێری بکا و بەگوێرەی ئایینی ئیسلام بجزوونەوە.
گوتم نووسراوەیەکی گەلێک جوان و پیرۆزە. بەلام هەر چەند ئەوە دوکتور و کاک جەلیل لێرەن ، پرسیارێکم لەماموستایان هەیە ئەگەر ئیجازە بفەرموون. تێکڕا گوتیان : فەرموو..فەرموو.
- ئەو ئایین و ئیسلامەی کەوا ئێستا ماموستایان باسکی خۆیان لێ هەڵماڵیوەو هەولی بۆ دەدەن، شتێکی تازەیە، یان ..١٤٠٠ساڵە بلاو بۆتەوە بەدنیاداو کوردەکەش بەشەق بەسەریاندا سەپاندوە.؟
- نەخێر ئیسلام هەر ئەوەیە و هەر هەبوەو هیچی تازە نیە.
- باشە ئەدی بۆچی لەزەمانی شادا کەس وەدوای نەدەکەوت و هەولی نەدەدا کە بەسەر سیاسەت و کردەوەکانی حکومەتی شادا چاوەدێری بکات؟

یەکیان گوتی : لە زەمانی شادا کەس نەیدەویرا زمانی بگەڕێ.
- بە دینت لەزەمانی شادا کەسیان لە سە ر نوێژان گرتوە ؟
مەلا عەولای سورخابی کە دۆستی قەدیمم بوو، گوتی : « نە نەشهەدو بیلا کەسیان لە سەر نوێژان نەدەگرت.
گوتم ماموستا خۆتان من باش دەناسن. هەمیشە بۆ ماموستایان ڕێزم هەبوە بەلام هەق بەخۆم دەدەم تۆزێ لەم هەلسوڕانە وەشک کەوم . هیوادارم ئێوەش پتر بیری لێ بکەنەوە،و لەجولانەوەی ئێستای نەتەوەکەتان پشتیوانی بکەن.
دوکتور گوتی ئێوە قسەی خۆتان بکەن، ئیجازە بفەرموون من کارم هەیە. پاشان منیش گوتم وا کاک جەلیل لەخزمەتتان دایە. خوا حافیزیم لێکردن و کاک جەلیلیش بردنی بۆ میوانخانە.
ئەو ڕۆژانە دە فتەر زۆر ئالۆزە. فەرماندەکانی پێشمەرگە کۆ کراونەوە. بارزانیەکان بە یارمەتی و پشتیوانی پاسدار و ژاندارمەری هێرشیان بۆ سەر بنکەکانی حیزبی دیموکرات دەستپێکردوە. شنۆ چۆل کراوە. لە ڕوژێکدا ٩١ پێشمەرگەو خەلکی تر شە هید بوون.
ڕۆژی ١٢/٩/٩٨١لەگەل میرزا عەولای حاجی سمایلی چورمە گوندی (پاش بەردە) مالی (بایزی ئامانێ)پیرە پیاوێکی قەدیمی مەنگوڕان. دەمویست لەسەر ڕاپەڕینی مەلا خەلیلی گۆڕئۆمەری هێندێ پرسیاری لێ بکەم.کە گەیشتینێ بەر لەهەموو شت کیسکێکیان لەعە رزیدا و مام بایز کردی بەهە لا، دەزوو دەی ، جارێ جەرگ و دلەکەی بکەنە کەباب.دوای حەسانەوەو چا خواردنەوە گوتم مام بایز.دەمەوێ لە سە ر هەرای مەلای(لەنێو مەنگوڕان وا ناسراوە) شتێک بنوسم. لە پیرە پیاوی ئەو زەمانی هەر تۆ دەناسم. چت لەبیر ماوە، مەلا خەلیل ئەو شەڕەی بۆ کرد؟

مام بایز گوتی : « بەسەری تو، عەجەم هێرشیان هێنا بوو،نوختە(پاسگا) لە(گزمان) و لە (بێوران)بوو.دەست درێژیان بۆ ژنان دەکرد.میر هاشم لە(گزمان) کچە کوردێکی بەزۆری برد.شەبکەشیان دەویست بەزۆری لەسە رمان نێن.مەلاش ئەوەی پێ قەبوڵنەکرا. گەورگی ئەو دیو لەگەڵمان بوون، کاکە لاغا..مەنگورِ لەگەڵ بوون، لەسەر پردی قەلاتاسیان دوو تۆپیان بێوە نان.»

هەر من دەمپرسی، مام بایز لەوەندەی تێ نەدەپەڕاند . ئەوەندە بوو گەرانێکی خۆشمانکرد، نانێکی باشمانخوارد. بەپێ یان چووبوون، مام بایز نەیهێشت بەپێ یان بگەڕێنەوە. ولاَ خێکیان زین کرد و بەسواریهاتینەوە.جارێکی دیکەش میرزا عەولاَ کەرتە بەر رەخنەی (دێموکراتان )کە بۆچی لەگەڵ من سەفەری کردوە؟.

رۆژی ٩٨١/٩/١٣دوکتور قاسملو لە کورتە کاغەزێکدا بۆی نووسیبووم کە سەبارەت بە پەلاما ری قیادە موقەت، نامەیەک بۆ حیزب و ڕێکخراوە دیموکرات و پێشکەوتو خوازەکانی رۆژ هەلاَتی نێوە راست بنوسم. نامەکەم نووسی ، لەرادیۆ بلاَو کرایەوە و دەقەکەشی وا لێرەدالە گەڵ دوکومێنتەکان بلاَو دەکرێتەوە . هەرلەم رۆژەشدا کومیسیونی پیرەو وپرۆگرام کۆ بوونەوەمان هەیە.دوکتور سەعید و مەلا عەولاَ لەسەر ژمارەی ئەندامانی حیزب کێشەیانبوو. دوکتور سەعید دەیگوت : بەحیسابی کاک جەلیل ،٤ هەزار ئەندامان هەیە. ماموستاش دەیگوت ...١ ئەندامیشمان نیە.دوکتور سەعید ڕۆیشت و ئێمە سێ کەس کاک تەیفوری بەتحائی ومامۆستاو من ماینەوە.مە لا عەولاَ دە یگوت :«ئامانجی نیهایی حیزبی دیموکرات پێکهێنانی کۆمەڵی سوسیالیزمی دادپەروەرانەیە». منیش دەمگوت :« ئەم (داد پەروەرانە ) زیاویە. سوسیالیزم ئەگەر هەبێ، داد پەروەرانەیە، ئەگەر داد پەروەرانەش نەبێ،

ئەوە سوسیالیزم نیە» لە کونگرەی چواریش (داد پەروەرانەکە) لاچوە، بۆ چی زیندووی کەینەوە؟.کاک تەیفوری بەتحائی لەگەڵ من بوو. سورەتجەلەسە نووسرا. لە کۆ بوونەوەی دوایدا کە دوکتوریش بەشداریکرد، مەلا عەولاّ سورەتجەلەسەی خوێندەوە، بە پێچەوانەبوو.واتە من تەنیا بووم و ئەوان دوو. من رەخنەم گرت کە ماموستا بەتەنیا دەقی سورەتجەلەسەکەی گۆڕیوە. دوکتور پرسیاری لە تەیفور کرد. لە وەلاّمدا گوتی: ڕاستە لە پێشدا لام وابوو (داد پەروەرانەی) گەرەک نییە.دوایە لە گەڵ ماموستا قسەمان لێکرد، لام وایە (داد پەروەرانە)ی هەبێ ڕاستە. ئیتر من هیچم نەگوت. بەلاّم تەیفور لای من ئەو تەیفورەنەبوو کە بە هەڵە حیسابم لە سەر دەکرد. ٠

ڕۆژی ٩٨١/٩/١٦ پەلاماری پاسدار وبارزانیان گەبشتە سۆفیان و جەڵدیان و بە ڕینەشیان گرت. پێشمەرگەی حیزب کشانەوە.
لەگەڵ هێرشی بارزانی و پاسداران، ئەرتەشیش لە لای.بۆکانەوە پەلاماری توند کرد. ڕۆژی ٩٨١/٩/٣٠ نەخشەیێکی نهێنی ستادی موشتەرەکی ئەرتەشی کۆماری ئیسلامیمان پێگەیشت. بۆ پە لاماردانی کوردستان کێشرابوو، بە بەشەکانی ئە رتەش ڕاکەیەنرابوو.هەر ئەو ڕۆژە لە ڕادیۆ بلاْومان کردەوە.دەقی ئەو گەلاّڵەیە هەر بەم جورەی هەبوو لە دەفتەری یادداشتەکانمدا تۆمار کردوە.
١ـ اجرای طرح عملیاتی تا قبل از فرا رسیدن فصل زمستان
٢ ـ از س.م ـ ا ـ ج . ا.به واحدهای مستقر در منطقه کردستان برای امادگی واجرای هماهنگی نظامی در منطقه.
٣ـ از س م ا ـ ج ـ ا به پ ب ×به پ م × ب × پ س × ب × پ ×پ ب و× م× م × س × ج × س × د × م ع
٤ ـ وادار نمودن کردهای پناهنده عراقی در منطقه و استفاده انان از

تجربیات جنگی کوهستانی
٥ـ مشغول نمودن نیروی انسانی حزب دمکرات در مناطق کم اهمیت نظامی
٦ـ ضعیف نمودن نیروی نظامی حزب از لحاظ روانی
٧ـ استفاده از عوامل بومی منطقه برای کسب اخبار نظامی در حزب
٨ـ تبلیغات اصولی برای عشایر وابسته به دولت و انشعابیون در حزب دموکرات
٩ـ .بی اعتبار نمودن حزب دمکرات در انظار عمومی و تضعیف رهبری حزب
١٠ـ عملیات گسترده نظامی برای مناطق تحت کنترول حزب
١١ـ نوار مرزی بوسیله کردهای عراق مقیم ایران کمترل شود.
محرمانه از س ـ م ـ ا ـج ـ ا به واحدهای مستقر در کردستان. ( ئەمەش وەرگێڕاوەی گەلاڵەکەیە ):
١ . ئیجرای گەلاڵە ی عەمەلیاتی تاپێش هاتنی وەرزی زستانی
٢ . لە ستادی هاوبە شی ئەرتەشی کۆماری ئیسلامیەوە بۆ تیپەکانی دامەزراو لە کوردستان بۆ ئامادەیی وئیجرای هاو ئاهەنگی ئیزامی لە ناوچەدا.
٣ . لە ستادی هاوبەشی ئەرتە[illegible] کۆماری ئیسلامیەوە بۆ:پادگان و پاسدار وهێزەکانی ئەرتەشیە
٤ . هێنانە مەیدانی کو[illegible] عیراقیەکان لە ناوچە و کە لک وەرگرتن لە ئەزموونی ش[illegible]
٥ . سەر گە رمکردنی هێ[illegible]نسانی حیزبی دیموکرات بە ناوچەکانی کەم ئەهمیەتی ئیزامیەوە.
٦ . کزکردنی هێزی ئیزامی حیزب لە باری رەوانیەوە.

٧ ـ کەلک وەرگرتن لە خەڵکی ناوچە بۆ وەرگرتنی دەنگوباسی نیزامی لە حیزبدا.
٨ ـ تەبلیغاتی ئوسولی بۆ عەشایری سەر بەدەوڵەت و بۆ ئەوانەی لە حیزب جیابوونەوە.
٩. بێ ئیعتیبار کردنی حیزبی دیموکرات لە بەر چاوی خەڵک و کزکردنی رێبەرایەتی حیزب.
١٠ ـ عەمەلیاتی بەر بلاوی نیزامی لە ناوچەکانی ژێر کۆنترۆڵی حیزبدا.
١١ ـ جە غزەکانی سنور بەهۆی کوردەعیراقیەکانی دانیشتووی ئیران کۆنترۆڵ بکرێن.
مەحرەمانە لە ستادی هاویەشی ئەرتەشی کۆماری ئیسلامی بەوە بۆ تیپەکانی جێگر لە کوردستان.

٢/١٠/١٩٨١ ـ ئەمرۆ شەش رۆژە لە بۆکان شەر توندە. خەبەرمان بۆ هات کە پێشمەرگە شاریان بەجێ هێشت. ئێواریێ رادیوی مەهاباد پیرۆز بایی بیشەرمانەی مەلا ئەبوبەکری شەفیعی بە بۆنەی چوونی ئە رتەش بۆ بۆکان بلاو کردەوە. ئەو مەلا چلکاو خۆرە ئەوەی بوختان و تۆمەتی ناڕەوا بوو دایە پاڵ هێزە شۆرشگێرەکانی کوردستان. رۆژی دوایی وتارێکم لە سە ر نووسی، دوو سێ جار لە را دیۆ بلاومان کردەوە.

رۆژی ١٩/١٠/٩٨١ دوو خوارزام هاتبوونە لام، پارەو جوتێک پۆتینیان بۆ هێنا بووم. رێگایان نەدابوون بێنە سە رێ. بێ ئە خلاقیەکە پە نگی خوارد بۆوە. میرزا عەولا تەلەفونی بۆ کردم، چوم چاوم پێ یان کەوت. شێوەی تەبلیغات و نووسینی وتارەکان بۆ رادیۆ فرەساکار و فیشالی بوون. هەموو سەرو بنی وتارەکا ن دەهاتەوە سەر رووخانی رێژیم. چوومە دە فتەر و لە گەڵ دوکتور قاسملو و دوکتور سەعید باسم کرد و گوتم ئەم شێوە تەبلیغاتە تەئسیری نیە. لە هەموو وتارێکدا

دەنووسن ڕێژیم دەڕووخێ، ڕێژیمیش هەر لە جێی خۆیە. بۆ چوونەکەیان پێ تەواو بوو. ڕۆژی دوایی دوکتور سەعید وتارێکی بۆ هێنام گوتی هانی، ویستم بیرووخێنم، لە ترسی تۆ نەموێرا.وتارێکم نووسی و بەخەڵکم ڕاگەیاند کە ڕۆژی دژوارترمان لە پێشە، پێویستە خۆمان بۆ بەربەرەکانی توند و بۆ ڕۆژی سەختتر ئامادە بکەین.

ڕۆژی ١٩٨١/١١/١کاک سەلیمی باباتزادە تەلەفونی کرد، گوتی:
برادەرێکی قەدیمی تۆ لە لای منەو پێی خۆشە بتبینێ.

ـ سەیرە، برادەری قەدیمی من لای تۆ یە!!

ـ سەیر نیە .. لەم دنیایەدا هیچ شتێک سەیر نیە.

چووم . دیتم حەسەنی ماسالی برادەرێکی فارسی ڕەشت و گیلان دانیشتوە. لە بن چادرێکی پاک و خاوێنی کاک سەلیمی بوتلیک کونیاکی فەرەنسی و پوستە و ئاجیلیان داناوە. بەخێر هاتن و چاک و خۆشی و بەسلامەتی پێکی هەوەڵمان پێدا کرد.دیارە بۆ من پێکی هەوەڵبوو، دەنا ئەوان بەر لە من لێویان تەڕ کرد بوو. هەر بۆیەش دوای بەخێر هێنانی من وردە وردە خەریکبوون لە شیمالی ئیران کە جە نگەڵ و لێڕەوارە، شۆڕشی چەکدار دەست پێبکەن.کاک حەسەنی ماسالی دوای ڕوونکردنەوەی وەزعی ژئۆپۆلیتیکی مەڵبەندی شیمالی ئێران و جە نگەڵ ودارستان و ئامادەیی خەڵک، تووشی کۆسپێکی گەورە دەهات، ئەویش نەبوونی چەک و تەقەمەنی و کەرستەی شەڕ بوو.ئەگەر ئەوانەی هەبان، بەشێکی ئەرتەشی ئێرانی لە وێ سەر گەرم دەکرد.

کاک سەلیم مەسەلەکەی بۆ چارەسەردە کرد و خۆی چەک و تەقەمەنی بۆ دەگەیاندە زەنگان و تەنانەت دوور تریش، تا نیزیک قەزوین. :« ئەوە مەسەلەیەک نیە، ئێستا پێشمەرگەمان لە هەورشاری هەیە، لە وێوە تا زەنگان چەند سەعاتە؟ شەوێک ماشێن دەچێ و

دەگەڕێتەوە»

من کە نیوە نیوە پێم دادەکرد و دەستیشم قرانی دە پوستەو ئاجیل خستبوو، قسەکانم ئەوەندە پێخۆشبوون لە مێشکمدا خەزن دەکران.چونکە جارێکی دیکەش لە پاریس تووشی شۆرشگێران ببوم کە لە خیابانی شانزەلیزەوە نەخشەی شەڕیان دەکێشا. ئەو دەم لە سەر جێگای دەستپێکردنی شەڕی پارتیزانی رێک نەکەوتن. من کارم هەبوو دەبوایە لەگەڵ سوپاس بۆ میوانداری کاک سەلیمی بەجێیان بێلم.نەمزانی گەیشتنە کوێ. درنگتر ئەوەندەم زانی کە لاوێکی گەلێک مەرد و ڕەند، برای کاک ئەحمەدی شێر بەگی لە سۆنگەی سەفەری حەسەنی ماسالیدا سەرما بردی و شەهید بوو.

١٢/١١/٩٨١ دوکتور مەحمود عوسمان هاتبوە دەفتەری سیاسی. من نەمزانیبوو.ڕۆژی دوایی لە سەر ڕۆیشتن لە دوای ناردم. چووم، هەروا سەر پێی باسی هێندێ مەسەلەمانکرد. گوتی وتارەکەتم لە (ڕۆژهەلات) دا خوێندەوە.وتاری چاک بوو، بەلام هێندی جێگام بە کەیفێ نەبوو.

گوتم دەزانم، ئەو شوێنانەت بە کەیفێ نەبوە کە ڕەخنە لە ڕێبەری حیزبە سیاسیەکانی کورد دەگرم. دیسان سوپاسی دەکەم سەرەڕای پێ ناخۆشبوونی دەفتەری سیاسی ویستبووی چاوی پێم بکەوێ‌و بەسەری کرد بوومەوە. جگە لە دیتنی دوکتور مەحمود، بە دیداری دۆستی بەرێز کاک مەنسوری حەفیدیش شاد بووم.

ڕۆژی ١٤/١١/٩٨١ کاک مەحمودی حاجی فەقێ خدری هات. نامەی ئەبو سەربازی بۆ هێنابووم.ئەمڕۆ تیلگرافی حیزبی کومونیستی عیراقمان پێگەیشت کە پەلاماروشەڕی قیادە موقەتی دژی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێرانی مەحکوم کردبوو.تیلگرافەکەمان بەتەواوی لە رادیۆ نەخوێندەوە.

ئەمڕۆ دوکتور قاسملو بەرنامەی دەوڵەتی کاتی(شورای مقاومت ملی) مرجاهیدانی بۆ ناردووم، لە تە نیشتی بەرنامەکە نووسیویە:«کاک کەریم، تکایە ئەم بەرنامەیە بەوردی بخوێنەوەو نەزەری خۆتم بە درێژی بۆ بنووسە» دانیشتم بەوردی چەند جارم خوێندەوە.ئە و شوێنانەی بە دڵم نەبوو ن بەدر بۆ ی یاد داشتم کردن. بەتایبەت ماوەی گواستنەوەی( فترەی انتقال)ی عیراقم بەنمونە هێنایەوە کە وا بەناوی فترەی( انتقال) ٣. ساڵە خەڵک دە کوژن. زۆر شوێنی دیکە هەبوون کە دەگەڵ دیمرکراسی نەدەهاتنەوە.بیروڕای خۆم بۆ دوکتور نووسی، بە داخەوە رووتوسێکم لای خۆم نەهێشتەوە. لە گەڵ بەرنامەکە نامەیەکی مەسعودی رە جە ویشی نارد بووکە بۆ دوکتور قاسملوی نووسیبوو. وەک لە بەرنامەی شورای ملی مقاومت و دەوڵەتی کاتیدا باسی (خودموختاری)کرابوو، لە نامەکەشدا لە سە ر قەبولکردنی« خود موختاری داخلی لە چوار چێوەی تەواویەتی عەرزی نیشتمانی خۆشەویست» پێ داگیرابوو. لە ئاخری نامەکە شدا، هەر وەک فەرما ندەیەک مەعموریەت بدا بە ژێر دەستی خۆی نووسیبووی: « بەم هۆیەوە مەعموریەتت دەدەمێ کە بە هەموو تواناوە بۆ یەکگرتنی گشت هێز وکەسایەتی میللی و خەڵکی کورد لە دەوری بەرنامەی حازر تێبکۆشی ». لە سەر ئەم رستەی (مەعموریەتەش) بۆ دوکتورم نووسی: « تکایە بەگوێی دابدە با هە لەئێستاوە فێری فەرماندانو فەرماندەیی نەبێ«

کاک جەلیلی گادانی کە کرابوە بە ر پرسی تەشکیلاتی حیزب، بۆ ئەوەی پێش کونگرە ئە ندامانی حیزب ساخ کاتەوە بلاتکێتێکی ئامادە کرد بوو بڵاوی دەکردەوە :تەمەن و شوغڵ و رۆژی هاتنە نێو حیزب وناسێنەر و..... چی و چی ئەوەندەی وردە شتی بێ جێێ تێدا کۆ کرد

بزوە، وەبەڵگەی کاری حیزبی نهێنی نەبێ وەهەموو شت دەچوو.دانەیەکیشیان بۆ من هێنا کە پڕی کەمەوە، ونمدانەوە لام وایە ئەم شیعرەی مەلا مارفی کۆکەییم لە داوێنی بلاٌنکێتەکە نووسی:

(سەیری خۆشتر من کە مەعروفم لە نێو ئەم شارەدا

تازە ئیحصائیە داوای اسم و ناوم لێدەکا)

من ٤٠ ساڵە ئەندامی حیزبم، تازە کاک جەلیل بلاٌنکێتم بۆ دەنێرێ!!!. خۆش ئەوە بوو بۆ دوکتور قاسملوشیان بردبوو. ئێوارەی ئەو رۆژە لە سالۆنی میوانداری و خواردن کۆ ببووینەوە، دوکتوریش لەوێ بوو.بە دوکتور قاسملوم گوت : « ئەرێ دوکتور بلاٌنکێتی کاک جەلیلت پڕ کردەوە ؟ جا خۆ ئەگەر من نەتناسێتم کەس نازانێ تۆ کەی بووی بە ئەندامی حیزب .دوکتور گوتی : « کاک جەلیلە ئێتر دەڵێی چی؟ ».لام وایە هەر ئەوەش بوو بە هۆ کە دوای کونگرەی پێنج کاک جەلیل نەکراوە بە بەرپرسی تەشکیلاتی حیزب.دەنا خولاٌ هەڵناگرێ بۆ هیچ شتێ سەر بادانی نەبوو.

رۆژی ٩٨١/١١/٢٥ لای ئێوارێ تووشی کاک جەلیلی گادانی بووم،گوتی: ئەم ئێوارەیە کونفرانسی هەڵبژاردنی نوێنەران بۆ کونگرە هەیە .گوتم رەنگە لێرە هەر دووکەس بۆ بەشداری کونگرە هەبن، چونکە بۆ ٢٠کەس نوێنەرێک هەڵدەبژێرن.

گوتی لێرە وانیە. بۆ پێنج کەس نوێنەرێک دێتە کۆنگرە. گوتم :« ئەو فەرقە بۆ چی؟ خۆ ئەوانەی لە دەورروبەری دەفتەر کۆ بوونەوە بەقەولی کاک فەتاحی کاویان بەشی زۆریان توفەیلین بۆ چی ئەو زەحمەتکێش و پێشمەرگەی لە مەیدانی خەبا ت و فیداکاریدان، ٢٠ کەس نوێنەرێک دەنێرن بۆ کونگرە بەلاٌم ئەوانەی لێرە دەخۆن و دەسوڕێنەوە پێنج کەس نوێنەرێک دەنێرن؟ ئەو فەرق و جیاوازیە بۆچی؟ ئەو سەراتی و

ئیمتیازەبۆچی؟ کەی ئەوە د یموکراسی حیزبیە؟ »
گوتی کومیتە ی ئامادە کردنی کونگرە ئەو بڕیارەی داوە.
- ئەوەم پێ کارێکی غە یرە حیزبی و غەیرە دیموکراتیە. نایەمە کونفرانس. ئێوارێ نەچوومە کۆبوونەوە.
ڕۆژی ٩٨١/١١/٣١مەلاسمایلی حاجی و مەلامحمدی خزری هاتن. تورە و بێزار، جنێو بەعەرز وعاسمان دەدەن.ناهەقیان نەبوو، بەهە موو توان و دلسۆزیەوە شانیان دابوە بە رو ئامادە ی کار کردن و تێکۆشان بوون.کاریان نەدەدانێ. وەبەر تەوس و لاتاوی خوێڕیانەیان دەدان.ڕشە ی ساختە یی (تودە یی و لایەنگری تا قمی حەوت کەسە)وەک شیری دیموکلیس لە سەر سەری خاوەن بیران ڕاگیرابوو.دانیشتن و ڕووی توورە یان کردە من ؟« خۆت مات کردوە، زۆر کەس چاوی لەتۆیە، چبکەین، لەگەڵ ئەوانە کار ناکرێ ، دەتشکێنن، خوێڕی پەرستن و...هتد» گوتم پشووتان لە سەر خۆ بێ، لە سە ر ئەو باوەڕەم دەبێ لە حیزبدا بمێنینەوە، هەر کارێکی پێمان بسپێرن بیکەین. جا نەک هەر ئەوان، برادەری دیکەش زۆر دەهاتن و ئەو هەڵوێستەیان هەبوو، بەلام من ئامۆژگاریم هەر ئەوە بوو، ڕەنگە لە هەڵەشدا بوویم.سەیر ئەوەبوو ئەو کۆنە فەرمانبەرانەی ڕێژیمی پاشایەتی گۆڕ کراو کە بە ماستاو سارد کردنەوە خۆیان خزاند بوە نێو حیزب و دوکتور لە خۆی گلدابوونەوە، بەپێتو باوی خوێڕیانەیان بۆ ئە و برادەرانە هەڵدەبەست کە لە ساڵەکانی ٦٤ و ٦٥ وە لە شورش و خەباتی چەکداری و دەربەدەری و برسیە تی دا لە عیراق مابوونەوەو مەیدانی خەباتیان چۆل نەکرد بوو. ناوی (دانشگا دیتووی قە لاذە)یان بۆ دۆزیبوونەوە.لە کاتێکدا بەشی زۆری ئەو کەسانەی لە عیراق گەڕابوونەوە تێگەیشتنی سیاسیان لە زۆربەی ئەوانە زیا تر بوو کە لە نێو سیستمی چەپەلی ڕێژیمی پێشوودا هەر خەریکی

ژیان بوون و لە پڕ بەسەردا کەوتبوون و دوکتور قاسملو کاری پێیان هەبوو.

## کونگرەی پینجەمی حیزبی دیموکرات

ڕۆژی ٩٨١/١٢/٣ ئەندامانی کومیتەی ناوەندی و مشاور کە بۆ بەشداری لە پلینۆمی پێش کونگرە هاتبوون، چەند کەسیان هاتنەلای من و ناڕازیبوون کە بۆ چی بۆ کونگرە بانگ نەکراوم. بەلاَم بەداخەوە ئەوان هەر هەستی ناڕەزاییان هەبوو ، نەک زمانی ناڕەزایی. ڕۆژی دوایی لە کۆبوونەوەدا بەشداری من لەکونگرە باسدەکرێ، دەنگ وەر دەگرن. لە ١٣کەس ٧کەس بۆ بەشدار بوونم دەنگدەدەن، ٥کەس دژ دەوەستن. دوکتر قاسملو دەنگ نادا. کومیتەی نامادەیی دەنگ نەدانی سکرتیر بە موخالەفەت دادەنی و دە نگی ٧ کەسەکە دەخاتە ژێر پێ.

ئێوارەی ٩٨١/١٢/٥ کاک سولتانی شێخاغایی، کاک سەید حەسەنی هاشمی، کاک صدیقی قەری پە نجە هاتنە لام. داوایان کرد کە نامە بۆ کونگرە بنووسم سەبارەت بە بە شداریم لە کونگرەدا. لە گەڵ سوپاس بۆ هەستی دڵسۆزی ئەو هاوڕێیانە، گوتم لە سە ر کەم و کوڕی کاری تەشکیلاتی و سیاسە تی بە رگری و شێوە فەرماندەیی سکرتێر و دەفتەری سیاسی و ناتەواوی کادر وسیستمی کاری کۆمیسیونی بازرەسی نامەم بۆ کونگرە نووسیوە ئەگەر بیخوێننەوەو باسی لە سەر بکەن. بەلاَم لە سەر چوونی خۆم بۆ کونگرە نامە نانووسم. بێجگە لە وە دوو ڕۆژ پێش کونگرە نامەیەکم بۆ دەفتەری سیاسی نووسی و چوومە لای دوکتور قاسملو.لە نامەکەدا نووسیبووم : ئێمە لە کونگرەی چوار پشتیوانیمان لە

کزماری ئیسلامی کردوه، ئیستاش لەگەڵ ریژیم تووشی شەر بووین. لام وایە پشتیوانیەکەی لابەرین بەبێ ئەوەی دروشمی روخانی ریژیم هەڵبگرین. ئیمە داوای خود موختاری دەکەین و دە مانەوێ دەگەڵ ئە و ریژیمەش لە سەر خودموختاری رێککەوین. ئە وده‌م دروشمی روخاندنی بابەتی نابێ. دەکرێ شەری خزمان بکەین، خەبات دریژە پێبدەین، رووخانی ریژیمیش نەکەینە دروشمی سەرەکی.»

نامەکەم دابە دوکتور قاسملو، خوێندیەوە گوتی: «لەگەڵ ئەو ریژیمە هیچ ناکرێ.پاشان ئەوە ئیمە چەند

مانگەدروشمی روخانی ریژیمی خومەینیمان بەرز کردۆتەوەو لە رادیۆدا بلاوی دەکەینەوە. ئیستا لەگەڵ موجاهیدین ریککەوتووین و دەچینە نێو شورای بەرگری میللی». گوتم راست ترسم لە وەهەیە بکەوینە ژێر تەئسیری سازمانی موجاهیدین.

گوتی لایەکەی تریشی هەیە، نەکەوینە ژێر تەئسیری حیزبی تودە. بەلام دیسان نامەکەت لە کونگرەدا دەخوێنینەوە، وە ک پێشنیارێک مەترەحی دەکەین».

رۆژی ۱۹۸۱/۱۲/٦ کونگرەی پێنجەمی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئیران دەست بەکار دەکا.من نەچوومە کونگرە. دوو برادەری حیزبی، رەحمانی کەریمزادە و عەتا هێنا بوویانن بۆ سەفەریان بنێرن، لە میوانخانە تەنیا مابوونەوە.بانگم کردن، مریشکێکم ساز کرد و لێی دانیشتین. سەرەتای کاری کونگرە نوینەرانی تەشکیلاتی مەهاباد و بوکان و سەردەشت دەیکەن بەهەرا، بۆکەریمی حسامی لە کونگرەدا نیەدەچین بزانین بۆ نەهاتوە؟ ۳کەس هەڵدەبژێرن کە بینە لام. دانیشتبووین، کاک حەمەدەمینی عیسازادە لە مەهاباد، کاک مەسعودی حوسێنی لە بۆکان.کاک مەلا عەزیز لە سەردەشت وەژوور کەوتن.من

هۆی بەشدار نەبوونم لە کونفرانس بۆ باسکردن. گوتم چەند کەس بەبێ هەڵبژاردنی کونفرانس بۆ کونگرە بانگ کراون ئەگەر ویستبایان منیشیان بانگ دەکرد. هاتنی من بۆ کونگرە گرنگ نیە، بەلام نامەیەکم نووسیوە داوا بکەن بخوێنرێتەوە.برادەران گەڕانەوە. داوایان کرد بوو کونگرە دەنگ وەرگرێ، گۆیا مەلا عەولاَ دەستەکانی بژارد بوون و پێشنیارەکە دەنگی نەهێنابوو.لە سەر دیاریکردنی ئامانجی نهایی حیزب کە کومیسیون (سوسیالیزمی دادپەروەرانەی) پێشنیار کرد بوو، ببوە هەرا.دوکتور گوتبووی:« کاک کەریم لیرە نیە، بەلاَم کلکی لیرە تۆز دەکا ».گوڕمی ررەوای زۆربەی نوێنەرانی کوتگرە (سۆسیالیزمی داد پەروەرانەی پێشنیاری کومیسیونی بەرنامەی) کرد بوو بە(سوسیالیزمێک کە لەگەڵ هەلو مەرجی ولاتەکە بێتەوە) ئەوە پاشەکشەی کونەپەرستی نێو حیزبی دیموکرات بوو. بەلاَم بۆ دەرفەتێکی تر و بۆ قۆناخێکی ترو بۆ پاک کردنەوەی حیزب لە سەر ویستی مەسعودی رەجەوی کە لەنامەی پیرۆزباییدا بۆ کونگرە دوای

سلاَووهیوای سەرکەوتن، نوسیبووی:« با ارزوی توفیق برای پنجمین کنگرە حزب شما، بر انجام وتصفیەدرونی هر چەبیشتر صفوفتان تاکید میکنم».(بە ئاواتی سەرکەوتن بۆ پێنجەمین کونگرەی حیزبی ئێوە، لە سەر بە جێگەیاندنی پاککردنەوەی زیاتری نێو ریزەکانتان پێ دادەگرم.)

کونگرەی پێنج بە گوێرەی دابی هەمیشەیی حیزبی دیموکرات، (سەر کەوتوو ترین )کونگرەبوو، دوای چوار رۆژ کۆتایی پێهات.بە بۆنەی ئەم سەرکەوتنەمەزنەوە( چوونی نێو شورای بەرگری میللی) ئێوارەکەی کاک تەیفوری بە تحائیکە ببوە ئەندامی کومیتەی ناوەندیش، فیلمێکی جوانی نیشاندا لە کوردستان هەلگیرابوو. دوای تەواو بوونی فیلمەکە، تەیفور گوتی: «جا ئەوە دەبێ،ئەندامانی دەفتەری سیاسی سناریۆی بۆ بنووسن.

لە سەر شێوەی سازکردنی فیلمەکەش قسەی کرد.» دوکتور گوتی:«ئەگەر کەس قسەی هەیە دەنا تەواوی دەکەین».من دەستم بەرز کرد و گوتم :« پرسیارێکم لە کاک تەیفور هەیە. ئەویش ئەوە یە ، ئەند امانی دەفتەری سیاسی کامەیان سەناریۆ نووسی سینەمان و کامەیان لە سەر سینەما و تیاترۆ نووسینیان هەیە.؟ بەتایبەت روو لە وان دەکەی کە ئەوان لە سەری بنووسن؟».هیچ وەڵامی نەبوو، ئەوەندەنەبێ، زۆر لە برادەران تێگەیشتن کەزۆر کەس لە خۆڕایی نابنە ئەندامی کومیتەی ناوەندی.!!

دوای کونگرە زۆر لە برادەران دەهاتن لە سەر کونگرەو بڕیارەکانی باسیان دەکرد. دەر کەوت کە دوکتور قاسملو نامەکەی منی لە بارەی دروشمی ڕوخانی ڕێژیم لە کونگرە دا باس نەکردوە. دیار بوو قسەی دوکتور سەعید ڕاست بوو کە دەیگوت: « نامەی رە خنەو پێشنیاری‌ئەندامانی حیزبی ئەو قازانجەی هەیە کە پیاو دەتوانێ ئاگری کورەی پێ هەڵکات.! ئەوەندەبوو دوکتور سەعید ڕاستەو ڕاست دەری دەبری، دوکتور قاسملوش هەر وای دەکرد، بەڵام دەری نەدەبری.

ڕۆژی ١١/١٢/٩٨١ کاک نەبی قادری و کاک ڕەحیم محەمدزادە هاتنە لام کە هەر تکیان ببوونە ئەندامی کومیتەی ناوەندی. چەند برادەری دیکەش لە وێ بوون. گوتیان ئەرێ کاک کەریم تۆ بەرنامەی دەولە تی کاتی شورای بەرگری میللی ـ ت دیوە وخوێندوتەوە؟

- بەڵێ دیومە، دوکتور بۆی نارد بووم، داوای کردبوو نەزەری خۆمی لە سەر بنووسم.بیرو ڕای خۆشم لە سەر نووسیوە.

- وەڵا دەنا ئێمە نەمانخوێندۆتەوە.

- ئە دی چۆن دەنگتان بۆ داوە و چوونە نێو شورا ؟

- دوکتور قاسملو پێشنیاری کردوەو کونگرەش دەنگی بۆداوە.

رۆژی ١٣/١١/٩٨١ سەرھەنگ قادری لیی گێڕاینەوە بۆ سەر شایی ژنهێنانی فەرە یەدوونی کوری. بەکۆمەڵ چووینە گوندی ئالاوان.زەماوەندێکی فرەخۆش و قەڵەبالغ بوو. بەلام بەداخەوەھەر رۆژی دوایی تووشی شینی کاک ھەژار(سەروان ئەحمەدی جاوید فەر) بووین، کە لە کۆنگرەی پێنج ببوە ئەندامی کومیتەی ناوەندی. ھەواڵێکی داخدار و دڵتەزێنبوو. لە گەڕانەوەدا لە میراوێ مە حموودی ھەرکیم چاو پێکەوت کە ٢٢رۆژ بوو لەگەڵ چەند برادەرێک ناردرا بوون بۆ دەرەوە بۆ خوێندن. بەڵام حکومەتی عیراق لە سنور رایگرتبوون و نەیانتوانیبوو تێ پەڕن.ئەوە سیاسەتی بەعس بوو، تا رەزیلی نەکردبای، دەربازی نەدەکردی. گەڕاینەوە بۆ دەفتەر.دەستمانکرد بە بلاو کردنەوەی سەنەد و بەلگەکانی ( شورای بەرگری میللی). من زۆربەی خاڵە گرنگەکانم لە دەفتەری رۆژانەمدا یادداشت دەکردن . دەفتەری سیاسی ئێمە، بەتایبەت دوکتور قاسملو ودوکتور سەعیدفسوسی خوێری و نۆکەو سیفەتیان ڕاگرتبو و، ھەر چەند شێوەی رەسمی بەشی پاراستنیان پێنەدابوو ، بەلام ئەم شوغلە شەریفەیان پێ ئە سپێردرا بوو. جا ئەوەندەی خوێریبوون ، ئەوەندەش تێنەگەیشتوو .نموونەی سەیرم یادداشت کردوون.:

بەرنامە ی شورا و نامەی مەسعود ی رەجەوی و وەلامی دوکتور قاسملو مان بلاو دەکردەوە، کاک بهروزی کورد ئەحمەدی دەیخوێندنەوە. منیش ھێندێ خالم یاد داشت دەکرد. یەک لەو خزمەتگوزارانە کە خزمی دوکتور یشبوو، ھەر سەری ھەلدێناو چاوی لە نووسینەکەی من دەکرد. ئاخری خۆی پێ رانەگیرا ،گوتی « کاک کەریم بۆ چما دەبێ شتی حیزبی لە دەفتەری خۆت دا یادداشت بکەی؟ »!!

سەرم سوڕما. گوتم راپۆرتەکەت تامی نابێ، چونکە ئە وانەی من یاد داشتیان دەکەم، ئەوا لە رادیۆ بلاویان دەکەینەوە. » یان نموونەی تر.: من

ئەوەندە ی کات و دەرەتانم بوویێ، ئێواران بەشی فارسی رادیۆ موسکوم، گوێ داوەتێ. یەکیش شوغلی شەریفی ئەوەبوو خەبەری دەدا کە کاک کەریم هەموو رۆژێ گوێ دەداتە رادیو موسکو.تا رۆژێک دوکتور سەعید لە میوانخانە گوتی: « کاک کەریم چا ئەوە لە رادیۆ موسکو چ فێر دەبی گوێی دەدەیەی؟ » گوتم تۆ لە رادیۆ ئیسرائیل چ فێر دەبی گوێی دەدەیەی؟ شتی شەرماوی ئاوا زۆر بوون و بۆ باسکردن نابن.

رۆژانە دوای تەواو بوونی کاری رادیۆ، لە ژوورەکەم دادەنیشتم و خەریکی وەرگێڕان و خوێندنەوە دە بووم. سوپاسی برادەرانیش دەکەم کە نەیاندەهێشت بەتەنیا بم و سەرەرای خێمە و هەڵنانی دەفتەر دەهاتنەلام و باسی هەموو کار وباری حیزبیشیان دەکرد.کومیتەی ناوەندی بۆچارەسەر کردنی وەزعی شیمال، چەند برادەری دانا بوون بە ناوی تیمی شیمال، کە بەرنامەو پلانێک دابرێژن. ٩٨١/١٢/٢ـ تیمی شیمال کۆ دەبێتەوە، گەلاڵەیەک ئامادە دەکا و دەیدا بە دەفتەری سیاسی، بەلام دەفتەری سیاسی دژی دەوەستێ.

## سەفەر بۆ سندووسی

رۆژی ٩٨١/١٢/٢٢ لەگەڵ سەرهەنگ قادری و کاک عەبدوڵای قادری و سیامەندی شێخاغایی بۆ سە ردانی خوشکم چوومە سندوسی. لە مەحمەشە میوانی حاجی مەلا مستەفای بووم. ناردم خوشکم هات، دوورزۆ لە لام بوو گەرایەوە. دوای ئە و لە گەڵ سەرهەنگ قادری چووینە گوندی خەلیفەلیان، سەردانی مەلا برایمی تەلاجی.دانیشتبووین، برادەرێک وەژوور کەوت و نامەیەکی دادەستم. تەماشام کرد نووسرا

بوو:« بۆ بەڕێز کاک کەریمی حسامی ، برای بەڕێز ئێمە وەکوو خەڵکی خەلیفەلیان، ئێوەو هاوڕێیانتان بەخێر هاتن دەکەین و هیوا دارین سەر کەوتوو بن. لە لایەن یەکیەتی لاوانی دیموکرات و خەڵکی خەلیفەلیانەوە داواتان لێ دەکەین کە سەعاتی دووی پاش نیوەڕۆ تەشریف بێنن بۆ مزگەوت، تا لە قسەجوانەکانی ئێوەی بەڕێز کەلک وەر گرین. » بە سپاسەوە. یەکیتی لاوانی دیموکراتی خەلیفەلیان و خەڵکی خەلیفەلیان.

نامەکە لەگەڵ ڕێز دانان، فەرمانیشی تێدا بوو. ناچار چووینە مزگەوت.لام وایە کەس نەمابوو نەیەتە مزگەوت. بۆ من شانازیبوو، خەڵکی خەلیفەلیان زۆربەیان دۆست وناسیاری قەدیم و هاوکاری حیزبی بوون . لە سەر سیاسەتی ڕێژیم وبەرنەرەکانی وئەرکی خەڵک بۆ پشتیوانی لەحیزب و یارمەتی بەپێشمەرگە و ئەرکی لاوان بە درێژی قسەم کرد. شەو هاتینەوە ماڵە حاجی مەلا مستەفای کە بووە خانەقاو هەمیشە پڕ بوو.ڕۆژی دوایی چوومە گوندی ماسوێ، سەردانی هەڤاساغای دۆست و برادەری خۆشەویست و نیشتمانپەروەرم.لە وێش خەڵکی گوندی ئەم نووسراوەیان بۆ ناردم: (خدمت سرور گرامی اقای کاک کریم ضمن سلام امیدوارم که همیشه شاد وسربلند باشید.عزیزم تمام اهل روستا منتظر جنابعالی هستند که به مسجد بیایید واز نزدیک با اهل ماسوی چند کلمه در باره کاروبار حزب گفتگو بفرما یید . واگر امروز به مسجد نیایید دیگر ما قبول نداریم برای مهمان به ماسو بیایید. دیگرعرضی نیست منتظر دیدادر شما هستیم .ب.ا.ر. » ناچار چومە مزگەوت و چیم دەزانی بۆ ئەم خەڵکە تامەزرۆیە ی باسی سیاسەت و ڕەوشی حیزب قسەم کرد. بە لێکدانەوەی خۆم هاتمە سەر ئەو باوەڕە کە مە سئولێکی حیزبی نەبوە بچێتە نێو خەڵک و سیاسە تی حیزب و بار و دۆخی وڵاتیان بۆ ڕوون کاتەوە.چەند کیژی ماموستا کە لایەنگری حیزب بوون، لە شار دەمناسین،

لە ماسویٚ گرابوونە ماموستا، چوومە سەردانیان.گلەییان لە مودیر یا مەسئولەکەیان هەبوو کە لەگەڵیان باشنیە و ئیجازەیان ناداتیٚ و گیروگرفتیان بۆ ساز دەکا. خۆشی لە ماڵی قادراغا دەژیا. کە ناورونیشانم پرسی، ئەو کچە بوو کە لە شەری سیٚ مانگە، چەند رۆژ دوای وەدەر کەوتنم لە مەهاباد، ئەویش هاتبوە دە ر ولە کوێچکەدەریٚ، ناردبوومەوە نێو شار وچەند ناوی ساختە و رەمزیم بۆ دانا بوو، لەنێو شار هاوکاری دەکرد. لە دوام نارد، چوبزوە شار.ناوە ساختەکەیم دا بە یەکێک لە ماموستاکان و گوتم ئەگەر هاتەوە بچو بەم ناوە بیدوێنە و بڵیٚ فلاٌنکەس لێرە بوو دە پویست بتبینیٚ. دیارە لە بنەوە هاوکاریان دەکەی.پاش ماوەیەک نامەیان بۆ نووسیبووم و گەلێک لە مودیرەکەیان رازی بوون.دوای چەند رۆژ گە ڕامەوەلە بەری پیرانان چومە زیارەتی کاک سەید تەهای شێخی گەسگەسکیٚ.لە گەڵ ئەوانٚ و براکانیشی لە عیراق نێزیکی و دۆستایەتیم هەبوو. لە گەڵ جەنابی شێخی باسێکی خۆشمان هەبوو. نەزەری ئەوەبوو ئاغاکان دڵخۆشی بدەینەوە، لە دەوری حیزب کزیان کەینەوە، جاریٚ واز لە خەیاتی چینایەتی بینین.قسەکانی دڵسۆزانە بوون. بەیانی دەگەڵ مەلارەسوی گەردی چوومە گوندی چەڕانیٚ، خوشکێکم لە ویٚ بوو سەری بدەم.

شەوی ساڵی تازەی زایینی ١٩٨٢ لە گوندی ترکەشی میوانی سەید رسوی بابی گەوڕەبووم.هەرچی بینووسم لەبارەی پیاوەتی و میوانداری سەید رەسوری ڕەحمەتیەوە زیادیە. شەوێکی یەکجار خۆشمان رابوارد. ساڵی پڕمەینەتی ٩٨١ مان بەرێکردو بیرمان لە داڕۆژی پڕ مەینەت تر دەکردەوە. رۆژی دوایی هاتمەوە دەفتەر، ژوورەسارد وسڕەکە ی خۆم. دیارە ژوورەکەی من زۆر گرێن و کەسادیش نەبوو. بۆچما دۆست و برادەر دەیانهێشت هەست بەنەداری بکەم. عەبەی رەسووپیرۆزی بێچکە لەوە کە

لە ناردنی خواردەمەنی لێم خافڵ نەبوو، سەماوەرێکی جوانیشی بەهەموو دەزگاێکەوە بۆ هێنابووم جارێکی دوکتور قاسملو هۆی ئەو دەستایەتیە ی لەگەڵ منی لێ پرسیبوو. برادەرێک چرای گازی بۆ هێنابووم، چێشتی لە سەر ساز دەکرا. ئە بوو سەرباز دەدوازدە قوتوی گازی بۆ ناورد بووم. ماموستا مەلامحمدی عوسمانی هەنگوین و رۆنی کەرەی بۆ نارد بووم .بەکورتی ماڵەکەی من لەو دۆڵە هەستی بەنەبداری نەدەکرد.داخەکەم ئێستا لە سوپاسێکی رووت زیاتر جیدیم لە دەست نایە بۆ پاداشی ئەو هەموو چاکەو هەستی هاو دەردی و جوامێریان پێشکێشی بکەم.

کەگەڕامەوە، عەلی کاشفپور و شاپور هاتنە لام.گوتیان لەگەڵ کاک نەمیر وکاک نەبی قادری و کاک رەحیمی محمدزادە و جانگیر نامەیەکمان بۆ دەفتەری سیاسی نووسیوە. لە سەر مەسەلەی شیماڵ ئیختلافمان هەیەو ئێمە دەمانەوێ بڕۆینەوە ، دەفتەر نایەوێ مەسەلەی شیماڵ چارەسەر بکا.گوتم :« مەڕۆنەوە، لێرە قسەی خۆتان بکەن و لە چوار چێوەی ڕاو تەگبیری کۆمیتەی ناوەندیدا مەسەلەی شیماڵ چارەسەر بکەن.با ناکۆکی قووڵتر نەبێ.»

رۆژی ٩٨٣/١/١٤ لەگەڵ حەسەنی سوسیالیستی تورکیا چووینە راوان. لە وێ دەگەڵ پێشکاری و عەبەی رەسو پیرۆزی چووینەمیراوێ.لە پێش دوکانان کۆمەڵێک لە لاوانی میراوێ و خەڵکی دیکە لێم وەکۆ بوون و لە سەر سیاسەتی بەرگری حیزب و ناکۆکی حیزب و کۆمەڵەو هاتنی مرجاهیدینی رەجەوی بۆ کوردستان و شتیتر سوئاڵ پێچیان کردم.زۆر جار دەمگوت بچن لە بەر پرسەکانی حیزب پرسیار بکەن. زۆریشم وەڵام دەدانەوە.خواو راستان سەید رەسو پەیدابوو، چاک بوو جارویار لەنگەری بۆ رادەگرتم.لەو باس وخواسەدا، کابرایەک پەیدابوو، ریش نەتاشراو،

سنگ و بەرۆک ئاواڵە شپرێو ، باڵتەیەکی قوڵە دەبەرداو دەمانچەیەکی چاردەخۆر بە قەدەوە، هاتە پێش و قسەی خەڵکی بڕی و سلاوێکی کرد و گوتی : «دەڵێم ئەوە نامناسی؟» سە یرێکم کرد و :گوتم، بەخێر بێی ، بەڵام ناتناسم.

- ئەی... جا چۆن .. دەڵێم بایزە بۆرم..

ئەو بایزە لە بەرگی یەکی بیرەوەریەکانمدا باسم کردوە کە ژاندارم گرتبوویان و لە زیندان، دڵخۆشیم دابۆوە و بارمەتیم دابوو ترسی شکابوو رۆژێک هات گوتی:« ئەرێ کاک کەریم دەڵێم زیندان هەر ئەوهیە؟ »

- ئەدی بایز پێت وابوو زیندان چیە ؟ هەر ئەوەیەو هیچی تر. گوتی:« ئەگە ر وابێ ، هەرسێک تەلاقم کەوێ ژاندارمم پێ ژنێ خۆش نیە .!!

جارێکی تر بەخێر هاتنم کرد و بایز ئیدی رێی خەڵکی نەدا و دەستی گرتم و گوتی : « دەڵێم بایزەبۆرم ..هەر سێک تەلاقم کەوێ،چوار سەد مەڕم هەیە ، هەر سێک تەلاقم کەوێ،ئەسپ و ماین و هێستری دەباشم هەن ، هەر سێک تەلاقم کەوێ تفەنگ و دەمانچەی چاکم هەنە ،هەر سێک تەلاقم کەوێ،ماڵم لەگرد شەیتانیە، هەر سێک تەلاقم کەوێ، هیچیان ئیدەمن نینەو هە موویان ئیدەتوونە وجا چت لازمە تالە بۆت بنێرم. »

خەڵکەکە واقیان وڕ ماە سەید رەسوو یادی بەخێر بێ، گوتی :بایز ئەوانەی هیچیان ئاوێ. لبادێکی باشی بۆ بنێرە، ئێستا لەو شاخە لە سەر عەرزی دەنوێ. »

دوای دوورۆژان سەید ڕە سوو پە یدابوو لبادێکی رەشی ئە ستووری هێنا بوو ،گوتی : کاکە بایز دوو لبادی ناردبوون، ئە وی باشم بۆتو هێناوە. »!

دوای نیوەرۆ لە میراوێ دەگەڕامەوە لە موسالان تووشی دووبرادەری

سەردەشتی بووین، بە ناوی موکری و حەکیمزادە. ئەمدەناسین و هەوەڵجار بوو ئەوانیش منیان دەبینی.کە عەبەی رەسو پیرۆز گوتی: ئەوە فلانکەسە، پێشی ماشینیان گرت و بە سوێندو تەلاق، ناهێڵین بڕۆی. لەگزمان میوانداریمانە و لەگەڵمانی.پێشکاریمان بەرێنکردەوەو بەپێیان داگەڕاینە خواری. تووشی مەکۆ وتاهیریش بووین لەمیراوێ دەگەڕانەوە. ئەوانیش لە دەفتەر کاریان دەکرد.بووینە حەوت کەس و لە چۆمی پەڕینەوە و چووینە گزمان ، ئێستاش سەرم لەو داوەتە سوڕ ماوە. لەگوندی، ٢٠کەس داوەت کرابوو. هیچ جێژن وشایی و بۆنەیەکیش لەگوڕیدا نەبوو. ویسکی و کەبابی قەل و میوەو دەزگای وا لە شارەکانیش کەم دەبینرا. نیوەشەو دایدا بەفر و کرێوە تا بەیانی چۆکێک بەفر باری.بەیانی مەلا سمایل بۆ فراوین ڕایگرتین، کە بەسەر سەنگی کرابوە مەسئولی رێکخراو لەگزمان.دوای نیوەرۆ کەوتینەرێ، بەفرێکی زۆر، بەزەحمەت لەو هەورازە سەر کەوتین و گەیشتینە شێلمان.چووینە مزگەوت، شەکەت وهیلاک.چایان بۆ هێنایین، تۆزێک حەساینەوە، سێ،چوار زەلام وەپێشمان کەوتن کە تا دەفتەر لەگەڵمان بێن. بەفر زۆر بوو، بارێنی کرد بوو، دەرنەدەچووین، ناچار گەراینەوە. من و کاک حەسەنی سوسیالیست چووینە ماڵی ئە لیاسی مام خدری، رەببی ماڵ هەر ئاوەدان و دڵی هەروا فراوان بێ و کوردستانیش قەت ماڵی ئاوای لێ نەبڕێ. برادەرانی دیکەش چوونە ماڵێکی دی. بەیانی بەفر لیێ کردەوە، تاو هەلات.کەوتینەرێ، بەنۆرە وەپێش دەکەوتین و ڕچەمان دەشکاند. رێگانەمابوو، لە پرلە بە رزایێ بەسەردەفتەرێدا کەوتین و گەیشتینەوە ژوورەکانمان.

لام وایە هەر لەو بەفرو سەرماو سۆڵەدابوو ئێوارەیەک کاک رەحیمی ئەمیری ئەشریفی هات و شەو میوانم بوو. زۆرم پێخۆشبوو.بێ ئەوەی

نیزیکی و ناسیارێکمان هەبێ کەسایەتیەکم تێدا بە دی ئەکرد و پێم خۆشبوو لە سەر بارو دۆخی بزووتنەوەو سیاسەتی حیزب بیرورای بزانم.زۆر لەو برادەرانەی دەهاتنەلام، تەت جارێکیش نەبوو کەمن بۆ باس و خواسی حیزب وخەڵک وچونیەتی کاروتێکۆشان وەپێشیان کەوم. دەهاتن و خۆیان دایان دەمەزراند و راز وگلە یی وەردیان هەڵدەرشت، منیش ئامۆژگاریم هەر ئەوە بوو کە لەم هەل و مەرجەدا، پێویستە کار بکەین و بەگوێرە ی توانا بۆ کەمکردنەوە ی کەموکوریەکان تێبکو شین. دیارە بەگوێرە ی ناسینی خەلک وەلامم دەدانەوە.کەم کردنەوە ی کەموکوریش هەرقسەبوو دەمکرد، دەنائەوانەی سەرەپەتیان گرتبوو دەست، پێیانوابوو لە خۆیان بەدەر کەسیتر هیچ نازانێ و رێگاشیان نەدەدا کەسیتر کارێکبکا. ئەو شەوە پێم خۆشبوو دەگەڵ کاک رەحیم باسێک دامەزرێنم.بەلام هەر رەژورر کەوت ولە بەر ژانە سەر هاواری بوو .گوتی شەو وروژێکە ئارا و قارام لێ هەڵگیراوە، ژانە سەر هیلاکی کردووم.گوتم : « دەرمانێکم هەیە، یەکاویەکە. بەچەنددەقیقە حەلەمت لێ دەبڕێ. بەلام عەیبێکی هەیە، دەرمانی ولاتی سوسیالیستییە. »

کاک رە حیم بزەیەکی هاتێ و گوتی : « جارێ تۆ بیهێنە، با ئە و ژانە سەرم بڕوا ،کوشتوومی. » دەرمانم بۆ هێنا ، زۆری پێنەچوو، ژانی سەری نەما ، خەوێکی باشی بۆکردو بەیانیش زوو هەستا و پێم وابوو، بۆ ئەوەی کەس نەیبینێ کە لای من بوە، وەدە رکەوت وقەتیش سەری نەدامەوە. خوێنەری بەرێز پێی سەیر نەبێ کە دەڵێم (بۆ ئەوەی کەس نەیبینێ) چونکە لە دیموکراسی حیزبی دیموکرات دا ، هاتوچۆی ئە فراد حیسابی لە سە ر دەکرا. من نمونەی کاک سە ید حەسەنم هێنایەوە کە لە سە رهاتووچۆ کردنی لای من فەتاحی کاریان خەریکبوو پەروەندە ی بۆ ساز کا.من چومە لای دوکتور ولە سە ر ئەو سیایەتە بەتوورەیێ بەگژی

داهاتم، دوکتور گوتی :« تۆ دەبێ ئەوانە بناسی، ئەوە نەسیاسەتی حیزبە ونە هەڵوێستی دەفتەری سیاسی، ئەوە ئەخلاقی شەخسیبە». بەلام وانەبوو، سیاسەتی رەسمی دەفتەری سیاسیبوو. چونکە لە ئالان کاک حامیدی گەوهەری داوەتی کردبورم چورمە لای. دوایە دوکتور خۆی نامەی بۆ نووسیبوو کە بۆچی فلانکەست داوەت کردوە بۆ زیندانی حیزب »!!

رۆژی ٩٨٢/١/٣٠ یەک دووکەس لەکورەکانی یەکیتی لاوان لە ژوورەکەم وەژوورکە وتن.پێمسەیربوو. چۆن هاتوون و خانوەکەی منیان دۆزیوەتەوە.چاک وخۆشی و بەخێر هێنان، پرسیم : ئەوە چونە وا رێتان لێ هەتلە بوە؟

گوتیان لە نیزیک پاراستان کلاسی دەرسیان بۆ داناوین. پرسیمانە ئەدی کاک کەریم بۆچی نایەتە دەرس گوتنەوە؟ دوکتور سەعید گوتویە: « لە بەر کاری رادیۆ ونووسین بۆ رۆژنامە، پێڕاناگات. »! ئێمەش بێ ئەوەی پرس بەکەس بکەین،گوتمان بابچین سەرێکی بدەین.

رۆژی دوایی بەدوکتور سەعیدم گوت : بۆچی لەکلاسی لاوان دەرسێکتان بۆ من دانەناوە؟.گوتی :« کرا خۆ ئەوە کلاس نیە. تەیفور هێندێکی لە کورەکان هێناوە، وەک پیکنیک بۆ ناسینی یەکتری لێکی کۆ کردوونەوە. » هەر بەدوای ئەودا کاک مستەفای شەڵماشی وتارێکی نوسیبوو هێنای، گوتی : کاک کەریم هانێ تەماشای کە، بە پەلەبووم، چونکە دەبێ بچمە کن کورەکان دە رسم هە یە لە کلاسی لاوان.!!!

لە دۆلی دیمرکرات داپێکی جوان دامەزرابوو.هەمور شەوی یەکشەمزیان لە سالۆنی خواردن و میوانان کۆ دەبوونەوە، جاری وابوو لەگوندەکانی دەوروبەریشەوە دەهاتن، برادەرێک لە سە ر مەسەلەیەکی رۆژ باسێکی دادەمەزراند رقسەی لە سەر دەکرد و برادەری دیکەش بەشداریان دەکرد و بیرورایان دەردەبری. زۆرجار ئەگەر دوکتورقاسملولە

ماڵبایە، ئەو باسیدەکردو بەشی زۆریش دەیهێناوە سەر شیکردنەوەی وەزعی ڕێژیمی خومەینی و لە ڕوخانی نیزیک دەکردەوە. جارێکی کاک سمایلی بایەزیدی لە ناوچەی سەقز گەڕابۆوە، هاتە ژوورەکەی من و باسی وەزعمان دەکرد،گوتی: «ئەرێ کاک کەریم ئێستاش ئێوارەی دووشەموان هەر دەیڕوخێنن؟» گوتم چۆن، ئێمە دەست لە ڕوخاندنی هەڵناگرین.گوتی: وەڵاهی بە ماڵە شێخی نایبینن.!

شەوی ٩٨٢/١/٣١ من و دوکتور سەعید و فەتاحی کاویان بەشورای بەرێوەبەری کۆبوونەوەکان هەڵبژێردراین. ئێمە دەسەڵاتماندا بەکاک فەتاحی تا خۆی کۆبوونەوەکان بەڕێوە بەرێ. ٣ ڕۆژپێشتر بەبەکێکی ڕادەگەیاند کە ئەم حەفتەیە، ئەو قسان دەکا.

ڕۆژی ٩٨٢/٢/٦ پاش ٦مانگ بێخەبەری لە ماڵێ، نامەی شلێر ودایکی کەماڵیم بۆهات. فرە شاد بووم. بەڵام نووسیبوویان کەماڵ لە ددانسازی وەر نەگیراوە، بە وەشادیەکەم گۆڕا بە خەم و فیکرێک. بە داخەوە بە پێچەوانەی« انمع العسریسرا »،هەمیشە «انمع الیسر عسرا» تووشی من دەبوو. دەچینە سەر شایی دوایە بەسە ر شینی جاوید فەڕ دادەگەوین.دەچینە میوانیەک، خەبەری پەلاماری ئە رتەش و شەهید بوونی پێشمەرگەمان بۆدێ.

ڕۆژی ٩٨٢/٢/٢٩ دە چوون بۆ ئوروپا.نامەم بۆ دایکی کەماڵ و منداڵەکان نووسی، دووربینێکی فیلم بەرداریم هەبوو،تێکچوبوو، ناردم بۆکاک عەزیزی ماملێ، چاکی کاتەوە.

هەشتی مارسی ١٩٨٢ ڕۆژی جیهانی ژن، برادەرانی ئێمەش بڕیاریاندابوو ئەم ڕۆژە میوانداری و کۆبوونەوەیەک بەم بۆنەوە ساز بکەن.من کارتی پیرۆز بایيم بۆ هەموو ژنەکانی دەوروبەری دە فتەری سیاسی ناردبوو.خوشکە بەهاری خێزانی کاک بهرووزی کورد ئەحمەدی لە

وەلامی کارتەکەی مندا ونرای سوپا س نووسیبووی: ئەوە هەوەلینجارە کە مەسئولیکی حیزبی دیموکرات نرخ بۆ ژن دادەنێ.» دیارە حوشکە بەهار لوتفی کرد بوو دەنا من نەمەسئول بووم و نەهیچ! کاک فەتاحی کاویان بە پە روین خانمی خیزانی کاک ئەبوبەکری هیدایەتی گوتبوو کە بە بۆنەی ٨ی مارس، رۆژی جیهانی ژن، لە کۆبوونەوەدا قسان بکا. پەروین خانم هاتەلام و گوتی:« کاک کەریم بەمنیان گوتوە، ئێواریٚ لە سەر رۆژی ژن قسە بکەم. من هیچم نیە. نازانم چ بلێم؟». دیارە پەروین خانم زۆرجاری دیکەش دەهات لە سەر وەزعی حەشیمەت وخە لٚک وکانگاو پیشەسازی و سیاسەت و بەرنچوونی ولاتانی سوسیالیستی پرسیاری لیٚ دەکردم ویاد داشتی دەکرد. پیم خۆشبوو تاقەژنیکی دەرووبەری دەفتەری سیاسی بووکەحەزی لە فیٚربوون و زانین بوو. لام وایە گەیشتبووینە کورەی شیمالی. پیم گوت : شتیکت بۆ ئامادە دەکەم بیخوینەوە. نووسراوەیە کی رێکوپێک و جوانم ئامادەکرد ودام بە پە روین خانمکە بیخوێنیتەوەو خۆی بۆ سازکا. شەو خەلٚکیکی زۆر لە کۆبوونەوەدا بەشدار بوون. پیاو هەق بلیٚ لەو پەری پاراوی و رەوانی وجوانیدا وتارەکەی خویندەوە و گیانی وەبەرنا. پیشوازیەکی باشی لیکرا. دوای خویندنەوەی وتارەکە کاک تەیفوری بەمحانی دەستی بەرزۆ کرد وداوای ئیجازەی کرد. ئیستاش بۆم روون نەبۆوە هۆی ئەم هەلٚویستگرتنەی کاک تەیفور چبوو. جاریٚ لە پیشدا رەخنەیەکی توند و نا رەوای لە خویندنەوە ی پە روین خانم گرت و لە نیوەرۆکی وتارەکەش.دوایە کاک تەیفوری چەپی لە چەپ هەلٚبراوی تازە دیموکرات، هیرشیکی بیٚ ئینسافانەی بردەسەر بیروباوەری سازبوونی هەشتی مارس ودانانی رۆژی ژن وداب و رەسمی بەریوەبردنی رۆژی جیهانی ژنی بەخەسلٚە تو رەوشتیٚ بورژوازی داناو شرت وشۆی هیٚنادەر و هیچی پیوە نەهیٚشت. بۆچوونەکەی ئەوەندە غەیرە دیموکراتیانەو

غەیرەزانستی بوو، بەتایبەت کەمێژوو ورابردووی ئەم رۆژەی پوچ دەکردەوە، چار نەبو دەبوایە وەدەنگ بێم. زۆر بەخەستی بەسەر بۆ چوونی سەیری کاک تەیفووردا هاتم و دیفاعێکی رەوام لە نیوەرۆکی وتارەکەو لە شێوە خوێندنەوەی پە روین خانم کرد و هێنامەوە سەوخۆ، چونکە زۆر پێ تێکچوو بوو. هێندێ لە برادەران پشتی بۆچوونەکەی منیان گرت .دوکتور سەعید گوتی: کاک کەریم دەزانی کەی وەدەنگ بێ. ئێستا ئەگەر لە کوردستان هەڵبژاردن هەبا، هەموو ژنی کوردستان دە نگیان بۆ دەدا.کۆبوونەوە تەواو بوو. چوومەوە ژوورەکەی خۆم، ڕاکشابووم و چرام کوژاندبۆوە، لەدەرگایاندا، کە دەرگام کردەوە، پەروین خانم و کاک ئە بوبەکر، کەشەفێک شیرنی و ئاجیلیان هێنابوو، هاتن دانیشتن و گەلێک قسەی خۆشمان کرد. بەلام بەداخەوە ئەم لوتف و شیرینیە،ئاخر جاری بوو، چونکە رۆژێکی دیکەی ئاواش هەڵنەکەوتەوە.!!

رۆژی١٤/٣/٩٨٢ بابی کاک فەرەیدونی میتران، دوای نەخۆشیەکی درێژ لە گوندی نواوێ کۆچی دوایی‌کرد. زۆربە ی برادەرانی دەوروبەری دەفتەری سیاسی چوونە نواوێ. خەڵکی گوندی بەخری و تەنانەت گوندەکانی دەوروبەریش هاتبون.کاک فەتاحی کاویان و کاک جەلیلی کادانی وەک ئەندامانی دەفتەری سیاسی بەشداری ناشتنەکە ی بوون.دوای ناشتن و تەلقین، دەیانویست بلاوەی بکەن. بەکاک جەلیلم گوت: ئەوەئەندامێ حیزب بوە، سەبارەت بەتێکۆشان ئاوارە بوە، پێویستە قسەی لە سەر بکەن و هەروا بەوشکی بلاوەی نەکەین. کاک جەلیل گوتی : جا کەوایە فەرموو خۆت قسەبکە. زۆرم پێ سەیربو. کاک جەلیل بۆ وتاردانێک سەری دەرێدا نەبوو، لێرە کەئەو هەموو خەڵکەش کۆ ببۆوە،قسەی نەکرد.دوو برادەری دیکەش وەک من ئەوەیان بۆ ساغ نەدەبۆوە.ئاخرەکەی برادەرێکی لە دەفتەر تیزیک گوتی: فەرەیدوون

تاوانی تودەیی لەسەرە،بۆیە کاک جەلیل خۆی لێ نەداوە، وەبالْ بە ەستۆی راوی،!! من لەگەڵ سەرەخۆشی لە کەسوکاری ، لەگەڵ سوپا س لە بەشداربوانی ناشتنی،گوتم : هاودەردی ئێوەی خەڵکی بەشەرەف و نیشتمانپەروەر نیشانیدا کە ئەوانەی دەربەدەری پەلاماری ئەرتەشی دژی گەلین، ئاوارەو بێکەس نین و کوردستان هەمو پە ناگای وانەو کوردیش هەمور کەس‌و کاریانن.هەر چەند کاک فەرەیدون لێرە نیە بەلام گەلێک لە هاوکاور ودست وبرادەری فەرەیدونی لێرەن و خۆیان بەشەریکی خەم و پەژارە دەزانن.

گەراینەوە بۆ گوندی و چووینە بەردرگای مالی کۆچکردوو، پاشان چووینە بەر دەرگای مزگەوتێ . لاوەکانی گوندی لێم کۆبوو نەوە و لە سەر سیاسەتی حیزبەسیاسیەکانی ئێران و پێوە ندی نێوان کۆمەلەو حیزب و لە سەر کونگرەی پێنچ و هۆی نەچوونم بۆکونگرە،دەستیان کرد بەپرسیاران.بەگوێرەی توانا وەلامم دە د ا نەوە، مام بایز ناوێک،لام وایە کاک جەلیل لەخانووی ئەودابوو، گۆچانێک‌بەدەستەوە،هاتەپێش و گوتی:

«جا کاک کەریم دەلێم ئەمنیش پرسیارێکم هەیە».

- فەرموو مام بایز، ئەتۆش پرسیاری خۆت بکە .
- دەلێم پێم وایە ئەتۆ ژنی جوانت خۆش دەوێن !
- نا مام بایز، بۆی نەچووی...ژنی جوان ئەمنیان خۆش دەوێ.
- ئا ...ها .. جا دەلێم ئەوە دەقسەکێ گەیشتم..

برادەرانی دەوروبە رگەلێک پێکەنین وشە و گەراینەوە بۆ دەفتەر.رۆژی دوایی لەگەڵ کاک سەید حەسەن و دووسێ برادەری دیکە چووینەوە نواوێ و لە مزگەرت سەرەخۆشیماندانا و لە راستید ا ئێمە خاوەن مردوو بووین و سەرەخۆ شیمان لێدەکرا.

کاک مامەندی نواوی کەلەکاتی خۆیدا ئاغا و زۆردار بوە، ئیسلاحاتی

عە رزی شاملکی پیێ نەهێشتوە و تا رادەیەک لەڕی کردوە. بـەلاّم فیزی دەرەبەگایەتی و هەستی ئاغایەتی لە کەللەیدا هەر ماوە .لە مزگەوتێ قورعانێکی دەست دابـوبەو بەغـەڵت دەیخوێند و سەروگوێی ئایەتەکانی دەشکاند و جار وباریش لەپڕ هەر بەهەوای ئاغایەتی جاران دەنگی یەکێکی دەداو جنێویشی پێدە دا. کاک مامە ند لە من دوور دانیشتبوو، هەستا هاتەلام دانیشت و بەخێر هاتنی کردم و گوتی:

- دەلیم ئەتو لە ئێدەکێی؟

- منیش کوردێکم وەک ئەم خەڵکەی کوردستان.

- ئەتوو نا نا ... بە سەری من...خۆ لە من مەشارەوە ... لە ئێدە ماڵە کەریماغای؟ یا لە ئێدە کۆسەکەرێزێی؟

- نا...کاک مامەند من ئاغانیم، کوڕە جوتیارێکی گوندیم.

- وانیە، دەلیم خۆت لەمن مەشارەوە.

کاک مامەند نەیسەلماند.ئاهەقیشی نەبوو،

سەروسەکوت و لیباسی پاکو خاوێنم لەو چیاو کەژە، پتر وەئێ کوڕە ئاغـایان دەچـو،تا زەحمـەتکێش و یان بەئیستـسلاحی چەپـی خوار وەئی(شۆڕشگێڕان ) چووبایە.ڕۆژێکی دیکەش لەگەڵ کاک سەیدحەسەنی هاشمی، دەچوویـنـەوەسەرێ، تووشی کاک مامە ندی بووین.دەستی پێکردەوە، گوتی:

- ئاخری خۆت لە من شاردەوە، نەتگوت لە ئێدەکێی؟ کاک سەید حەسە ن گوتی:« کاک مامەند راستیت پێ ناڵێ،دنا ئەویش دەرەبەگێکی چەکمە رەقبوە و لە کاتی خۆیدا سەگ و زەلا می لێک دەبەست.

کاک مامـەنـد گوتـی : « لەبـخۆ دەزانم، بـەلاّم خـۆم لـێ وەراست ناگێڕێ. »

ئێستاش کاک مامەند بڕوای نەکرد کە من لە جسنی ئاغار دەرەبەگ

نیم و لە زوڵم و زۆری بێزارم و لەگەڵ جسنی دەرەبەگ و زۆردار ئاوم بە جۆگەیەکدا ناڕوات.

## نەورۆزی ساڵی ١٣٦١.

٩٨٢/٣/٢١ لە سالۆنی کونگرە، ئاهەنگی نەورۆزمان بەڕێوە برد. بِرادارانی حیزبی سوسیالیستی کوردستانی تورکیا شانۆیەکی فرەجوانی گاوەیان نیشاندا. کاک ئازاد لە پێشەکی شانۆکەدا، وتارێکی زۆر جوانی لە سەر پلان و پڕوپاگاندەی ئیمپریالیزم و کۆنەپەرستی پێشکێش کرد. چەند هەڵپەرکێی جوراو جوری زۆر جوانیان بەڕێوە برد.

ڕۆژی ٩٨٢/٣/٢٢ خەبەری شەهید کردنی مامۆستا مەلاکەریمی شاریکەندی بڵاو بۆوە. دوکتور سەعید وتارێکی توند و جوانی بەم بۆنەوەنووسی و لەگەڵ مەحکومکردنی ئەو جنایەتە بێ شەرمانەیە داوای لە مەلا شێخ عیزە ددین کرد کە بۆ مەحکومکردنی ئەم جنایەتە بەیاننامەیەک بڵاو بکاتەوە، چونکە خەڵک ئیشارەیەکی دەستی ئەو لەم جنایەتەدا دەبینن. وتارەکە دووسێ جار لە ڕادیۆدا خوێنرایەوە. بەداخەوە مامۆستا خۆی لەم جنایەتە کڕکرد و هیچی لە سەر بڵاو نەکردەوە.

ئێواریٚ برادەرانی شیمال هاتنەلام. گوتیان ٩٨٢/٣/١٩ دەفتەری سیاسی بە نامەیەک هەیئەتی بەڕێوەبەری کاروباری شیمالی هەڵوەشاندۆتەوەو لە مەسئولیەتی خستوون. کە لە لایەن کومیتەی ناوەندیەوە پەسند کرابوو. کاک ئەمیری قازیش لە نامەیە کدا ڕەخنەی لە بڕیاری نا ڕەوای دەفتەری سیاسی گرتوە. گوتیان ئیتر لێرە مانەوەمان پێ کەڵکەو دەچینەوە بۆ شیمال. دیسان گوتم بێننەوە، تا پلێنومی کومیتەی

ناوەندی و لە ویدا قسەی خۆتان بکەن.

رۆژی ٩٨٢/٣/٢٩ ئەبو حیکمەت و ئەبو سەلیم هاتن. لە دەفتەرەوە تەلەفوونیان کرد،چوومە لایان. شەو بەبۆنەی رۆژی شەهیدانەوە کۆبوونەوەی گشتیمان هەبوو. کاک فەتاح داینا بوو کە لە سەر ژیانی پێشەوا من وتار بدەم. دوای کۆبوونەوە تا شەو درەنگ لە لای هاورێیانی حیزبی کومونیستی عیراق بووم. ئێوارە یەکی تر لە سالۆنی میوانخانە، لە سەر ئەخلاقی شۆڕشگێڕی و دیموکراسی حیزبی قسەم کرد، من دێموکراسی حیزبیم بەوەدەزانی کە ئەندامی حیزبی هەقی هەیە لە هەموو شوێنێ بیروڕای خۆی دەر ببڕێ و رەخنە بگرێ.کاک مستەفای شەلماشی کە کرابوە ئە ندامی دەفتەری سیاسی، لای وابوو کە ئەندامی حیزب تەنیا لە شانەی حیزبیدا هەقی هەیە رەخنەبگرێ . باسیکی گەرم و دۆستانەمان هەبوو. برادەرانی دیکەش بەشداری باسەکە بوون .کاک بهرووزی کورد ئەحمەدی نۆرەی وەرگرت و گوتی: « کاک کەریم بەم باسە دە یەوێ بیر و باوە ڕی تاقمی حەوت کەسە بێنێتەوە نێوحیزب، ئەو زەمانە بەسەر چوو، نابێ رێگا بدەین ئەو دەستەیەو بیروڕایان لە نێو حیزبدا زیندووبنەوە.» د یارە کاک بهروز ناهەقی نەبوو ئەگەر ئەو دیفاعە لە (دێموکراسی) بکا، خۆ بە خۆڕایی نەکرا بوە ئەندامی کومیتەی ناوەندی. کاک فەتاح گوتی : کاک کەریم وەڵامی بهرووزی دەدەیەوە.؟

گوتم کاک فەتاح من وەڵامی ئەم جورە قسانە نادەمەوە . دوکتور سەعید گوتی: بۆچوونی بهرووزی راست نیە. کاک کەریم ئەندامی حیزبەو بە سەداقەت ئەرکی خۆی بەرێوە دەبات.

دیارە دیفاعی دوکتور سەعیدی لە بەر دڵسۆزی بۆ من نەبوو، کورەکانی سابلاخی کە لە چاپەمەنی و رادیۆدا کاریان دەکرد، بەناهەق لەگەڵ بهروززی یەک نەبوون. دوکتور سەعید ویستی لەو پەتایەوە

نەقورچێنک لە کاک بهروزی کورد ئەحمەدی بوەشێنێ.

ئێستا ماوەیەکە فەردینی کوری سەرهەنگ قادری هاتوتە لام و پێکەوەدەژین. بەهاتنی ئەو زۆرم بیر لەمندالْکانم نەدەکردەوە. چونکە هەتا بلْێی روح سووک و ژیر وخۆشەویستبوو. خاوەنی بیر وباوەڕێکی پێشکەوتوو خوا زانە لە هەمووی گرنگتر حەزی لە خوێندنەو و کاتی خۆی بەزایە نەدەدا. ئەو عەیبەشی هەبوو ئەوەندەی پرسیار لە من دەکرد، جاری واهەبوو لە کار دەبورم و هەر پێم دەکرا جوابی وی بدەمەوە.

بەراستی خۆشی ئەوڕۆژانە قەت فەرامۆش ناکەم کە لەگەلْ فەردین پێکەوە دەژیاین. ئێوارەیەک کەهاتمەوە ژوورەکەم، دروتەنەکە بیزای خەلسبوی ترشیاتیان لە بەردەرگاکەم دانابوو گوتیان برادەرێنک هێناویە. ئەو هەموو بیزایە چ لێبکەم، تەنەکەیەکم لە جیرانان بەشکرد و تەنەکەیەکیشم بۆ مالی کاک صدیقی قەوی پەنجەنارد.

لەو سەرو بەندەدا مەلا سەید جەلال بەرنامەی ( رێکخراوی خەبات )ی بلاو کرد بۆوە. پێم خۆشبوو دەقی بەرنامەکە بەدەستەوە بایەو بلاوم کردبایەوە، بەلْکوو کوردەکە لە ئاخری سەدە ی بیستەمدا، تێگەیشتبا یە کە چۆن سەوداگەرانی شەڕ وپولْ و فیزوفیشالْو خۆپەرست بەناوی جور بەجور یاری بە چارەنووسی ئەو میللەتە دەکەن. وتارێکی ١٠ لاپەڕەییم لە سەر (خەبات) وبەرنامەکەی نووسی. دام بەدوکتور سەعید تەماشای کات. گوتی شتێکی زۆر جوان و بەجێیە، بەلاْم پێشنیار دەکەم، دەولەمەندتری بکەی و بەناوی خۆت بلاْ وی بکەیەوە. دەستم کرد بەنوسین و تەواوم کرد. دام بەکوڕەکانی ئینتیشارات چاپی بکەن.

ئێوارە ی٨/٤/٩٨٢ کاک صدیقیقەوی پەنجە من و دوکتور سەعید و کاک سەید حەسەنی هاشمی بۆ کفتەو شورباو، داوەت کردبوو. لەو چیاو کەژە، خواردنێکی ئاوا نیعمەت بوو، هیچ نەبا جارێنک پیاو لە دەست

نیسک و برنجی میوانخانە نەجاتی دەبوو. شەو زۆر بەخۆمانەبی باسی کەم و کوڕی و بێ سەرەو بەرەیی وناتەواوی حیزبیمان لەگەڵ دوکتور سەعید هێنا گۆڕێ.دوکتور سەعید لەگەڵ لێ زیادکردنی رەخنەکانی ئێمە کە پتریشی دەزانی، وەک جێگری سکرتێری حیزب گوتی :«ئێستا لە نێو حیزبی ئێمەدا، دروشمی هەرەباش و سەرکەوتوانە ئەوەیە، دەبێ بڵێی (دڵت چا بێ)لە وەزیاتر هیچی دیکە ناکرێ.»

لەو سەرو بەندەدا رادیۆ تاران بڵاوی کردەوە کە خومەینی دەسەڵاتی فەرماندەی گشتی هێزی چە کداری داوە بە زەهیرنژاد و بەناتقی نووری. کاک فەتاحی کا ویان داینابوو کە شەوی ٩٨٢/٤/١١ لە سەر ئەو مەسەلەیە بدوێم. بە هەڵکەوت ئەو شەوە میوانی یەکجار زۆر هاتبوون.ماموستا مەلارەحیمی عەبباسی و مەلاخالید و مەلائەحمەدی هەرکیش تەشریفیان هەبوو. من دەستم پێکرد، راست لە جەنگەی باسوئاخافتنمدا، مەلا ئەحمەد هەستاو گوتی :« پرسێکە من لە کاک کەریم هەیە» کاک فەتاح گوتی: « کاک کەریم دەڵێی چی، ماموستا پرسی خۆی بکا یان نا؟»

- فەرموو ماموستا... پرسیارەکەت بکە.

- ئەز داوا لە کاک کەریم دەکەم ، بیژێتە مریدی تخۆ، واز لە فەلسەفەو رێگای لینین بینن ».پێم سەیر بوو، من باسی چدەکەم و مەلا ئەحمەد لە کوێی لە عەرزی دەدا !!! گوتم ماموستا من قەت شێخ و خەلیفە نەبووم و پێم شکنایە مریدم هەبن.

- جەوانانی ناوچەی ئێمە، گشت مریدێ تەنە.

- نەمزانیبوو، ئەگەر وابێ، بۆ من جێی شانازی‌یە.بەڵام دەمەوێ عەرزی ماموستا بکەم، بەبۆ چوونی من فەلسەفە و رێگای لینین تاقە رێی رزگاری میللەتانە لە چەوسانەوە. ئێمە بو حەباتی سیاسی کەلکی لێ

وەردەگرین. ماموستا دانیشتەوە، باسەکەمان هاتەوە سەر دۆخی خۆی، هێندێ لە ببرادەران بەشداریان کرد. بەیانی زوو مەلا ئەحمەد لەگەڵ ماموستا مەلا رەحیمی عەبباسی هاتنەژوورەکەی من، چاییمان ساز کرد و مەلا ئەحمەد بەزمەکەی ساز کردەوەو گوتی:«لە بواری خە بات و تێکۆشانەوە ئەز مریدێ تەمە. لە بواری فەلسەفیەوە ئەز دوژمنی تەمە.»

گوتم ماموستا دوژمنم مەبە، با تاکۆکی بیرو باوەڕمان هەبێ و دۆستیش بین.

گوتی : پرسێکە دیکەی من هەبە.

- فەرموو ماموستا .

- بیرو باوەڕت لە ئاست خوای مەزن چۆنە ؟

- ئە ستەغفروڵا، ماموستا...من لە ئاست خودا و قانونەکانی عاسمانی شک و گومانم نیە، من لە خەباتی سیاسی ـ کۆمەڵایەتیدا لە فەلسەفەی مادی کەلک وەر دەگرم.

ئەزیش مریدێ تەمە.

ماموستا مەلا رەحیم فەرمووی : ئەوە گەیشتنە یەک.تاوێک دانیشتن و تەشریفیان رۆیشت.

رۆژی ١٣/٤/٩٨٢ عەلی کاشفپوور شاپووروتەیموور هاتنە لام. گلەییان هەبوو کە خەبەری شەڕەکانی شیمال بلاو ناکەنەوە. من گوتم هەر خەبەرێکی لە دەفتەری سیاسیەوە بۆمان بنێرن بلاوی دەکەینەوە.گوتیان ئەوە پتر لە دوو مانگە لێرەین، لە سەر مەسەلەی شیمال ناگەینە یەک، دەمانەوێ بڕۆینەوە. دیسان پێم گوتن: چوونەوەتان کۆمەگ بەچارەسەر کردنی مەسەلە ناکا، پشووتان لە سەر خۆ بێ و لە چوارچێوەی کومیتەی ناوەندیدا ،مەسەلەی شیمال چار بکەن.

١٤/٤/ ٩٨٢ لەگشت ولاتا نی ئیسلامی بۆ پشتیوانی لە خەباتی

گەلی فەلەستین مانگرتن راگەیەنراوە.ئێمەش بەم بۆنەوە وتار بلاو دەکەینەوە. لە مەهاباد و لە رێگای سەردەشتێ، شەڕ توندە.کاکەسەنی دەشتێ داوەتی کردووم و شەو لەگەڵ فەردین چووینە کن کاکەسەنی دەشتێ.کاکەسەن(کاک حەسەن)ئەندامێکی کۆنی حیزبە ،ساڵی٥٤ گیرا بوو لە زیندانی مەهاباد زۆرم خزمەت کرد بوو . جارێکی دیکەش ساڵی ٥٨ سێ ساڵی دیکەش حەبس کرابوو.دوای شۆرشی گەلانی ئێران کەس بەسەری نەکرد بۆوە. کە دەفتەریش هاتبوە ئەم ناوە خۆیان تێنەگەیاند بوو. من دڵخۆشیم دایەوە،جار وبار دەهاتە لام. تۆزێ خوێندەواری هەبوو،هەرکەس شیعری سەعدی و مەولەوی نەزانیبا، پێی
نەخوێندەوار بوو، رۆژێک چەند شیعری یوسف زلیخام بۆخوێندەوە، تاوێک راماو گوتی : پێم وابوو هەر
دووسێ خەتوزکەی فارسی دەزانی.چەند شیعریشم بۆ لە بۆستانی سەعدی خوێندەوە ،ئیتر دۆستایەتیەکە مان تۆ ندتر ببوو.٩٨٢/٤/١٥ دەگەرامەوە بۆ دەفتەر،لە نیزیک نواوێ، تووشی کابرایەک بووم، گوتی ئەوە دەهاتمە کن تۆ، پێشمەرگەی یەکێتی نیشتمانی رووتیان کردووم، نامەم بۆ دەفتەر نووسیوە جوابیان نەداومەوە. گوتویانە بێمە کن تۆ. گوتم کاکە گیان من چکارە نیم، بچۆ کن کاک جەلیلی گادانی، هەموو شتی بەدەستە. هەر وا کە دەهاتین تووشی کاک جەلیلی بووین، پێم گوت : جوابێکی ئەو کابرایە بدەتەوە. ئیتر من بەجێم هێشتن ونازانم چی یان بە سەر هات.

دوای کونگرەی پێنجی حیزب، تەنیا ئاڵوگۆرێکی کە لە دەفتەری سیاسیدا پێکهات، ئەوە بوو کاک جەلیل کرا بە بە رپرسی کومیسیونی کومەلایەتی، کە سەر پەرشتی زیندانیشی دەگرتەوە. کاک فەتاحی کاریانیشیان لە کاروباری زیندانا لێ کردبوە شەرێک. رۆژێک بابی

· فاروقی کەیخوسرەوی و یەک دوو کەسیتر کە بەتاوانی لایەنگری لەتاقمی حەوت کەسە گیرابوون، هاتبوونە دەفتەر کە ئیجازەیان بدەن وەک هەموو زیندانی دنیا، بچن چاویان بەگرتوەکانیان بکەوێ. رێگایان نەدابوون. هاتنەلای من، لایان وابوو من شتێکم بەدەستە. چوومە کن فەتاحی کاویان و جەلیلی گادانی. گوتم : ئە وانە لە رێگای دوورەوە هاتوون، کورەکانیان ببینن، با بچن چاویان پێیان بکەوێ. باشبوو فەتاح توزێ هێدیتر بوو، کاک جەلیل دەستی پێکرد: ئەوانە جاشن وملاقاتیان قەدەخەیەو ناتوانن بچن و .....گوتم: هەر کەس بن، لە زیندانی خومەینیشدا، چاوپێکەوتنی زیندانیان هەر هەیە. فایدەی نەبوو. ناچار چوومە کن درکتور قاسملوو. مەسەلەکەم پێگوت. گوتی : رەنگە لە بەر ئەوەبێ کە نەیانەوێ خەڵکیتر کە گیراون بیانبینن. گوتم با بیانهێننە دووری زیندان و چاویان بە یەکتر بکەوێ. ماڵی ئاوەدان بێ، پسولەیەکی نووسی کە رێگایان بدەن لە دەرەوەی زیندان یەکتر ببینن. گەرامەوە، پسولەم دا بە فەتا حی کاویان و پێشمەرگەیان لەگەڵ ناردن کە بچن بیانبینن.

١٧/٤/٩٨٢ لای ئێوارێ سەرهەنگ قادری و غەنی غەنیپور هاتنەلام.دانیشتین و بەدەم چاخواردنەوەوە، لە نەبوونی چەک و تەقەمەنی گازندەیان هەبووە دەیانگوت : عیراق درۆمان دەگەڵ دەکاو کەرستەی پێویستمان ناداتێ. لە سە ر ئەو باوەڕەبوون کە ئەگەر ئەفسەرەکان پێوە ندی بگرن، باشتر دەتوانن چەک و تەقەمەنی لە عیراق وەربگرن. دەیانگوت عیراق نایەوێ حیزبی دێموکرات بەهێزبێ، خەریکەتاقمی پچوکی چەکدار رێک دەخات.قسەکانیان سە رنج راکێش بوون، بۆیە دەبوون یاد داشتیان بکەم.

١٨/٤/٩٨٢ مەلا عەلی کتابی،کادری رێکخراوی سەقز

پەیدابوو.بێجگە لە باسی بێسەرەو بەرەیی ڕێکخراوی سەقز لە دەست، بێناموسی و سەرسەرییەتی خوارزایەکی دوکتورقاسملو هاواری بوو کە کردبوویا نە فەرماندەی هێز و ئابڕووی حیزب وجولاتەوەی بردوە. چەند جاریش تەشکیلات نامەی نووسیوە، جواب نادەنەوە. ئێواریٚ لە کۆبوونەوەی گشتیدا، باسی دیموکراسی نێوحیزب و ڕەخنە و ڕەخنەکاری زیندوو کرایەوە. دوکتورسەعید رایگەیاند گوتی: «ئەوکۆبوونەوانەی ئێرە، کۆبوونەوەی حیزبی نین. باسی رەخنەو کەم وکوڕی لەم هەل ومەرجەدا، ورە ی خەلٔک کزدەکەن دەبنە هۆی ناهومێدی و دەبنەخەیانەت و نابیٚ بکرێن. ئیتر ئەو دیموکراسیە ی کە هە میشە دوکتورقاسملو باسیدەکرد، بە قسەکانی دوکتور سەعیدي بەتەواوی وبەرەسمی سەقامگرتوو کرا.

ڕۆژی ١٩٨٢/٤/٢٢ کورەکانی بەشی ئینتشاراتی حیزب نامیلکەی (چەند قسەیەک لەگەلٚ خەبات) یان ئامادەی چاپ کردبوو. بەلاٚم مەلا عەولا نەیهێشتبوو، گوتبووی هەتا نەیخوێنمەوە نابیٚ چاپی بکەن. ئەوانیش بە دوکتور سەعیدیان گوتبوو. دوکتور سەعید گوتبووی ئەوە نووسراوەی شەخسیەو بە ناوی حیزب بلاٚو ناکرێتەوە، برۆن چاپی بکەن. زۆر سوپاسیان دەکەم زۆر جوانیان چاپ کردبوو، زۆر باشیش فرۆشرا.

ڕۆژی ١٩٨٢/٤/٢٤ ڕادیۆ تاران خەبەری دا کە ئەرتەش گەیوەتە سەردەشت و ڕێگای بانە- سەردەشت گراوەتەوە. کاک فەتاحی کاویان هاتە لام. لە سەر ناردنی ئەفرادی نالایق و خزم خزمێنە بۆ دەرەوە باسمان هەبوو، سەیر ئەوەیە برادەرانی ڕێبەری قەوم هەمووی ئەو شتانەیان دەزانی، بەلاٚم چاریان نەدەکرد. ڕۆژی دوایی لە دەفتەرەوە بریاریان دا کە بۆ ئیحتیات بەرنامەی چەند ڕۆژی ڕادیۆ پر کەینە وە چونکە ترسی هێرش و گوێستنەوەی ڕادیۆ هەبوو. کورەکانی ئینتیشارات چوون جێگای تازە بدۆزنەوە. سەید برایمی تەوەکولی لە بانەوە هاتبوو ڕادیۆیەکی باشی بە

دیاری بۆ هێنابووم و کاک هاشمی کەریمیش پەستەیەکی فرە جوان و قوزی بۆ نارد بووم. دوو سەد دانە نامیلکەی «خەباتی» برد کە بیفرۆشێ. بە هاتنی ئەرتەش بۆ پردی بریسوێ و بۆ سەردەشت مەقۆ، مەقۆ و سرت و خورت پەیدا بوو. مەترسی باڵی بەسەر دۆڵەکەدا کێشا. موجاهیدی رەجەوی دەستیان کرد بە هەڵاتن و بە شت گواستنەوە. لە دەفتەری سیاسی ناردیان لە گوندەکان تراکتۆر بۆ پەرینەوە پەیدا. پۆلای نانەوازادە هەر ئەو شەوە مریشکەکانی بۆ پاراستان گویستەوە. مەلا عەولا هات گوتی دەبێ رادبۆ بگوێزینەوە. گوتم رۆیشتنمان کارێکی هەڵەیە، لە ناو خەڵکدا تەئسیری خراپی دەبێ، لە جیاتی رۆیشتن وابکەن دیفاعی ئێرە بە هێز بێ. رۆژی ١٩٨٢/٤/٢٧ کە باسی برادەرانی دەوروبەری دەفتەری سیاسی هەمووی لە سەر رۆیشتن و گواستنەوە بوو، دانیشتم نامەیەکم بۆ دەفتەری سیاسی نووسی. دوای روون کردنەوەی ناتەواویەکانی وەزعی حیزب ئەم خاڵانەی خوارەوەم پێشنیار کرد کە لە دەفتەری یادداشتەکانمدا نووسیومنەوە:

١- بە هاتنی ئەرتەش بۆ سەردەشت نابێ ورە بەربدەین. ئەوەی ئێستا لە دەفتەری سیاسی و دەوروبەری دەست پێکراوە، لە ترس و ناهومێدی بەدەر هیچی‌تر نیە. پێویستە چەکی قورسی هەوایی و زەمینی لە شوێنە ستراتیژیەکانی دەورو بەری دەفتەری سیاسی دابمەزرێنین. پێویستە پەلاماردانی دوژمن توندتر بکرێ و نەهێلن بحەسێتەوە. نابێ پشوو بە دوژمن بدرێ و پێویستە لە هەموو لایەکەوە زەبری گورچ و بڕی لێ بدەن.

٢- باش نیەو نابێ بە هیچ جور دەفتەر لێرە بگوێزینەوە. لاچوونی دەفتەر ورەی خەڵک نزم دەکاو دوژمن رژدو چی‌تر دەبێ. ئەمجارە بۆ هەر کوێیەک بچین وەدوامان دەکەوێ. پێویستە مەسئولەکانی حیزبی بچنە نێو خەڵک و قسەیان بۆ بکەن و بۆ بەرەرەکانی هانیان بدەن.

٣- ئەندامانی دەفتەری سیاسی خۆیان بەسەر عەمەلیات و بەرگری‌دا چاوەدێری بکەن. هاتوچۆی فەرماندەکان بۆ ئێرەو ساوە ساو و تێک هاویشتن فایدەی نیە. پێویستە هەموو پارمەتیەکی مادی و مەعنەوی بە هێزی چەکداری حیزب بکرێ. مالی ئاوەدان بێ دوکتور سەعید لە کۆبوونەوەدا گوتبوی تەنیا کاک کەریم بە نووسینی نامەیەک ئومید و تینی وەبەر ناوین.

رۆژی ١٩٨٢/٤/٣. برادەرانی تەشکیلاتی سندوس هاتنە لام خەبەری پالەوانەتی هێزی پێشەوامان بۆ هات. پێگەی «بەردە کونتێ» یان لە نیزیک مەهاباد گرتبوو. سیمی تەلداریان هەلبریبوو چووبوونە نێو پێگە. ٣. کەسیان لە هێزی دوژمن کوشتبوو، تانگێکیان هێنابوو. سێ پێشمەرگە شەهید ببوون، سێ بریندارىان گەیاندبونە دەفتەر، پێنج بریندارىشیان لە گوندی شێلمان بەجێ هێشتبوو. بەلام سەیر ئەوە بوو چەند ماشین لە دەفتەر بوون، ماشین وەگیر نەدەکەوت کە بچنە شێلمان و بریندارەکان بگەیێننە خەستەخانە. چونکە هەر کەس ماشێنی بە نیـخۆی دەزانی و وەدوای کارو گەرانی خۆی دەکەوت.

٨٢/٥/١ محەمەد زەنگەنەی شەهید و وەستا عەولا هاتنە لام هێندێ کتێبم دا بە محەمەد زەنگەنەو بە جیدی ئەسپاردم پارێزگاری خۆی بکا. فەردین رۆژی لە دایک بوونی بوو. دەزگایەکی خۆمانەمان ساز کرد، ئێوارێ کاک نەبی قادری هات ئەویش لە سەر وەزعی شیمال گلەیی هەبوو، دەیگوت دەفتەری سیاسی بە ئانقەست مەسەلەی شیمال چارەسەر ناکا.

١٩٨٢/٥/٢ مەلا سمایلی حاجی هاتە لام دەیگوت پێشمەرگە لە جەبهەی بانە بەربەرەکانی نەکردوە، کاک جەلیل گوتوویە: خۆمان سوک کردوە و دەمانەوی بپەرینەوە. مەلا سمایل گوتی: ئەوانە خەریکن مەیدان

چۆل کەن و بۆ عیراق بچن، تەگبیر چی‌یە؟ گوتم: مەیدان چۆل ناکەن، پەرینەوە مانای رۆیشتنی یەکجاری نیە. ئەگەر ئەوانەش برۆن خەڵکی‌تر کە بروایان بە مافی نەتەوەیی هەیە خەبات درێژە پێ‌دەدەن.

١٩٨٢/٥/٤ لەگەڵ هەمزەی قادری چوومە سندووسی. شەو لە گوندی، شیلمجاران میوانی کاکە مین بووین. ماڵە ئەو پیاوە بۆ پێشمەرگەو کادرو هاتوو چۆی ئەندامانی حیزبی وەک خانەقای لێ‌هاتبوو. بەراستی پیاو لە فیداکاری ئەم خەڵکە سەری سوور دەما. ئەو کاکە مینە بە هەموو خاوو خێزانیەوە لە خزمەتی پێشمەرگەو ئەندامانی حیزب زیاتر هیچی نەدەکرد. لەوێ خەبەری ناخۆشی قازیاوا هات پاسدارو جاش شەو دەچنە گوندی قازیاوا، بنکەی پێشمەرگە پەلامار دەدەن و ٨ کەسیان شەهید دەکەن. ٢ کەسیش لە خەڵکی گوندی دەگرن و لەگەڵ خۆیان دەبەن. رۆژی دوایی چوومە گەرگولی خوارێ، میوانی پورزایەکم بووم کە ساڵەهای ساڵ بوو نەمدیبوو. کاک ئەمیرو رەحیمی محەمەدزادەو کاک مورادی کرمانجی هاتنە لام. رۆژی دوایی چوومە دایماو، لە دوای خوارزاکانم نارد هاتنە لام. پاش چەند رۆژ گەرامەوە بۆ گەرگول شەو لە نێوان کاک محەمەدی بەرپرسی هێزی بەرگری و کاک نەبی قادری بەرپرسی تەشکیلاتی نەغەدە کێشەو دم بە دمەیەکی سەیر ساز بوو. کاک محەمەد هاواری بوو دەیگوت: لەم کوردستانە تەنیا فەقیرو هەژار دەچنە جەبهە کێشک دەکێشن خزمەتی حیزب دەکەن و خۆ بە کوشت دەدەن. دەوڵەمەندەکان نە یارمەتی دەدەن نە تفەنگ دەکردن نە کزمەک بەو فەقیرانە دەکەن نە دەچنە جەبهە. کاک نەبی دەیگوت ئێمە بە زۆری خەڵک نانێرینە جەبهەو نایانکەینە هێزی بەرگری. من ناچار بە لایانگری لە کاک محەمەد وەدەنگ هاتم. کاک نەبی گوتی تکایە با لێرە ئەو باسە درێژە پێ نەدەین. بەیانی کاک نەبی قادری شیعرە فارسیەکانی خەیامی

لەگەڵ وەرگێڕاوە کوردیەکەی مامۆستا هەژار بەراورد و موقایسە کردبوو. هێنای پێشەکی بۆ بنووسم، دەیویست چاپیان بکا. کارێکی زۆر جوانی کردبوو، منیش پێشەکیەکم بۆ نووسی بەڵام بەداخەوە تا ئێستا نەمدی کە چاپکرابن.

ڕۆژی ١٩٨٢/٥/١١ لەگەڵ کاک ئەمیری قازی چووینە گەرگوڵی خواریێ و لە ژن مارەکردنی کاک ڕەحیمی محەمەدزادەدا بەشدار بووین. کوڕێکی خەڵکی گەرگوڵ بە ناوی خالید لە سەر هەوای نایلۆنەی مامڵێ گۆرانیەکی پێشمەرگەی دانابوو، یەکجار جوان و هاندەرانە بوو. تۆمارم کردو لە ڕادیۆدا بڵاومان دەکردەوە. برادەرانی تەشکیلاتی شنۆ داوایان لێ کردبووم کە بۆ گۆڤاری «کێلەشین» وتارێکیان بۆ بنووسم. لە ژێر سەرخەتی (تەئسیری شۆڕش لە ژیانی کۆمەلایەتی‌دا) وتارێکم نووسیبوو کە چەند جار لە ڕادیۆش‌دا بڵاو کرایەوە.

ڕۆژی ١٩٨٢/٥/١٥ بە بۆنەی هاتنەوەی دوکتور قاسملو لە سەفەری دەرەوە چوومە لای. دوو بە دوو باسی گەلێک شتمان کرد. لە سەر کەم و کوڕی تەشکیلات و شێوەی تەبلیغات و ناتەواوی کاروباری حیزبی و سیاسەتی بەرگری زۆر ڕەخنەم گرت. لە وەلامدا گوتی: « ئەوانەی دەڵێی هەموو ڕاستە، بەڵام چ بکەم خۆ کادر لە داری دا ناتاشرێ هەر ئەوانە هەن. کوڕە باشەکان کە هەڵدەسووران زۆریان لەگەڵ تاقمی حەوت کەسە ڕۆیشتن». دووکتور دەیزانی وا نییە. کوڕی باش هێشتا زۆر هەبوون. بەڵام کاریان نەدەدانێ، گاڵتەیان پێ دەکردن، دەیانگرتن، لە ژێر چاوەدێری کومیسیونی بازرەسەری دا بوون.

١٩٨٢/٥/١٦ کاک شەهابی خەلیلی کادرێکی ژیری حیزبی هاتە لام. گوتی: دەمانەوێ لە حیزب دەرمانبچێنن، ناوێرین باسی سیاسی بکەین بە تاقمی حەوت کەسەو بە تودەییمان دادەنێن. ڕێگا نادەن لە حیزبدا

کار بکەین ناوێرین باسی سۆسیالیزم بکەین، مانەوەمان لە حیزبدا ئیمکانی نیە. دڵخۆشیم داوە گوتم: بەر لە هەموو شت ئەوەندە بزانن کە ئەو حیزبە حیزبێکی میللی دیموکراتە، هەموو جورە بیروباوەرێکی تێدایە، ئێوە نابێ هەڵەی غەنی بلوریان دووپات کەنەوەو مەیدان خالی بکەن. پێویستە لە حیزبدا بمیننەوەو تێکۆشانی خۆتان درێژە پێ بدەن. ئێواری کاک سەلیم و سەید حەسەن و کاکەللە و قاسمی قارەمانی و ناسری زەدوشت هاتە لام تا شەو درنگ بە باسی سیاسی و دەردو داخ و قسەی خۆش رامان بوارد.

رۆژی ۱۹۸۲/۵/۲۰ ئەرتەشی کۆماری ئیسلامی لەگەڵ پاسدارو هێزی بارزانیەکان لە پیرانشارەوە بۆ سەر گوندەکانی زیندان و جەران و کۆنە لاجان و قەلاتی موتاوێ هێرشیان دەست پێکرد. لەو شەرەدا چەند پێشمەرگەی حیزبی دیموکرات شەهید بوون. وەک لە رادیۆدا بلاوکرامان کردەوە جاش و پاسداری زۆریش کوژرابوون. بەلام رووداوێکی ناخۆشتر رووی دابوو. هاونیشتمانێکی خەڵکی بادیناوێ بە ناوی عەولا رەبەنە کورێکی لەو شەرەدا شەهید دەبێ. بە هاواری کورەکەیەوە دەچێ کە مەیتەکەی بێنێتەوە. تا دەگەرێتەوە بەسەر مەیتی کورێکی دیکەیدا دێتەوە کە دە چۆمیدا دەخنکێ.

رۆژی ۱۹۸۲/۵/۲۱ لەگەڵ کاک سەید حەسەنی هاشمی بریارماندابوو بچینە کێوی، هێندێ رەشماڵ لە سەرەوەی ئێمە هەڵیان دابوو، دەمانویست نیوەرۆ بچینە ئەو چادرانە میوانیان بین. بەلام بەیانی مامۆستایەکی شۆرشم لێ میوان بوو، لە ناوچەی پیرانشارەوە هاتبوو نەدەکرا بەجێی بێلم. دەڵێن میوان رسقی خۆی لەگەڵ خۆی دێنێ، رۆژی پێشتر دوکتور ئاسۆ گۆشتی بۆ هێنابووم.دەڵێن میوان خۆشەویستە، جا بەتایبەتی ئەگەر روح سووکیش بێ. میوان زۆر گورجانە دەستی کرد بە

چێشت لێنان و سەماوەر حازر کردن. کاک سەید حەسەن پەیدا بوو، خۆی هەڵکردبوو دەمانچەی بە قەدیەوە هاتبوو بچینە چادران. لە بەر دەرکێ کە چاوی بە میوانی کەوت قوت بوو، راوەستار حەبەسا. گوتم بۆ وا ویشک بووی فەرموو وەرە ژوورێ.

- چی؟...... ئەوە چی‌یە، ئەدی ناچینە چادران؟

- کورە وەرە ژورێ چادری چی، ئەوە تیە نان و چامان بۆ حازر دەبێ.

سەید حەسەن هاتە ژووررو دانیشتین میوان نانێکی باشی بۆ ئامادە کردین، شەترەنجمان کرد و چایمان خواردەوە، کاک سەید حەسەن هەمیشە دوای نان خواردن لە میوانخانە هەڵدەستاو دەچۆوە هۆدەکەی خۆی ئیستراحەتی بکا. دیاربوو ئەوڕۆژە هۆدەکەی منی پێ خۆشتر بوو، نەدەبزووت. خوارزایەکی پێشمەرگەم لە لا بوو گوتم: بچۆ بزانە ماڵە پۆلای تەرازوویان هەیە. سەید حەسەن گوتی: «تەرازووت بۆچی‌یە؟»

- بۆیەمە ئەگەر دەتەوێ ماڵەکەم لەگەڵ بەش کەی بە کێشان بەشەکەی خۆت بدەمێ و برۆی. نانت خواردوە، چات خواردۆتەوە، شەترەنجت کردوە ئیدی بۆ نارۆی ئیستراحەتی بکەی.

کردی بە پێکەنین...... جا قەت ئەوەش قسەیە. سەید حەسەن رۆیی، لام وایە دوای دوو رۆژ لە دوورەوە کاک سەید حەسەن-م دیتەوە. دەستم لێ هەڵێناو سلاوم لێکرد. گوتی: نەیە پێشی تەقەت لێ دەکەم...... تورەم...... بیزارم...... تەقەت لێ دەکەم نەیە پێشێ. ئەم گاڵتەیە ماوەیەک لە نێوماندا بەردەوام بوو.

ئێوارەی ئەو رۆژە رەشیدخان هاتە لام. نامەیەکی پەخشانی کچی بۆ هێنابووم لەگەڵ وتارێک لە سەر بارو دۆخی کۆمەڵایەتی ژن لە کوردستان. پەخشانی کچی رەشیدخان لە نێو ئەو هەموو ژن و کچەی کوردستانی ئێران کە مەجبور ببوون بێنە چیا، تاقە کەس بوو کە چەند

وتاری جوان و بە پێزی بۆ رادیۆ دەنووسی و دەیناردو وتارەکانمان بلاْو دەکردەوە.

رۆژی ١٩٨٢/٥/٢٣ کاک عومەری قازی و کاک مستەفای قازی هاتن. رۆژی دوایی پێکەوە چووینە میراوێ و شەویش چووینە گوندی کونە مشکێ میوانی ئاغای سەلیم‌ئاغا بووین. شەوێکی خۆش و دۆستانەمان رابوارد. بەیانی کە هاتینە دەر دیتمان چەند کەس لە موجاهیدەکانی مەسعودی رەجەوی دوو سێ گوێ درێژیان بار کردوەو بەرەو داو داوەو سنووری عیراق دەچنە خوارێ. رۆژی دوایی چووینە گوندی تەرکەشی لەکن سەید رەسولی رەحمەتی لاماندا. لە دۆڵەکەی پشتی تەرکەشی بنکەی هێزی دامەزراندبوو. چەند فرۆکە بەسەر ناوچەدا دەسورانەوە. ژن و منداڵ روویان کردە بن بەردو ئەشکەوتەکان. پەناگاو حاشارگەی قایمی لێ بوو. هەوەڵ جار بوو سەید رەسو ببینم بە بێ تەشریفات تەنیا بە نان و چێشتی پێشمەرگە میوان بەرێ بکات. زۆرم پێخۆش بوو، هەر وەک گاڵتەی لە نێومان دا هەبوو بە قەولی خۆی گوتم: سەید رەسو دیارە کوردەکە عاقل بووە.! دوای نیوەرۆ چووینە گوندی هەنگەوێ رێکخراوی پیرانشار بۆ کۆکردنەوەی یارمەتی بۆ جەبهەی شەر بنکەیەکی کردبۆوە. کە چووم لەوێ سەری برادەران بدەم لە ئاست فیداکاری و نیشتمانپەروەری خەڵک سەرم دانواند. ئەوەندە نان و پەنیرو قەند و چاو سیغارو شقارتەو گۆرەوی سەرکلاو و دەستەوانەو پێڵاو و کراس و شتی‌تر کۆکرابۆوە لە هۆدەکاندا جێ نەدەبوو. بەڵام وەسیلەی ناردن و پێراگەیاندن کەم بوو. چوومە بیمارستان سەری بریندارەکان بدەم یەک لە پێشمەرگەکان گوتی: «کاک کەریم من هەر دەستێکم بریندارە، بە دوکتورەکان بڵێ ئازادم کەن با بچمەوە جەبهە، دەتوانم بە دەستێک شەڕ بکەم». شەو هاتینەوە میراوێ میوانی مەلا قادری ئەحمەدی بووین. رۆژی دوایی گەراینەوە بۆ دەفتەر

کاک عەزیزی ماملێ لە ئورووپاوە هاتبۆوە. نامەی شلێری کچمی بۆ هێنابووم. دووربینی فیلم بەرداری بۆ چاک کردبووم بۆی هێنابوو مەوە سوپاسی دەکەم.

رۆژی ١٩٨٢/٥/٢٥ دوکتور قاسملو کە لە سەفەری ئورووپا گەرابۆوە برادەرانی کومیتەی ناوەندی ئەوانەی لەوێ بوون و دەفتەری سیاسی چووبوونە لای. دوکتور قەولی دابوو لە کۆبوونەوەی گشتی لە سەر سۆسیالیزم قسە بکات. رۆژی دوایی تەیموور شاپوور عەلی کاشفپوور دوو برادەری لای بانە هاتنە لام. گوتیان: «قەرار وایە دوکتور لە کۆبوونەوەی گشتیدا سوسیالیزم لە بەرنامەی حیزب رەد کاتەوە». گوتم شتی وا نیە. کونگرەی پێنج سوسیالیزمی وەک ئامانجی نیهایی حیزبی دیموکرات پەسند کردوە. دوکتور بە تەنیا بەرنامەی حیزب رەد ناکاتەوە. لەو بەینەیدا تا شەوی کۆبوونەوە لە نێو برادەرانی دانیشتوی دەوروبەری دەفتەری سیاسی و میوانەکان لە خۆرا باس هەر ئەوە بوو کە دوکتور سوسیالیزم رەد دەکاتەوە. کەسیش نەبوو بچێ لەگەڵ دوکتور باس بکاو یا پرسیاری لێ بکا. رۆژی ١٩٨٢/٥/٣٠ لە کۆبوونەوەی گشتیدا دوکتور باسەکەی لە سەر سۆسیالیزم دامەزراند. قسەکانی هەمووی جوان و بابەتی و بە گوێرەی زانستی سوسیالیستی، سوسیالیزمی روون دەکردەوە. گوتی: «ئێمە سوسیالیزمێکمان دەوێ کە لەگەڵ هەل و مەرجی ولاتەکەمان یەک بگرێ». ئەوەش راست لە بەرنامەی حیزبدا پەسند کرابوو. کە دوکتور تەواو بوو من گوتم: «زۆرم پێ خۆش بوو هاتمە ئەو کۆبوونەوەیە، سێ رۆژە لەم دۆڵەدا بلاو بۆتەوە کە گۆیا وتاری ئەمشەوی دوکتور رەدکردنەوەی سۆسیالیزمە. بەراستی زۆر کەسی لە برادەران نیگەران کردبوو. منیش خۆم بۆ موناقەشەیەکی جیددی لەم بارەدا ئامادە کردبوو. ئێستا بێجگە لەوەی کە قسەکانی دوکتوری لە

بارەی سۆسیالیزمەوە تەئید بکەم هیچی دیکەم نیە لێی زیاد بکەم».
مەلا عەلی کتابی لە ڕێکخراوی سەقز ئیجازەی خواست و لە سەر کەم و کوڕی نێو حیزب و قبوڵ نەکردنی ڕەخنەو جواب نەدانەوەی پێشنیارو ڕەخنەی ئەندامانی حیزب و نەبوونی دیموکراسی هێندێ پرسیاری کردن. مەلا عەولای حەیاکی گوتی: «ئەو قسانە ڕاست بیروڕای تاقمی حەوت کەسەن و ئەوانەش تازە لە حیزبی ئێمەدا ناتوانن گوڵ بکەن». لە مەلا عەولا وەدەنگ هاتم و گوتم: بیانوی چاکە هەر کەس زمانی گەرا بڵێن ئەوە بیروڕای تاقمی حەوت کەسەیە. ئەوەی مەلا عەلی گوتی زۆر کەمترە لەو هەموو کەم کوڕی‌یەی کە دە حیزبدا هەیە. ئێوە کە لە سەرەوە دانیشتوون ناتانەوی بیانبینن. بەلاّم ئەندامانی حیزب کە زەحمەتکێش و فیداکارن هەستی پێ دەکەن و وەدەنگیش دێن. دوکتور قاسملو بە دمی مەلا عەولای داداوەو گوتی: «ئەوە ڕاست نیە هەر برادەرێکی بیروڕای خۆی دەربری بە لایەنگری تاقمێکی‌تر تاوانبار بکرێ، دەبێ ڕێگا بدەین برادەران بیروڕای خۆیان دەربڕن». دوکتور لە کۆبوونەوەی گشتی‌دا وای دەگوت، بەلاّم دەورووبەرەکەی ئەو دەرسانە لەو فێر دەبوون و هەر بە پشتیوانی ئەویش بیروڕاو بۆچوونی ئەندامانیان سەرکوت دەکرد.
ڕۆژی ۱۹۸۲/٦/۱ نامەیەکم بۆ پلینۆمی کومیتەی ناوەندی نووسی تەواوی کەم و کوڕی و ناتەواوی کاری تەبلیغاتی و تەشکیلاتی و سیاسی و نیزامیم ڕوون کردبۆوە. بەلاّم نە هیچ جوابیان داوە نە هیچ تەئسیرێکیشی هەبوو.
ڕۆژی ۱۹۸۲/٦/۸ دوکتور قاسملو داوای کرد بچمە لای. لەگەڵ باسکردنی هێندێ بارودۆخی سیاسی و پێوەندی دەرەوە گوتی: «پێم باشە سەفەرێک بۆ ئورووپا بکەی لەوێ هەوڵ بدەی بەڵکو دەرەتانی سەفەرێکی دەستەی نوێنەرایەتی حیزب بۆ مۆسکۆ یا بەتەنیا چوونی من پێک بێنی.

پێم وا باشە کە وا نیشان بدەی کە دەچیە مەرەخستی و سەری مندالەکان دەدەی. ئێمە بە تەمایین چەند برادەرێکی مەسئول و هێندی پێشمەرگە بۆ شیمال بنێرین. دەتوانی لەگەڵ ئەوان بچی تا نیزیک سنور، لەوێ جانگیر ئاغای دەری بدزێیەوەو ئەو بەرێت دەکا تا دەچیە تورکیا. منیش نامەیەکی بۆ دەنووسم. دەبێ وابکەی زوتر بگەڕێیەوە».

مەلا عەزیز دەمێک بوو داوای دەکرد کە بچم لە گوندی کونە مشکێ میوانی ماڵی بابی بم. ڕۆژێ ١٩٨٢/٦/١٠ لەگەڵ دوکتور ئاسۆ و فریدونی میتران چووینە واوان. لەوێوە دەچوینە میراوێ لە گرژاڵ لە ماڵی کاک حەمەڕەسوڵی حەسەنپوور لامانداد. تەشکیلاتی سەردەشت بە سەرۆکایەتی کاک سەعید کویستانی کۆبوونەوەی کادرانی هەبوو. عەولای عیزتپووری ئەندامی چریکی فیدای خەلک وخزمی دوکتور قاسملو کە ببووە دیموکرات و بە چەند شەور ڕۆژ بە پلیکاناندا سەرکەوتبوو ببووە بەرپرس و پشکنێری تەشکیلاتی حیزبی، هاتبوو بەسەر کۆبوونەوەرا بکا. بە زەحمەت مەلا عەزیزمان لە کاک سەعید ئەستاندو چووینە میراوێ. لەویش قادری عبدی و سەعیدی سولتانیامان هەلگرت و چوینە کونە مشکێ. میوانداریەکی پیاوانەی مەنگورانە. بەرخێکیان لە عەرزیدا و شەوێکی خۆشمان ڕابوارد. سبەی چووینە دەشتی سەوزو میرگو میرغوزاری ئالوەتان. نیوەڕۆ گەڕاینەوە سەر بەریەسێلی مەنگوران. کاک عەزیزی ماملێ پەیدا بوو دەگەڕاوە بۆ فەرانسەو خالیدی براشی دەبرد. دەگەڵ سەعیدی سولتانیان تا دەشتی مرداوێ بە ماشێن بردمان. لەو دەشتە هێندێ ماڵی ئاوارە و دەربەدەرو قاچاخچی و سەوداگەر چادریان هەڵدابوو. کاک عەزیز گەلێک سوراوە ولاخی وەگیر نەکەوت کە بیانگەیێنێتە بنکەی حیزبی لە سونێ. گوتی: « مەحتەل دەبم کەس ولاخێکمان ناداتێ، تەگبیر چی‌یە، هەستام چوومە چادرێک کە دوو سێ

ولاخی لە پێش بەسترابوونەوە. خاوەن چادرەکە مالی ئاوەدان بیٚ و ئێستاش هەر سوپاسی دەکەم، یا ناسیمی یا شەرمە حوزووری بوو یا رێز لیٚگرتن بوو کە پێم گوت کاکە دوو ولاخمان دەوێن، ئەو برادەرانە بگەیەننە سونیٚ و دەبیٚ هەر ئێستاش برۆن. وەک پیاوان هەر ئەوەندەی گوت: ولاخی دەخوتن، ئێستا بەریٚیان دەکەم. کاک عەزیزمان سوار کردو شرەو برەیان لە ولاخی ناو خالید و کابرا وەپێشی کەوتن و بەرێمان کردن. ئێمەش گەراینەوە.

لە گەرانەوەدا تا گەیشتینە میراویٚ لە سەر ماهیەتی رژیمی کۆماری ئیسلامی و شێوەی خەبات و رێبەرایەتی حیزبی دیموکرات لەگەلٚ کاک قادری عبدی باسێکی توندمان هەبوو. من دەمگوت هەر ئەو رێبەرایەتیە سەرەرای کەم و کوری لە هەموو بەرنوەبەرانی کۆماری ئیسلامی پێشکەوتوترو نیشتمانپەروەرترو بە هەقترن. کاک قادر رێبەرانی کۆماری ئیسلامی بە ئانتی ئیمپریالیزم دادەناو خەباتی دژی ئەوانی لەم قۆناخەدا پیٚ راست نەبوو.

کە هاتینەوەمیراویٚ تووشی مەلاحەسەنی رستگار بووم، گوتی بابرۆینەوە.١٢/٦/٩٨٢ لەگەلٚ مەلاحەسەنی رستگار بەرەو دەفتەری سیاسی کەوتینەریٚ. لە گوندی(نێوژیٚ)گوتی بالادەین لە مالە کاک بایزی نانێک بخۆین.گوتم رێمان دورر نیە، ئێستا دەگەینەوە.

تۆ نازانی .. کاکە لادەدەم و بەقسەت ناکەم.بەپێشمەرگەیەکی گوت: بچوو بزانە کاک بایز لە مالە.ئەگەر پرسیا ن کیٚیە، بلٚیٚ کاک کەریمی حسامی‌یە. ئێمە ماشینمان لە خواریٚ راگرت. پێشمەرگەچوە سەریٚ و گەرایەوە.هەر بەدوای گەرانەوە ی پێشمەرگەدا کەلە ژنێکی شۆخی دەنگ نیرانە لە بەر هەیوانێوە بانگی کرد و گوتی: « ئەوە لە بۆ لانادەن، وەلاهی بەسەری بایزی نارۆن، فەرموون وەرنەسەری. »

مەلا حەسەن گوتی: ئەها .. بابم.. نەمگوت، ..خەریک بووی لێم تێکدەی. چار نەبوو چووینە سەری. تازەدانیشتبووین، خوشکی کاک بایزی بوو،باخێزانی، هات بەخێرهاتنی کردین. زۆری پێ نەچوو کاک بایز وکاحەمەدی سیاقوڵی ویەکدوومیوانی دیکەش پە یدابوون.دانیشتنەکەمان خۆشبوو. بەتایبەت دەمێک بوو ئارەزووم بوو کاحەمەدی ببینم. بەخۆشیەوە ئەویش هەر ئەم ئاواتەی هەبوو.لە باسی سیاسی و دەنگو باس ولێکدانەوەرا، لە پڕ چووینە سەر راوە ماسی و برژاندنی وسازکردنی و شێوەی ژیانی ماسی لە ئاویدا.کورێکی ژیری مێرمنداڵیخوێن شیرینی کاک بایزی بەلاشیپانەی دەرگاوە راوەستابوو، دیار بوو لە کتێبدا لە سەر ژیانی ماسی و حەیواناتی ئاوی خوێند بوویەوە، زۆر بەجوانی و لە سەر خۆ دەستیپێکرد و شێوەی ژیان و خۆراکی ماسی و حەیواناتی دیکەی روون دەکردەوە. قسەکانی گەلێک بەتام و سە رنج راکێش بوون.لە پرکاک بایزدەنگی دا ونەیهێشت قسەکای تەواو بکا و گوتی: « هەڕو ..هەڕو نانی حازر کە لەو قسانەگەڕێ.کوری بەشێوەیەکی ناحەز شکاندەوە. گوتم: کاک بایز ناهەقبووی، قسەکانی زۆر جوان و زانستی بوون، پێمان خۆشبوو گوێی بدەینێ. کاک بایز گوتی : بابچێ نانی سازکا نان .

نانمان خوارد وسوار بووین هاتینەوە دەفتەری سیاسی.١٩٨٢/٦/١٥ مەلاعەولاً هاتەلام،گوتی: دوکتور دەڵێ داوای سە فەرت کردوە، برادەران موافیقن، بەلأم بەو شەرتەی زوویگەڕێیەوە. گوتوشیانە بەناوی حیزب لە دەرەوە نابێ قسە بکەی.!!

پاش ئەوەی تۆزێک مات بووم و بیرم لە فندلً قیلی دوکتور کردەوە گوتم :« من بەناوی حیزب قسەناکەم، بەلأم بەناوی خۆم لە هە موو شوێنێ، لە سەر هەموو مەسەلەیەکی کورد و کوردستان، هەرچی بیزانم

دەیلێم و دەشنوسم.» ماموستا گوتی: بۆ خەرجی سەفەریش ۲۰ هەزار تمەنیان بۆ داناوی، کەرزیشتی بچوو وەریگرە.

۹۸۲/٦/١٦ بەبۆنەی دووساڵ بڵاو بوونەوەی دەنگی کوردستان کۆبوونەوەمان هەبوو، بەدرێژی لە سە ر کاری رادیۆ و شێوەی تەبلیغات و تەئسیری رادیۆ وتارێکم خوێندەوە. کابرایەکی نوێنەری موجاهیدینی خەڵک و حەسەنی ماسالیش بەشێ خۆیان تێخست.

رۆژی ۹۸۲/٦/١٨ کاک عەزیز محمد و مام جەلال و کاک رسول مامەند هاتنە دەفتەری سیاسی. ئێواریٚ لەپێش دەفتەر کۆ ببوونەوە، مام جەلال گوتی :کورد سەر دەکەوێ، ئەمجارە بزووتنەوەی کوردایەتی سەر دەکەوێ. دوکتور قاسملو گوتی: مام جەلال دەلێی خەونت دیوە،کورد بەچی سەر دەکەوێ؟

- نا، خەونم نەدیوە، ئەوە ییکەمجارە کە من وکاک کەریم بیرورامان وەک یەکە. مەسەلە ئەوە بوو، من وتارێکم نووسیبوو بۆگۆڤاری (نووسەری کوردستان)مام جەلال. یش لە ژمارەی دواتردا لە ژێر سەرخەتی (کاک کەریمی حسامی چاکی بۆچوە)لەم بوارەدا وتارێکی بڵاو کردبۆوە.ئێوارێ بەبۆنەی میوانداری کاک عەزیز و مام جەلال و رەسول مامەندەوە زۆر لە برادەران داوەت کرابوون ، دوای نانخواردن دوکتور دیاریدا بە برادەرانی میوان. شەو درەنگ من و کاک عەزیز و مام جەلال چووینەوە ژوورەکە ی ئەوان. تا دوای نیوەشەوێکی درەنگ دانیشتین و لە سەر بارو دۆخی کوردستان و شێوەی خە بات وباری سیاسەتی نێو نەتەوەیی قسەمانکرد.هەوەڵ جاربوو ببینم مام.جەلال لە سەر ئەو باوەڕە بێ کە بۆ رزگاری مەسەلەی کورد تەنیا دەبێ پاڵ وەسۆڤیێت بدەین.من زۆر درەنگ چوومەوە ژوورەکەی خۆم.بەیانی کاک عەزیز وئەبوحیکمەت و کاک رەسوڵ مامەند هاتنەژوورەکەی من.کاک رەسوڵمامەند گوتی:«پێش

کونگرەی حیزبی دیموکرات لەتاران پێوەندیان بەمنەوە گرت، کە بە حیزبی دیموکرات رابگەیێنم، لە کونگرەدا دروشمی توند هەڵنەگرن.ئەوان لەوە دەترسان کە لەگەڵ موجاهیدان یەکبگرن.پێوەندم بەحیزبی دیموکراتەوەگرت، رێگایان نەدا بیانبینم.»

لە کاک رەسوڵم نەپرسی: کام تاقم پێوەندیان پێوەگرتوەو ئەوەیان راسپاردوە.؟

رۆژی ٩٨٢/٦/٢١ چوومەلای دوکتور قاسملو خواحافیزی بکەم، کاک سوڵتانی شێخاغایی لە کنبوو، جارێکی دیکەش لە بارەی ناتەواوی کاری تەشکیلاتی و شێوەی تەبلیغاتی رادیۆ هێندێ یادداشتم هەبوون، لەگەڵ دوکتورم باسکرد.دوای نیوەرۆ لەگەڵ کاک ئەمیری قازی و سەید حەسەنی هاشمی،چووینە میزاوێ، قەراربوو کاک ئەمیریش لەگەڵ من سەفەر بکا.

## بەرەو ئورووپا

رۆژی ٩٨٢/٦/٢٢لەگەڵ مەلاسمایلی حاجی چووینە لای برادەرانی حیزبی سۆسیالیستی کوردستانی تورکیا. کاک سەلیم نامەیەکی دامێ، بۆ برادەرانیان لە ناوچەی سۆما کە بۆدەربازبوون یارمەتیم بدەن. نامەکەم وەرگرت، هەرچەندە پێویستم بەیارمەتی ئەوان نەدەبوو.دوای نیوەرۆ سواربووین، چووینە گوندی قەرەخدری ماڵە بابی مەلاسمایلی.بەیانی خەبەریان دامێ کە خوشکم و کورەکانی لە گوندی جەرانێ رایان کردوە ، لە قەرەخدری لە مەدرەسەیدا دەژین.کە چووم،زۆر نارەحەتبووم. لە ژوورێکی چۆڵو رەقوتەق، هیچیان نەبوو. تۆزێک لە لایان دانیشتم

وهێندێکم پارەدانێ وبەجێم هێشتن.رۆژی ٩٨٢/٦/٢٤چوومە گوندی مەحمەشەو ناردم حوسێنی خوارزام هات. عە ینەکم پێدا ناردەورمێ لای برادەرێکی جوامێری ئازربایجانی کە پێکە وە لە زیندانی دەورانی شای‌دا رامانبوارد بوو.دوای ئازادبوون ئەو لە ورمێ عەینە کسازیەکی شازی وەکارخستبوو. یەکدووجاری دیکەش عەینەکی برادەرانم ناردبوەلای، پیاوانە بێ پارە راپەراندبوو.

لە مەحمە شە حاجی مەلامحمد پرسی پێکردم کە داخوا مەسلەحەتە خۆم بکەمە کاندیدای مەجلیس یان نا؟گوتم نابێ کاری وابکەی. هیچ کوردێکی نیشتمانپەروەر ئێستا ناتوانێ لە داموده زگای ئەم رێژیمەدا بەشداری بکا.رۆژی ٩٨٢/٦/٢٥ برادەرێکی کۆنی حیزبی لە ماسوێ داوەتی کردم و دەبوایە هەر بچم. کە چووین لە(هومامی) کوێستانی نیزیک بەمەیدان بەلەکێ، دەزگای ساز کردبوو.ناردم هەباساغای برادەریشم هات. دیتم کاک قادری شەهابی لەم کوێستانە،پەیدابوو. گوتی خەبەرم هەبوو کە بۆنەو لایەهاتووی، هاتم چاوم پێت بکەوێ. کاک قادرکە خەریکبوو خۆی ئەمین کاتەوە، دەستیکرد بە پەلاماردانی رێبەرانی حیزبو رەخنەی رووناکبیرانی بەزبو.گوتم کاک قادر تۆ کە دەتەوێ خۆت تەئمین کەیەوە، هەقی خۆتە، بەلام هەقتنیە وا حیزب پەلامار بدەی. شەو هاتینەوە ماسوێ، رۆژی دوایی هاتمەوە مەحمەشە. ئیکیپی شیمال وردەوردە دەهاتن بۆ سندوسی کە لە وێرا حەرەکەت بکەن.کاک فەتاحی کاویان وەک ئەندامی دەفتەری سیاسی بەرپرسی دەستەبوو.کاک نەبی قادری و سەرهەنگ قادری و لقێک پێشمەرگەی قزچاخ و بەکار.منیش دیارە سەفەری تایبەتی خۆم بوو، هیچ بارگرانی و مەسئولیەت حیزبیم بە ئەستۆوە نەبوو.رۆژی ٩٨٢/٦/٣٠ لەگە رگولەوە کەوتینەرێ ولەگوندی شاوەلە گیر بووین‌تا ئێوارەی بەسەرداهات، شۆڕ

بووینەوە بۆ گەڵوانی، .لەگەڵوانێ، سواری تەراکتۆران بووین، بەئاڵیاوەو نەرزەمیزدا، لە دەربەندی لەچۆمی پەرینەوە و بەجاشێران و قەلاتاندا چووینەحەڵبێ.هێزی سمکۆ، پیاوانە تەواوی رێگاوریانی دەرچووغانی خستبوە ژێرچاوەدێری ولە هەموو گوندەکانی سەر رێگا، پێشتر پێشمەرگەو هێزی بەرگری ئامادەبوون.کاک فەتاح دووربینێکی شەوی پێبوو، لە شوێنە بە ترسەکان دەوروبەری رێگای باش دەپشکنی. شەو لەگوندی حەڵبێ پێشمەرگەیان دامەزراند، بەوشەرتەی بەیانی زوو، لە گوندی دەرکەون بۆ(قۆزلو).

قۆزلو دارستانێکی خۆ رسکە لە پشتی (حەڵب و کۆیکان).دۆڵێکی پڕ لە دارەگوێز ولێرەوارێکی ئەستەم و چڕ و رژد و بەردەلانە. خەڵک بەچاک و پیری دەزانن و دارەکان نابڕن.رۆژانی جێژن و نەورۆز و بەهاران خەڵکی ئەو گوندانە بۆ شایی و زەماوەند و سەیران روو دەکەنە قۆزلو،مەکۆ وپە ناگای دڵدارانە.

ماڵەئامۆزاییێکم لە حەڵبێ بوو،شەو لەگەڵ کاک عومەر و یەک دوو برادەری دیکە چووینە وێ. باسی میوانداری ئەو شەوە ناکرێ. شەو پێم گوتن بەیانی گیسکێک بکوژنەوەو لەگەڵ نان و برنجێکی زۆر بیهێننە قۆزلو. بەیانی زوو سواری تەراکتۆرانیان کردین بۆ قۆزلو.ئێمە لە شاوەلە بیروینەدوو دەسنە، دەستەی سەرهەنگ قادری و کانەبی دەبوایە دوایە بێن و لە قۆزلوێ پەکتر بگرینەوە.دە ستەی پێشێ، تێبینی خواردەمەنی رێگاو تێشوویان نەکرد بوو، بەرنامەی رۆیشتن دیارنەبوو.باشبوو ئامۆزاکانی من بە درنگەوە چێشت و نان و پەنیرێکی زۆریان هێنا. بریار وابوو دوای نیوەرۆ بکەوینەرێ.بەلام هیچ دیار نەبوو. فەتاحی کاویان و کاک ئۆمەر لە پێشمەرگەکان جیا ببوونەوە، نەیاندەزانی لە کوێن.ناچار لە بن داران لێی بلاو ببوون ، بایەک ساردی دەهات و مرۆ خۆی

رانەدەگرت. نیوەشەو دەستەدووەمیش گەیشتیْ، لە سەر بیْ بەرنامەیی لە نیوان نەبی قادری ویرای شەهید حاتەمی دا بوو بە دمەقالیەکی توند. پیشمەرگە برسی ببوون و هیچیان پینەبوو. بەیانی نامەیەکم نووسی بۆ برادەرانی حیزبی لەگوندی (کۆیکان)کە پیشتردەمناسین. بۆم نووسین کە نان وپیخۆرێکی زۆرمان بۆبینن. بەیانی زوو برادەرێک داگەرا خواریْ و نامەی برد. نیوەڕۆ بەتەراکتۆر نان و چیشت وپەنیرێکی زۆریان گەیاندینیْ. پەتویەکی زۆریشیان هینابوو.ڕۆژی دوایی سەعاتی چواری ئیواریْ، کەوتینەریْ، سەعاتی دووی دوای نیوەشەو هیلاک و شەکەت و برسی،گەیشتینە هۆبەیەکی عەجەمان، خەلکی ( جەبەل وجەبران) لە چوغری ورمیْ.بەو شەوە پیشوازیەکی باشیان لیکردین. نان و چایان سازکردو دوای نان وچا خواردن لیی نوستین.بەیانی کە هەستاین، دیتمان بۆنەم چادرانە ریْ ماشین هەیە . گوتیان رۆژی پیشوو پاسدارهاتوونە لایان. ئیتر راوەستان نەدەکرا، بەگورجی ولاخ بارکران وبەلاریْ و بەردە لاْ ندا وە شاخی کەو تین و دیسان چیامان بەتاقە پەناو پشتیوان دانا. چیای(ئیلانداغی)،واتە کیوی ماران.چیایەکی وشک و بیْ ئاوو بەردەلانْ،گەلیگ درنگ بەهیلاکی لە پشتی گوندی قاسملو، گەیشتینە هۆبەی (حاجی بەرکەلیان).جارێکیتریش نیشتمانپەروەری و هاودەردی خەلک خۆی نیشاندا. دانیشتوانی هۆبە .بەپیشوازمانەوەهاتن. پیاوەکان تیکڕاخۆیان بەحیزبی دەزانی. لەو پەری دلاوالەییدا میوانداریانکرد. هۆبەکە لە بنکەی پاسدارانی گەلی قاسنلو زۆر دوور نەبوو. ئیواریْ زوو کوڕەکانی هۆبەبەبی

چەک داگەرانە دەشتیْ، بۆ ئەوەی هاتوچۆی جادە بخەنە ژیر چاوەدیری.تاریک داهات، هیزی شەهید نحۆ دەورویەری جادەیان گرت و بەگورجی لە جادەی ورمیْ. شنۆ پەڕینەوەو دیسان وەچیا کەوتینەوە.

سەعات چواری بەیانی گەیشتینە گوندی (حەسار).پێشمەرگە بلاو کران، هێندێ چوونە گوندی کانی سپی.ئێمە چووینە ماڵی عیرفانی.ماڵێکی ئاوەدان، قەوغا و میوانگر.ئێواری ٣ تەراکتۆر ئامادە کران،١٩٨٢/٧/٤ گەوتینەرێ. تەراکتۆر بەهەوراز و لێژی ئەوتۆدا دەڕۆی، ئەوانەی خۆیان زۆر خۆشدەویست، دەهاتنەخوار وبەپێیان دەڕۆیشتن. لەگوندی( وەرمزیار)لە چۆمی (باراندوز) پەڕینەوە . لەهەموو گوندەکان خەڵک دەچوون ڕێگایان بەسەر دەکردەوە، دوایە ئێمە تێدەپەڕین.لای بەیان گەیشتینە گوندی( مەندە دۆڵ) پێشمەرگەی هێزی نحۆ لەوێ دەسوڕانەوە. پێشمەرگەو مەسئول بلاو کران. من لە گەڵ غەنی چوومە ماڵی حاجی حەمەدەمین. ماڵی بە خانەی خودای بێ. پێشمەرگەیەکی هێزی نحزمان هاتەلا، بەناوی (ئەحمەد بەندی) زەلامێکی چوارشانەی دانەتاشراوی سمێڵ زل و وریا ، ئینجەمەمەدی یاشارکەماڵم هاتەوە بیر. بەو تەفاوەتە کە ئینجە مەمەد کزو وردیلەبوە، ئازاو بەجەرگ و پارێزەری فەقیر و هەژاران. ئەحمەد بەندی، زەلام و دڕ و ئازا، بەلام دز و جەردەو تالانچی و پێشمەرگەی حیزبیش.بوونی ئەحمەد بەندی لەم ناوچەیە، ترسی پاسدار و ژاندرمەی کەم کردبۆوە.بەلام خۆی جێگای هەموو پیار خەراپێکی گرتبۆوە . ئەو دەم دروسێ کەس هاتن و گازەندەیان کرد، من بەغەنیم گوت، ئەوە بۆ راووروت بۆتە پێشمەرگە. خۆزیا بزووتنەوە ی رزگاریخوازی کورد لەو دزو چە تانەی بەناو(پێشمەرگە)پاک کرابانەوە.

ئەو رۆژە لە ماڵە حاجی باش حەسایتەوەو خزمەتی باشیان کردین. ئێوارێ چوار تەراکتۆریان ئامادەکرد و سوار بووین. شەوێکی سارد، ڕێگایەکی دوور و هەوراز ولێژ و ناخۆش. لە گوندی(ذولی‌پیسیان) راوەستاین، چەند پێشمەرگەچوون ڕێگای ورمی . مەرگەوەڕ بەسەر کەتەوە. خەڵکی گوندی بەئامێزان نان وپێخوریان دەهێنا. لە ڕێگای

( بە ندیٰ) پە ڕینەوەو کەوتینە سەر جادەی سۆما . مەرگەوەڕ.دوای نیوەشەو گەیشتینە گوندی (حەکیٰ) چووینە ماڵە عە ولاٰ بەگی. دیوە خانێکی زەلامی فەرشکراو، بەلاٰم کەسمان لیٰ وەدەر نەکەوت. مرادی دروی کە سەردەمێک جاشی ڕاونانی سولەیمانی موعینی و مراد شێریڤ و جەماعەتی ئەوانبوو، ئێستا خۆی خزاند بوە ریزی پێشمەرگەوکەس نەبوو حیسابی لیٰ بکێشیٰ، سەبر ئەوەیوو زووریش دم لە پێشبوو.هاتبوو رەگەڵ ئەو دەستەیە کەوتبوو، بۆلای سنووری تورکیا دەچوو.شەو چوو لە یەک دوو ماڵاٰن چەند لێفەو پیٰخەفی هێنان و تا بەیانی بیٰ نان و چا سەرمان نایەوە. بەیانی کە هە ستایـن، گوتیـان عـەولاٰبەگ شەویٰ رایکردوەو چۆتـەورمیٰ. نـاڵۆزی کـەوتـە نێو بـرادەران، بـیٰ ئـەوەی جێگایـان کۆ بکـەینـەوە، بەگـورجی وەدەر کـەوتیـن و لە نـێو گونـدی ٣ تـەراکتـۆر دززرانەوەو دەبوایـە خێرا لـەگوندی دەرکـەوین و دەست وەچیـا بدەیـن. پێشمەرگەو تەراکتۆر کەوتنەریٰ، من ر کاک فەتاح و سەرهەنگ قادری و چوار پێشمەرگە ماینەوەو چووینە ماڵی برای عەولاٰبەگی. نان و چایان ساز کرد و بڕێکی بەسەر داهاتین کە عەولاٰبەگ بۆ شەویٰ رایکردوە. لە وانـەیە خەبەری بردبیٰ، بۆ پاسداران. گوتی عەولاٰبەگ خەبەریٰ نادا. ترساوە.ئەگەر کەسێکی تریش خەبەریدا.ئەو بێژیٰ ئەزلە ورمیٰ بوومەو ئاگادار نیمە.دەیگوت : عەولاٰ بەگ خاین نیە. ئێمە خاین نین.ئەگەر پێشمەرگە لێرەبیٰ، ئەمیش کوردبن،ئەگەر پێشکەرگەش لێرەنەبیٰ، ئەم جاشین. نانو چاییمان خوارد و ئێمەش لەگوندی وە دەرکەوتین وبەدوای تـەراکتـۆرانـدا، بـۆ گـەلی بـەردەڕەشی. وەسـەر کـەوتـبـن بـەدیـوی (کەلاٰنکانی)دا،خەڵکی گوندی کە لە دوورەوە چاو یان بەئێمەدەکەویٰ، لایان وادەبیٰ کە پاسدارن. دەستیان دابوە تفەنگان وئامادە ی بەربەرەکانی بوون. کە زانیـان پێشـمـەرگەیـن، هـاتنەپێشوازی و لەگـوندی بلاٰویان

کردین.من و کاک ئۆمەر چووینە ماڵی سە یفەددین کە خۆیان پێیان دەگوت: (سەفیەدین) تا لای نیوەڕۆ حەسایەنەوەو میوانداریەکی باشیان کرد و دوای نیوەڕۆ کۆ بووینەوە کە بڕۆین.لە گردێکی پەنا گوندی دانیشتین کە مەسئولەکان هێندێ قسە بۆ پێشمەرگەکان بکەن.خەڵکی گوندیش کە نانیان دابووینێ و خزمەتیان کردبووین، بۆ بەرێکردنیشمان هاتبوونە ئەو شوێنەی ئێمە لێی‌کۆببووینەوە. کاک نەبی قادری هەستا و بەخەڵکەکەی گوت: « کاکە ئێوە بڕۆن و لێمان دوور کەونەوە» من لەو دەنگدانە زۆر نارەحەتبووم.پاشان هێندێ قسەی کردن، لە بەر نارەحەتی نەمزانی چیگوت.

بەدوای ئەودا کاک فەتاح هەستا لە سەر دیسیپلین و هێندێ کەم وکوری قسەی کرد و پاشان داوای لە من کرد کە هێندێ قسە بۆ پێشمەرگەکان بکەم.رابووم گوتم بەداخەوە دەبێ قسەکانم بە ڕەخنە لە بۆچوونی کاک نەبی دەست پێبکەم. نازانم چ پێویست بوو ئەو خەڵکەی هیوای بە ئێمەیە، نانیان داوینێ، یارمەتیان داوین، دەنگیان بدەین کە لە ئێمە دوور کەونەوە. دەکرا ئێمە بڕۆین لەو مەزرایە لە جێیەک دانیشین قسەی خۆمان بکەین و کەسیش دەنگ نەدەین. پاشان لە سەر بێ بەرنامەیی و کەم و کوری ئامادەیی سەفەری وا بە ترس، وە لە سەر فیداکاری پێشمەرگە قسەم کردو لە فەرماندەی هێزی نحزو پێشمەرگەکانی سوپاسم کرد. دیارە کاک نەبی قادریش هەروەک هەموو ڕێبەرانی حیزب نەیگوت و ناشڵێن کە جارێک لە جاران هەڵەیەکمان کردووەو دەبێ ڕاستی کەینەوە. پێیان وایە هەرچی کردوویانە هەمووی هەر باش بووەو هەڵەی تێدا نەبووە. دوای قسەکانم کەوتینە ڕێ بەرەو گەڵی بەردەرەشی. لە سەر چۆمی (ئەرزین) ڕەسمی جوانمان گرتن و لەو ئاوە ساردە پەڕینەوەو چووینە گوندی (بانی). لە چیمەنی پێش گوندی

دانیشتین کە بحەسینەوەو بزانین وەزعی گوندی چۆنەو چۆن بڵاو دەبین. برادەرێکی خەڵکی گوندی بە ناوی کازم لە پێشمەرگەیەک دەپرسێ، ئەرێ ئەوە کەریمی حیسامی نیە لەگەڵتان؟

- بەڵێ راست خۆیەتی.

دیتم کازم هات، زۆر بە گەرمی بەخێرهاتنی کردم و گوتی: «فەرموو تۆ میوانی منی کێش لەگەڵ خۆت دێنی بێنە». دەپێشدا نەمناسی دوایە وەبیرم هاتەوە کاتێک لە مەهاباد بووین ئێوارەیەک پێشمەرگەی قاوەخانەی ئەمیرئاباد وەژوور کەوتن گوتیان: دوو جاشی چەکدارمان گرتوون لە تەوریزەوە دەهاتن، هیناومانن. گوتم بیانهێننە ژوورێ. کە وەژوور کەوتن، جانگیرئاغای دەری و ئەم کازمە. دوکتور قاسملو خەبەری دابوە جانگیرئاغا کە بێتە مەهاباد. ئەو دەم جانگیرئاغا تفەنگی دەولەتی لەکن بوو، لە ورمێوە دەچێتە تەوریز، لە تەوریزەوە بۆ شوێنە ونکە دێتە مەهاباد. لە ئەمیرئاباد پێشمەرگە دەیگرن و چەکی دەکەن و هێنابوویانە تەشکیلاتی مەهاباد.

لە پێشمەرگەکانم وەرگرتن و بردمنە کن دوکتور قاسملو. چووینە ماڵی کازم، لام وایە کاک ئەمیرو کاک تۆمەریش لەگەڵ من هاتن. کاک عومەر کرابوو بە بەرپرسی تەشکیلاتی ورمێ کە بنکەی لە باتی بوو. پێشمەرگەکانی‌تر لە نێو گوندی بڵاو کران. دوای نیوەرۆ کۆبووینەوە گوتیان ئەو چۆمە ماسی زۆرە. گوتم کە وایە با بچین ماسیان بگرین. کاک فەتاحی کاریان کە ئەندامی دەفتەری سیاسی و بەرپرسی دەستە بوو گوتی: «کاک کەریم حیزب راوە ماسی قەدەغە کردوە». گوتم: «بەڵای گەورە لە سیاسەت و لە حیزبایەتیدا ئەوەیە کە وشک بە فەرمان و بە دەستوورەوە بنووسی. حیزب لە سەدەی مەهابادو لە چۆمەکانی جەغەتوو تەتەهو ماسی گرتنی قەدەغە کردوە، چونکە ماسی تێدا ناهێڵن و دەیبەن

بۆ تەوریزو بۆ ورمێ. ئیستا لەم شاخ و داخە لەم چۆمە رژدو خوڕو بەفەراوە، پێشمەرگەی ماندوو برسی چەند رۆژە گۆشتیان نەدیوە ئەگەر بچن ماسی بگرن قەدەغەیە؟» کاک فەتاح گوتی :«مەسئولیەتەکەی لە ئەستۆی تۆیە». گوتم جا کەوایە کورینە با بچین بۆ ماسیان. خەڵکی گوندیشمان لە دەورە بوون ئەوانیشمان بردن. گۆمێکیان نیشان داین گوتیان پڕە لە ماسی. غەفور یەکدەست نارنجۆکێکی تێهاویشت و ماسی وەسەر ئاو کەوتن. دەست کرا بە ماسی گرتنەوە. خەڵک تەجروبەیان هەبوو گۆزەویان لە دەستی دەکردو یەک ماسی دەرباز نەدەبوو. راو تەواو بوو سەدو هەشتا ماسی گیرابوونەوە. پێشمەرگەکان و خەڵک وەک برایان بەشیان کردن و هەرکەس بۆ مزلی خۆی بردەوە.

رۆژ ١٩٨٢/٧/٧ کاک فەتاح و پێشمەرگەکانی هیزی نحو بەرەو سۆما کەوتنە ڕێ. بەشی تەشکیلاتی ورمێ لە بانی جێگیر بوو. من و کاک ئەمیری قازی کە موسافیر بووین لە ماڵە کازمیماینەوە.ڕانکو چۆخێکی سپی جوانم هەبوو، دامن بە کاک هەمزەی قادری و خۆم کردەوە ئەفەندي. ناردمان لە دووی ئەحمەد دەري کە پاسپۆرتەکانمان بۆ عیلاج بکاو مۆرێکی تورکیایان لێ بدا. ئەحمەد هات پاسپۆرتەکانی بردن، بەڵام پاش دوو رۆژ پاسپۆرتەکانی ناردبۆوەو نووسیبووی هیچم بۆ نەکراوە.

رۆژی ١٩٨٢/٧/١٠ رادیۆی دەنگی کوردستان خەبەری شەری سۆمای بڵاو کردەوە. شەهید بوونی پێشمەرگەیەکی زۆر ئازاو بە بیروباوەری راگەیاند بە ناوی (رەحیم خەنی). وای کە ئەو خەبەرەم بیست خورپەم لە دڵی هات. لەو چەند رۆژەدا کە پێکەوە بووین هەڵویست و گورج و گۆڵی رەفتاری لەگەڵ برادەران و بۆچوون و بیروباوەری سیاسی ئەورۆلە دیهاتیە چۆن کاری تێکردبووم. چەند هیوادار بووم کە کوری ئاوا لە نێو پێشمەرگەدا زۆر بن و بزانن بۆچی چەکیان هەڵگرتوەو رێبازی

رزگاری نەتەوەکەیان کامەیە.

لەگەڵ کاک ئەمیر ناردمان لە دوای ئەسفەندیار، یەک لەو بەگزادانەی دەری لە گوندی (ئەربیلان). رۆژی ١٩٨٢/٧/١١ ئەسفەندیار پەیدا بوو. دوای نیوەرۆ لەگەڵ ئەسفەندیارو کازم ولاخیان بۆ ئیمەش پەیدا کردو سوار بووین چووینە ئەربیلان ماڵە ئەسفەندیاری. کورێکی جوامێرو تێگەیشتوو حەز لە پیاوەتی. رۆژی دوایی لەگەڵ ئەسفەندیاری چووینە گوندی (ئەلوسان) نزیک سنووری کوردستانی تورکیا. جا لەوێ پتر لە شوێنەکانی تر هەست بە ژێر دەستی کورد دەکرێ. لەو گوندەوە پستویەک دیار بوو هەر رێگای پازدە دەقیقە دەبوو، دەیانگوت ئەوە تورکیایە، واتە کورستانە ئاوا لەت و پەت کراوە.

ماڵە جانگیرئاغای دەرێ و کورەکانی و عاسمی برای هەموویان لەو گوندەی بوون، بەڵام ئەسفەندیار ئێمەی لە ماڵی«حاجی دورسون» دابەزاند. لە راستیشدا ئێمە بووین بە میوانی حاجی. کورەکانی جانگیرئاغاو براکەی و هەموو هاتن و بەخێرهاتنیان کردین و ئیتر هەر لە ماڵە حاجی لێی دانیشتین. بە کورەکانم گوت: خەبەر بدەن جانگیرئاغا بێتەوە. ئەو دەم لە تورکیا بوو، هاتوچۆ بۆ ئەوان کەند و کۆسپی نەبوو، چونکە هەموویان پێناسەی تورکیاشیان هەبوو.

حاجی دۆرسون کە وا رەسمی نورانی لەم کتێبەدا دەبینرێ دەوڵەمەندێکی گەورەی ئەو مەڵبەندە بوو. دەیانگوت حەوسەت مەری هەیە. بە ژن و کورو کچ و نەو نەتیژەوە هەشتاو یەک کەس بوون. واتە گوندەکە هەر ئی‌وان بوو هەر ئەوانیشی تێدا بوون. ماڵە جانگیرئاغاو کورویرای لەبەر لێ‌قەوماوی هاتبوونە ویندەرێ و هەر لە سەر ماڵە حاجی بوون. مانگی رەمەزان بوو حاجی بەرۆژوو دەبوو تا ئێوارێ دەتگوت لغاو کراوە دمی پێک دادەاو یەک قسەی نەدەکرد. کە بەربا نگی دەکردەوەو

تێری دەخوارد، وەقسە دەکەوت نۆرەی کەسی نەدەداو هەتا پارشێوی نەدەنووست، خەویشی لە ئێمە حەرام کردبوو.

حاجی فەعلەی گیادروونی هەبوون دەچوو سەریان بدا کە دەهاتەوە لە دەست فەعلان هاواری بوو، دەیگوت: کاک سەید ئەحمەد لەگەڵ ئەو فەعلانە هیچ ناکرێ رۆژێ پێنج جار چای دەخۆنەوە.! ئێوارەیەکی میوانی دیکەی هەبوو. گوتم: حاجی تۆ تەمەنت زۆرە رەنگە رۆژوت لە سەر نەبێ، بۆچی خۆت نارەحەت دەکەی؟ میوانەکەی گوتی: «لە بەر ئەوەیە بەڵکو لە بەهەشتێ دوو سێ حۆری بدەنێ». گوتم ئەوە نیە دوو ژنی هەن و ئێتر لە بەهەشتی چی دەوێ؟ حاجی وەدەنگ هات گوتی: «کاک سەید ئەحمەد تۆ بڵێی لەو دنیاش لە چنگ ئەوانە نەجاتیم نەبێ».

خواردنی نیوەرۆو ئێوارانمان شۆرباوێکی سوور لەگەڵ باینجانی رەش و بیبارو کولەکە بوو. نیوەرۆیان هەر چۆنێک بێ شتێکمان دەخوارد. ئێواران کە نانیان دێنا لەگەڵ کاک ئەمیر لە بنەوە خێمەیەکمان لێ دەکرد، نەخێر هەر شۆرباوە سوری نیوەرۆیە بوو. ئێمە دەستمان لێ نەدەدا، ئەویش قەت تەریق نەدەبۆوەو هەموو جەمان لە قاپی ناقۆلادا دەهاتەوە پێشمان.

خوار راستان رۆژی ١٩٨٢/٧/١٥ جانگیرئاغا هاتەوە. بەڵام چ هاتنەوەیەک، میوانی لەگەڵ بوون بە میوانەوە ئەویش میوانی حاجی دووسون بوون. لە راستیدا ماڵە حاجی مزڵ و میوانخانەی ئەوانیش بوو. جانگیرئاغا ئەفسەرێکی ئێرانی خەڵکی ورمێی لەگەڵ خۆی هێنابوو. دیار بوو یا جانگیرئاغا پێی گوتبوو یا پێشتر ناوی منی بیستبوو زۆر بە گەرمی لەگەڵ من دایمەزراندو خەیاڵپڵاوی سەیری دەکرد. دەیگوت: «پێویستە عەشیرەتەکانی کورد ئامادە بکرێن و چەکدار بکرێن و پەلامار بەرنە سەر لەشکرو پاسدارانی خومەینی و ناوچەیەک ئازاد بکەن». واتە

بە خەیاڵی ئەوەدەبوایە کوردەکە خۆ بە کوشت بدا، ناوچەیەک لە کوردستان ئازاد بکا ئەو دەم جەناب سەرهەنگ و هاوکارەکانی بگەڕێنەوە لەسەر کوردو کوردستان ئاغایەتی بکەن. سەرهەنگ سوپیهر لە رادە بەدەر بۆ باخ و زەوی و زارو ئەسپەکانی بە پەرۆش بوو. بە درێژی باسی ئاگۆزگی ئەفسەرە ئیرانیەکانی دەکرد. دەیگوت: «شاپوری بەختیار مانگانە نیو ملیۆن دۆلار لە عیراق وەردەگرێ بە پارە هێندێ کەسی کڕیوە، ئەو ئەفسەرە ئیرانیانەی کە لەگەڵ بەختیارن مانگانە نۆ هەزار فرانکی فەرانسە وەردەگرن. من گوێم بۆ شل دەکردو ئەویش دەیگوت. کە لێک هەڵدەبراین خلتەی قسەکانم یادداشت دەکرد.

جانگیرئاغا گوتی: «لەگەڵ خۆم دە تێکەینمە دیاربەکر. بەلام پاسپۆرتی کاک ئەمیری تەواو نەبوو. بریارمان‌دا من بڕۆم و پاسپۆرتی کاک ئەمیری لەگەڵ خۆمان بەرین و لە تورکیا چاوەڕوانی بم هەتا پاسپۆرتەکەی بۆ دەگەڕێتەوەو دەمگاتێ.

رۆژی ١٩٨٢/٧/١٨ کاک ئەمیرمان بەجێ هێشت و لەگەڵ جانگیرئاغا بە پێیان چووینە ئەودیوی بستوێ کە گۆیا خاکی تورکیا بوو. چەند سەربازی تورک لەوێ بوون وەپێشمان کەوتن بۆ پاسگایەکی نیزامی. لەوێ کە جانگیرئاغایان دیت بەخێرهاتنیان کردو تێ‌پەڕین چووینە گوندی (ساری ئۆلدوز) کە لە پێشدا ناوی ئەم گوندە (کەوکەبە) بووەو تورک ناوەکەیان گۆڕیوە. چوینە ماڵی حاجی تەیمور، پێشوازیەکی گەرمیان کرد. خەلکی گوندی دەهاتنە بەخێر هێنانی جانگیرئاغاو دەستیشیان ماچ دەکرد. حاجی تەیمور پیاوێکی پیری لەسەر خۆو قسە خۆش. لە راپەڕینەکانی شێخ سەعیدو ئارارات دا بەشداری کردبوو. دەیگوت خودای گەورە هەر بەوەندە دەم بەخشێ کە تورکی زۆرم کوشتون. باسی جنایەتی تورکانی دەکرد کە لەگەڵ کورد کردوویانە. دوای خواردنی

نان و چایەکی کوردانە ماشینێکی سواریان هێنا، سوار بووین چووینە گوندی «باسان» ماڵە حاجی مەجیدی کە پێیان دەگوت «مەجو». ماڵێکی ئاوەدانی مۆدێرنی شارستانی. گوندی باسان مڵکی جانگیرئاغا بوو، دوای سەعاتێک حەسانەوە سوار بووین چوینە «گەوەر» لە نێو شار ڕاوەستاین ناردی ماشێنێکی میرسیدیسیان هێناو سوار بووین چوینە وان. لە ڕێگا کە تەماشای پاسی جانگیرئاغایان دەکرد ئیتر ڕایان نەدەگرتین. ئێواریێ سەعاتی حەوت گەیشتینە وان. جانگیرئاغا بەرۆژوو بوو، یەکسەر چوینە ڕەستورانێک نانمان خواردو شەو چوینە هۆتیل کێنت. من لەگەڵ شۆفیرەکەی شەو چووم بلیتی ئوتوبوسم کڕی بۆ ئانکارا. شۆفێر کە لە تەواوی ڕێگادا بێدەنگ بوو کە زانی کوردی ئێرانم جانگیرئاغاشمان لەکن نەبوو دەستی پێکرد. لە پێشدا لە حیزبی دیموکراتی پرسی پاشان بە ئاغاو سەرۆک عەشیرەتاندا هاتە خوارو گوتی: «ئاغاو سەرۆک عەشیرەتی کورد گشتیان پیاوی بێگانەن و هەمیشە کوردیان فرۆشتوە». شەو تکام لە جانگیرئاغا کرد کە پاسپۆرتی کاک ئەمیری زوو جێبەجێ بکاو بیخاتە ڕێ. گوتی: «لە ئانکارا بچۆ هۆتیل پاریس. چاوەڕوانی کاک ئەمیر بە، دەینێرم بۆ ئەوێ».

ڕۆژی ١٩٨٢/٧/١٩ سەعاتی چوارو نیوی دوای نیوەڕۆ جانگیرئاغا لەگەڵم هاتە کاراژو سواری ئوتوبوس بووم بەرەو ئانکارا. نامەیەکم بۆ کاک ئەمیر نووسی کە وا لە هوتیل پاریس لە ئانکارا چاوەڕوانت دەبم. ڕۆژی دوایی سەعاتی دوو گەیشتمە ئانکارا شەوی ٧/٢١ لە ئانکاراوە تەلیفونم کرد بۆ سۆفیاو لەگەڵ دایکی کەماڵ قسەم کرد. سێ ڕۆژ لە ئانکارا چاوەڕوانی کاک ئەمیری بووم نەهات. ڕۆژی ١٩٨٢/٧/٢٤ بەرەو ئەستەنبول کەوتمە ڕێ. لە ئەستەنبول چوومە هوتیل تەوریز کە خاوەنەکەی کورد بوو. لە ئەستەنبول توشی برادەرێکی کوردی سوریا بووم

بە ناوی دوکتور خەلیل. پاش ملە بە ناو دەیناسیم. بردمی بۆ ماڵی خۆیان لە ئەستەنبوڵ شوێنە مێژوویەکانی نیشان دام، ڕۆژی ٧/٢٦ لە شیرکەتێکی توریستی بلیتی بۆ کریم و نەیهێشت خۆم پارەکەی بدەم، سوار بووم بۆ سۆڤیا. لەسەر سنور ویزای پاسپۆرتەکەم ١٤مانگی تێپەڕیبوو. دەهەزار لیرەیان لێوەرگرتم و دەرباز بووم.

## دیسان لە نێو ماڵ و منداڵ

ڕۆژی ٨٢/٧/٢٧ گەیشتمەوە سۆڤیاو بە دیداری دایکی کەماڵ و منداڵەکان شاد بوومەوە.

ڕۆژی ٧/٣١ تەلیفونم کرد بۆ کاک عەزیزی ماملێ باس و خەبەری کوردستانم پرسی. خەبەری شەری پیرانشارو هەوشاری پێ گوتم، کە شازدە پێشمەرگە شەهید ببورن. ڕۆژی ١٩٨٢/٨/٩ کاک ئەمیری قازی گەیشتە سۆڤیا. من هەر دوای ئەوەی کە گەیشتمەوە سۆڤیا چوومە باڵوێزخانەی سۆڤیەت و لەگەڵ سکرتێری یەکەمی سەفارەت مەسەلەی سەفەری دوکتور قاسملوم بۆ مۆسکۆ باسکرد. کابرا گوتی: «ئێمە خەبەر بۆ مۆسکۆ دەنێرین، ئەگەر جواب هاتەوە ئاگادارت دەکەین». ڕۆژی ١٩٨٢/٨/١٣ لە باڵوێزخانەی سۆڤیەتەوە تەلیفونیان کرد کە دەیانەوێ بێنە لات. زۆری پێنەچوو کابرای سکرتێری یەکەم لەگەڵ یەکی‌تر پەیدا بوو. کاک ئەمیریش لەوێ بوو. دەستیان کرد بە پرسیاران لە سەر بارودۆخی کوردستان. گوتم: ئەوە کاک ئەمیری قازی ئەندامی دەفتەری سیاسی حیزبی دیموکراتە هەر پرسیارێکتان هەیە وەڵامتان دەداتەوە منیش دەتوانم تەرجومەی کەم. لە وەڵامی پرسیارەکانی کابرادا لە مەر

بارودۆخی کوردستان کاک ئەمیر بە درێژی بۆی باسکردن و لە سەر رووداوەکانی کوردستان روونی کردنەوە. کابرا گوتی: «ئێوە پێویستە لە بارەی مەسەلەی کورد بە گشتی وەک مەسەلەی ٢٠ میلیۆن کورد کار بکەن. پێویستە بیرو رای خەڵکی ئورووپای رۆژئاوا بۆلای مەسەلەی کورد رابکێشن». کاک ئەمیر گوتی: «ئێمە بیروڕای ئێوەمان پێ گرنگترە پێویستە یەکێتی سۆڤیەتی سرنجی مەسەلەی کورد بدا». کابرا گوتی: «سۆڤیەت هی خۆتانە، ئێمە هەمیشە لایەنگری مەسەلەی کوردین. بەڵام روون کردنەوەو راکێشانی بیروڕای گشتی رۆژئاوا تەئسیرێکی گرنگی هەیە، ئەگەر مەسەلەی کورد وەک مەسەلەی فەلەستین لە ئورووپا دەنگ بداتەوە زۆر بە قازانجی کوردە». بە کورتی لەگەڵ کاک ئەمیر باسێکی گەرم و دۆستانەیان هەبوو. رۆژی دوایی کاک ئەمیر سەفەری کرد. رۆژی ١٩٨٢/٨/٢٥ سکرتێری سەفارەتی سۆڤیەت تەلیفونی کرد کە بچم بیبینم. لەوێ کابرا گوتی: «کومیتەی هاوپەیوەندی لەگەڵ گەلانی ئاسیاو ئەفریقا داوەتی کردووی کە بۆ ماوەی ٢٠ رۆژ بچیە مۆسکۆ. لە وانەیە وەڵامی داخوازیەکەشتان لە وێ وەربگریەوە. ئەگەر موافقەت دەکەی رۆژی ٨٢/٩/٢ لە مۆسکۆ چاوەڕوانت دەبن». رۆژی ٨٢/٨/٢٨ تەلیفۆنم بۆ پاریس کرد کە بە کاک عەزیزی ماملێ بڵێم سەفەرێکی ئاوام بۆ هاتۆتە پێش، خەبەر بدا بە دەفتەری سیاسی. نەمتوانی بیدۆزمەوە. رۆژی ٨٢/٩/١ تەلیفۆنم کردەوە بۆ پاریس، دوکتور سەعید جوابی دامەوەو گوتی: «لە مەو دوا نامەو شت بۆ عەزیزی ماملێ مەنێرە. ئەو لێرەدا مەسئولیەتی نەماوە». خەبەری وڵاتی پێ گوتم و گوتی: «لە پیرانشار شەری گەورە کراون و حەمەدەمینی کاکە سواری مەنگور گوژراوە. پاشان گوتی: تکایە سەلاح بەدرەددینم بۆ بدۆزەوەو ئادریس و تەلیفۆنی ئەوم بۆ پەیدا کە». پێم گوت: لە مۆسکۆ داوەت کراوم بۆ ٢٠

رۆژ. گوتی: «لام وایە چوونت زەرەری نیە». هەر ئەو رۆژە ئامادەیی خۆم بە بالوێزخانەی سۆڤیەت راگەیاند.

## سەفەر بۆ مۆسکۆ

رۆژی ١٩٨٢/٩/٢ ماشێنێکی بالوێزخانەی سۆڤیەت هات و لەگەڵ دایکی کەمال سواری کردین بۆ فرۆکەخانەو سەعاتی یەک و نیوی ئەو رۆژە گەیشتینە مۆسکۆ. لە فرۆکەخانە چاوەروانمان بوون سواریان کردین بردیانین بۆ هوتێل «روسیا». رۆژی دوایی بردیانین بۆ گەران و بۆ دیتنی موزەی کرملین. رۆژی١٩٨٢/٩/٤ بردیانین بۆ کۆمیتەی هاوپێوەندی گەلانی ئاسیاو ئافریقاو دوو کەس پێشوازیان لێ کردم و لە ژورێک بە درێژی لە سەر مەسەلەی کورد بە گشتی و مەسەلەی کوردستانی ئێران و شەرو پەلاماری رژێم و سیاسەتی حیزبی دیموکرات و کۆنگرەی پێنجەم قسەم کرد. پاشان داوام کرد کە دەستەیەکی نوێنەرایەتی حیزبی دیموکرات بە سەرۆکایەتی سکرتێری گشتی حیزب بێتە مۆسکۆ. لام وایە دانیشتنەکەمان دوو سەعاتی خایاند. کابرای چاو ساخی من فارسیەکی رەمەکی دەزانی، لە رووسیەکەی من باشتر نەبوو. من دەمویست بە رووسی قسە بکەم و رووسیەکەم بە هێز بکەم. کابراش دەیویست فارسیەکەی دمەزەرد کاتەوە. پاش باسێکی زۆر گوتیان جارێ تۆ سەفەرەکەت درێژە پێ بدە، پێش رۆیشتن جارێکی دیکە یەکتر دەبینینەوەو جوابیشت دەدەینەوە.

رۆژی٨٢/٩/٥ بۆ نیوەرۆ چوینە ماڵی کاک عەزیز محەمەدو لەگەڵ دایکی ڤینک نانمان خوارد. شەو سەعاتی دوازدە سواری قەتاریان کردین

بۆ لینینگراد. رۆژی ٨٢/٩/٦ گەیشتینە لینینگراد لە هوتیل ئاستۆر میوان بووین. هەر ئەو رۆژە داوام کرد کە چاوم بە پرۆفیسۆر قەناتی کوردۆ بکەوێ. رۆژی دوایی گوتیان نەساخەو لە خەستەخانەیە. چەندە راست بوو نەمزانی. لە لینینگراد بردیانین بۆ مۆزەی «ئارمیتاش» کە یەکیک لە مۆزەخانەی عەجایبی دنیایە. پاشان بردیانینە سەر پاپۆری «ئۆرۆرا» کە هەوەلین تۆپی شۆرشی ئۆکتۆبری تەقاندبوو. رۆژی دوایی بردیانین بۆ «رازلیف» ئەم شوینەی کە لینین چەند رۆژی پێش شۆرشی ئوکتوبر خۆی تێدا شاردبۆوە. رۆژی ٨٢/٩/٨ بردیانین بۆ تەماشای کۆشکی پیتری کەبیر کە سی کیلۆمیتر دوور لە لینینگراد لەسەر خەلیجی فینلاند بە بۆنەی سەرکەوتن بەسەر سویددا سازی کردبوو. یەک لەو شوینە سەیرو حاجباتیانەیە کە مرۆڤ لە دیتنی سەری سور دەمێنێ. کۆشکی پیتری کەبیر کراوەبەمۆزەو جیگای سەیر وتەماشای توریست ومیوانانی بیگانەیە.

رۆژی ٩٨٢/٩/٩ لە لینینگرادەوە بەفرۆکە چووینە (سۆچی) لە هوتێل (کامیلیا) میوان بووین. هوتێلێکی لە رادەبەدەر شاز و لە سەر دەریا سازکراوە. پڕبوو لە توریستی ولاتانی جوربەجۆر. میزی نانخواردنی هەر دەستەو گروپێک ئالای ولاتەکەیخۆیان لە سەر دانرابوو. ئیمە بەپاسپۆرتی کۆماری یەمەنی دیموکراتی سەفەرمان کردبوو. نیوەرۆ کە چووینە سەر نانخواردن میزەکەی ئیمەش ئالایەکی یەمەنی دیموکراتی لێ دانرابوو. کابرای چاوساغمان گوتی: چونکەپاسپۆرتەکانتان یەمەنین، بۆیە ئالای یەمەنیان داناوە.

گوتم لەگەڵ ریزم بۆ کۆماری یەمەنی دیموکراتی، بەڵام با لای بەرن. یێکەم ئیمە وەبەمەنیان ناچین، دووەم تازە تا ئالای کوردستان لە سەر میزەکەم دانەنرێ، نایەمەوە ئیرە. کابرا گوتی: «بە هیوای ئەو رۆژە».

رۆژی دوایی بردیانین بۆ مەزرایەکی چایی لە گورجستانو چووینە گۆلی(ریتسا)لە چیاکانی گورجستان، یەک لەو شوێنە جوانانەی گورجستانە.رۆژێکی‌تر بردیانینەئەشکەوتی(ئافونی‌تازە)لە نیزیک شاری (سوخوم).پان‌و بەرینی ئەم ئەشکەوتە یەک میلیون میتری چوار گۆشە و رێگای کیلۆمیترونیوێک قەتار دەچێتە نێوی .شوێنێکی دیدەنی و تەماشایێە. رۆژی ٩٨٢/٩/١٨ گەڕاینەوە بۆ موسکو، لە هوتێل ئینترناسیونالْ میوان بووین.رۆژی دوایی بردیانم بۆ کۆبوونەوە، یان چاو پێکەوتنی دوو کەس لە ئەندامانی کومیتەی هاوکاری گەلانی ئاسیاوئەفریقا.لە وانەی پێشوو کە دیتبوومن، یەکیان گۆڕابوو.دوای ئەحواڵپرسی‌وخۆش و بێشی سەفەر، من دام‌مەزراندو گوتم:« بیرورای دەوڵە تی سوڤێت لەسەر وەزعی کوردستان چیە؟ئیستا ئێمە شەرێکی نابەرامبەر و نەویستوومان بەسەردا سەپاوە.حیزبی دیموکرا ت هەمیشە ویستوویە مەسەلەی کورد لە رێگای ئاشتیەوە چارەسەر بکرێ، بەڵام حکومەتی ئیسلامی ئیران لە شەر زیاتر زمانی دیکەنازانێ.» لە وەڵامی قسەکانی مندا کابرا گوتی :«ئێمە ناتوانین رێگای خەبات بەئێوە نیشان بدەین، شۆرشگێرانی کورد، رێگای خۆیان باشتر دەزانن.لە بارەی سەفەری دەستەی نوێنەرایەتی حیزبی دیموکرات، ئێمە ئەو چاوپێکەوتنەمان پێخۆشە.بەڵام ئەگەر هەلومەرجی لەبار بۆ سەفەوی ئاوا هەڵکەوێ.برادەرانی ئێمە پێیان وایە ئێستا ئەم هەلومەرجە لە بار نیە.ئێمە ناسیارێکی ئەو تۆشمان لە سەر رێبەرایەتی ئێستای حیزبی دێموکرات نیە.برادەرانی ئێمە لە بەغدا بۆ دیتنی بەرپرسانی حیزبی دیموکرات ئامادەیان هەیە. پێمان خۆشە چاوپێکەوتنیان بەردەوام‌بێ. سڵاوی رەفیقانەمان بۆ دوکتور قاسملوهەیە».

رۆژی ٩٨٢/٩/٢١ گەڕاینەوە بۆ سوفیا. کەماڵ هاتبوەفرۆکەخانەو

گوڵی بۆ دایکی هێنابوو.سەفەرێکی مێژوویی بوو لە ژیانمداو زۆر شتیشی لێ فێر بووم.لەو ماوەیەدا کە لە سوفیا بووم کاک حوسێنی کورد نژاد کە ئەو دەم لەتەشکیلاتی ئوروپادا دوکتورقاسملوکردبوویە بەرپرسی کاری کولتووری، یەک دووجار تەلەفونی کرد لە سەلاح بەدرەددین و عاتیف ناوێک دەگەڕان کە گۆیا دوکتور چەکی لێ کڕیبوون ونەدەدیترانەوە.

ڕۆژی ٢٣/١/٩٨٢بەشێوەیەکی فرەسادەو بێدەنگ، شایی شلێرمان بەڕێوە برد. دەڵێم سادەو بێدەنگ،چوونکە نەدایکی و نەمن‌ڕازی نەبووین. بەڵام خۆی بڕیاری دابوو، هیچ نەدەکرا.

## گەڕانەوە بۆ کوردستان .

ڕۆژی ٢٦/١/٩٨٢لە سۆفیا سواری ئۆتوبوس بووم، ڕۆژی دوایی سەعاتی هەشتی بەیانی گەیشتمە ئەستەمبوڵ.کاک ئەمیری قازی کاتی ڕۆیشتنی لە سوفیا گوتی لەگەڕانەوەدا لە ئەستەمبوڵ بچۆ هوتێل‌تاران،خاوەنەکەی حاجیەکی شکاکی لای خۆمانەو پیاوێکی خەراپ نیە.منیش کە دابەزیم ڕاست چوومە هوتێل تاران و داوای ژوورێکی تەنیام کرد.گوتیان نیمانەو گەرەک دوونەفەر بن. چار نەبوو، تازە هاتبووم و پێشم خۆش نەبوو یەکی دیکەم لە کن بێ.جانتایەکی دەستی و ساکێکی پچووکم پێ‌بوو بردیانە ژوورێکی دوونەفەری، چوومە سەرێ ریشم تاشی و خۆم گۆڕی‌و چوومەوەخوارێ لە کن حاجی خاوەن هوتێل دانیشتم، بانگی کرد چایەکیان بۆ هێنام.پاسپۆرتیان لێ وەرگرتم‌وناوی سەید ئەحمەدیان نووسی.خەریکی چاخواردنەوە بووم، لە پڕ کابرایەکی

دریژی بۆشناغ وەژوور کەوت، هەر منی بینی و ئامبازم بوو،: کاک کەریم بەخێرهاتی‌سەر چاوان و ... گوتم : کاکە ببوورە، کاک کەریم کێیە؟ رەنگە لێت تێکچووبێ، من کاک کەریم نیم.
- چۆن لێم تێکچوە.. من لە مەهاباد زیندانی بووم، برام هاتبوونە لای تۆ منت ئازادکرد.
کابرا دەستی هەڵنەدەگرت.گوتم من تۆ ناناسم. گوتی: ناوم عبدالحمیدە خەڵکی....لە ورمێ لە فرۆشگای ئەرتەشی کارم دەکرد، پێشمەرگە کرتیانم و تۆ لە مەهاباد ئازادت کردم. لێرە لە خزمە ت دام، ئێستا دەرۆم هێندێ پۆتین بۆ پێشمەرگان دەکرم، قەولم بەغەنی داوە.دوایە دێمەوە خزمەت و هەر وەختی ویستت پێکەوە دەرۆین.
کابرا رۆی. من لێی وەشک کەوتم. حاجی گوتی : تە نەکەریم حسامی؟ئەمیری قازی نەهاتەجەم تە؟ ئەمیر لەور بوو، گوتی : دەچمە سوفیا جەم کەریم حسامی. هیچ نەدەکرا. گوتم حاجی راستە. ئەمیر بەمنی گوت بێمە ئێرە. من نامەوی لێرە بمناسن و کەس بزانێ من لێرەم. ئەوا تووشی ئەو کابرایەش بووم کە نایناسم. حاجی گوتی: من دەیناسم، خەڵکی مەرگەوەڕەو مرۆڤێکی خەراب نیە. پاشان بانگی شاگردەکەی کرد، گوتی : دا هەرە جانتای سەید ئەحمەدێ بەرەفلان ژووری، کەسیترنەچێتەوێ.لەو کاتەدا زەلامێکی تر هات بەناوی عبداللە.لام وایە برا، یا خزمی حاجی‌بوو، دیار بوو بەسەر هوتێلیش ڕادە گەیشت . حاجی گوتی : ئەوە کەریمی حسامی‌یە.پاسپۆرتی بەناوێکی دیکەهەیە، بلا کەس نەزانی.
چووم لە ژوورەکە م راکشام و تاوێک حەسامەوە، هاتمەخوارێ. دەبینم دینۆی برای سەننناری مەمەدی و گرمانی‌برای موهەندیس جانگیرزادە لەوێ دانیشتوون.هاتنە پێش و بەخێر هێنان و گوتیان لە بەر تۆ هاتین،

بیستمان کە هاتوویە ئێرە.زۆری پێنەچوو، حیکمەتی کوڕی سەنناری پەیدابوو.دەستکرا بەباسی عەرش و قورش، هەرکەس چی پێخۆشە دەبیێژێ و دەیڕێژێ.من لە ترسی میتی تورکیا لە بەڵێ گوتن زیاتر هیچ نالێم. ڕۆژی ٢٨/١٠/٩٨٢ تەلەفوونم کرد بۆ جانگیراغا لە ئانکارا.گوتی تا من دێم لە وێبە و چاوە ڕوانم بە.لەو دووڕۆژە بۆم دەرکەوت کە هوتێل تاران مەکۆی ئەفسەرە ئێرانیەکانی ڕاکردووی شاپەرستە.لەوێ دەژین و لەوێ کۆ.دە بنەوە.

ڕۆژی دوایی عەولاخانی سمکۆ، کوڕی تاهیرخانی پەیدابوو. بۆ نانی نیوەڕۆ داوەتی کردم.پاشان وادەم لەگەڵ دانا کە بچم تاهیر خانی ببینم. لەکن عەولاخانی گەڕامەوە، دیتم کابرایەکی زەلامە لەگەڵ سێچوار کەسیتر دانیشتوە. لەگەڵ حاجی قسەماندەکرد، کابرا هاتە لامان و بەفارسیەکی خەست بەخێر هاتنی کردو. گوتی:« ئاغای حسامی، من ناوم مستەوفی(اتحادیە) ی دۆستی سەرهەنگ قادری خۆتانم و لێرەش نوێنەری ئاغای بەختیارم. ئێمە ١٠کەسمان لێ گیراوە، ناردوویاننەوە بۆ حەکاری و لە وانەیە بیاندەنەوە بەئێران. ئەگەر بدرێنەوە بەئێران ئیتر چارەنووسیان مەعلومە. خۆشبەختانە زانیمان کە لێرەی.هاتووم تکات لێ بکەم کە نامەیەکمان بۆ بنووسی بۆ جانگیراغای دەری کە یارمەتیمان بدا ، بەڵکوو نەدرێنەوە بەئێران. ئێمە لەو قسانەدابووین، جانگیراغا تەلەفونیکرد و گوتی: نەمتوانی بێم بۆ ئەستەمبوڵ، لە ئانکارا چاوەڕوانت دەبم.گوتم من جانگیراغا دەبینم دەسپێرم یارمەتیان بدا. زەلامێکی دیکە لەگەڵ کابرای بوو بە ناوی سەرهەنگ نازانم چی، گۆیا ئەفسەری گاردی شاهەنشاهی بوە، هاتە پێشێ گوتی: من کوردم و لە کوردەکانی قوچانم. بەخێر هاتنم کرد و دیتم کابرا گێرەی لە هەولێر دەگەڕێ.گوتی هەموو هێزەکانی دژی خومەینی ئەشێ هەول بدەن شابێنەوە، ئەسڵەن

ئێران بەبێ نیزامی پاشایەتی بۆ وێران کردن دەبێ.پاشان گوتی: « بڵێ بزانم قاسملو بۆچی ناچێتە کن بەختیار؟.»

گوتم جەناب سەرهەنگ وادیارە هەر لە سەر عەقلیەتی دەربار ماوی. بەختیار کێیە قاسملو بچێتە لای؟قاسملو سکرتێری حیزبێکە، گەورەترین هێزی بەکردە وەی دژی خومەینی‌یە.بەختیاریش ئەوە لە پاریس ولە بەغدا دەسوورێتەوەو نیوەشی لێرە سەرگەردان کردوە.اتحادیە گوتی : «راستە. حیزبی دیموکرات هێزە و ئێمە هێز نین.»

رۆژی ١/١١/٩٨٢ عبدالحمید پەیدا بوو،گوتی:بابرۆین. بلیتی ئوتوبوسم کریوە، شەو دەچینە ئەنکارا. هەستام چووم حیسابی هوتێل بدەم، گوتیان دراوە. ئێستاش نەمزانی عبدالحمید داویووی، یا حاجی گوتبووی وە ری مەگرن.لە ئەنکارا چووینە هوتێلێک، گوتی شە و لێرەدەبین. من تۆزێ کارم هەیە، دوایە دێمەوە، دەچینە دەرێ. عبدالحمید رۆی، منیش چوومە ماڵی جانگیراغا، چاییکم خواردەوە ونامەی نووسی بۆ خزمێکی خۆی بەناوی [مەحکوم)لە;گەوەڕ کە بەرێم بکات.هاتمەوە هوتێل دوشێکم گرت و نوستم. تازە خەوم لێدەکەوت،عبدالحمید وەژوور کەوت و گوتی کاک کەریم بابڕۆین، بلیتی ئوتوبوسم کریوە.

- قەرار نەبوو ئەم شەو لێرە بین، بۆ وا بەتاڵوکە؟

- بڕۆین باشترە،ماشین هەیە.

وای کردە تاڵوکە شتومەکی ریشتاشینم لە حەمامێ لە بیر چوو. وەدەر کەوتین و چووینە کاراژ، سوار بووین و پاش ٢٣سەعاتان گەیشتینە وان.لە رێگا گوتی:« راستی ئەوەیە من پسولەی ساختەو قاچاخ بۆ ئێرانیەکان ساز دەکەم.دەگەڵ پۆلیسی ئێرە رێک کەوتووم، لەگەڵ پێشمەرگەی خۆشمان پێوەندیم هەیە بە ئاگاداری پاسدارانیش دێم، لە خزمەت زیاتر زەرەرم بۆ کەس نیە.ئەو سەفەرەی.٢٥هەزار لیرەم دابوو،

پسولە بۆ چەند فیدایی وەر بگرم، پارەکەیان حاشا لێکردم و کەمی مابوو بەگرتنیشم بدەن. بۆیە نەمتوانی لە ئەنکارا گیر بم.. گەیشتینە (وان) چووینە هوتێل تەکین، پڕبوو لە ئێرانی ڕاکردوو، زۆربەیان ئەرتەشیبوون پاسپۆرتیان لە من وەرگرت و بردیانینە ژوورێک.

داوای پاسیان لە ونەکرد.عبدالحمید گوتی: من دەرۆم، سبەی دێمەوە دەرۆین.تا دەهات پتر لە عبدالحمید وەشک دەکەوتم کە بە گرتنم بدا. کە دەهاتمە خوارێ،دیتم یەکێک پاسپۆرتی منی بەدەستەوەیە، تەماشای دەکا.گەرامەوە بۆ ژوورەکەم.دوای تاوێک چوومە خوار داوای پاسپۆرتەکەم کرد، کابرا گوتی: سەرۆکی میت بوو لە تۆی دەپرسی و سەیری پاسەکەی کردو گوتی چکارەیە و لە چی دەگەڕێ، گوتومە تاجرە.لەو قسانەدا

بووم، حاجی خالیدی هەناره سلاوی کردو بەگەرمی چاک و خۆشی و بردمی بۆ دیوی خاوەن هوتێل، ئەویش شکاکی لای خۆمان بوو.چایان هێنا و بە حاجی خالیدم گوت: ناوێکی ترم هەیە، بانەزانن من کێم.هەر لە جێ بەکابرای خاوەن هوتێلی ناساندم.کابرا گوتی: خەم نیيە.نەیهێشت بچمەوەسەرێ، ناردی نانێکی باشیان هێناو تاکاتی خەوتن هەرلە لای وان دانیشتم.

عبدالحمید بەیانی پەیدابۆوە، گوتی بابڕۆین.چووم حیسابی هوتێل بدەم گوتی دراوە.رۆژی ٣/١١/٩٨٢ لە وان سوار بووین بۆ گەوەڕ.لە نیزیک گەوەڕ گوتی با دابەزین بچینە ئەم گوندە بەناوی(باژێڕ)ساک و جانتای منی هەڵگرت و چووینەگوندێ، ماڵە (عارفی).منی لە وێ دانا و گوتی وێ داناو گوتی من لەگەوەڕ کارێکم هەیە، تۆ لێرەبە دوای نیوەڕۆ دێمەوە دەرۆین. دیار بوو لەگەڵ عارف سەروسەودایێکی هەبوو.عارف خۆی لەماڵ نەبوو،ماڵێکی دەوڵەمەند و سەرئاواڵە وقەوغا دیاربوو.

دیوەخانێکی خاوێنی فەرشکراو.سێ‌چوارژنی خاوێن وکابان دەهاتن و دەچوون . زووسەماوەریان هێنا و چایان تێکرد و چام خواردەوە، گوتم دەمەوێ تاوێک بنووم. سە ربن و چارشێوێکی تەنکیان بۆ هێنام و خەوتم.کە هەستام، دووپیاوی تازەپێگەیشتوو دانیشتبوون، برای عارفی بوون. بەخێر هاتنیان کردمو هێندێ باس‌و خەبەرم لێ پرسین، بەداخەوە لە باسی پەز بەدە ر ئاگایان لە هیچیتر نەبوو.تا لای ئێوارێ چاوەڕوانبوم، عبدالحمید نەهاتەوە.بەپیاوەکانم گوت: تکایە یەکێکم بۆ پەیدا کەن ئەم نووسراوەیەم بۆ بەرێتە گەوەڕ، بیدا بەمە حکومی.نامەکەی جانگیراغام دایەو خۆشم شتێکم بۆ نووسی کەوا لە بازێر لە مالی عارفیم.نامەبەرێکرا ،ئێمەش لە ژوورێ خەریکی چا خواردنەوە بووین و چاوەڕوانی عبدالحمیدی.زۆری پێ‌نەچوو، دووجوامێر بەماشینێکەوە پەیدابوون، گوتیان مەحکوم ئێمەی ناردوە هەستەبابڕۆین. ساک و جانتایان هەلگرت و کەرتینەرێ بۆ گەوەر.گوتم باشە، هیچ پسولە، بەلگەیەکتان بۆ من هێناوە، چۆن دەرباز دەبین؟ یەکیان ناوی عبدالکەریم بوو، گوتی: هیچمان نەهێناوە. مەحکوم گوتوویە،سواری کەن بۆگوندی(بلۆکێ) .

گوتم کاکەمن بیانیم. کیملکی تورکیام نیە، چۆن لە سەیتەرە دەرباز دەبین؟.

عبدالکەریم گوتی: تۆ وەرەعارەبە بازۆ، لە تورکیا لە شۆفیری ناپرسن.

چوومە پشتی فەرمانو لەگەوەڕ لامان نەدا.و یەکسەر بەرەو سنووری ئێران.لەولای گەوەر عەسکەر وێستا بوون و دەیانپرسی. زیاد لە هەموان هات داوای کیملکی لە من کرد.عبدالکەریمی دەناسی. گوتی ئەوە خالمەو دەچینە مالی ناپزم. کابرا وازی نەهێنار کیملکی ویست. ناچار

پاسپۆرتم دایە، گوتی: تۆ بیانی، بالاْ وەرەخواریْ، بۆ سەربازخانە.هەوڵێکی زۆرمان لەگەڵدا، تەیبیست. عەسکەری تورک کە لە پاکەتەجگەرەیەک بەندە، .١هەزار و ١٥ هەزار لیرەماندایە، وەرینەگرت و پیی‌چەقاند بۆ سەرباز خانە.دوو عەسکەر وەپێش خۆیاندام، سەربازخانە کەمێک لە سەیتەرە دوور بوو، ترسم لیْ‌پەیدابوو، ئەگەر زیندانیم بکەن، دەمپشکنن.نامیلکە ی(مەسەلەی کورد لە پارلمانی سوید)م کردبوو بەکوردی و ماشینم کردبوو، لە بنەوە لە خۆم بەستبوو. ترسم هەبوو ئەگەر بیدۆزنەوە باسی سەرە.لە سەربازخانە ئەفسەری روکنی ٢ کە بە رپرسی ئەم کارەبوو، چوبوو فوتبالیْ بکا. لەویْ دایانـنام .هەستام چوومە توالێت و ویستم نامیلکە کە بدرێنم و بیخەمە دەستشۆری. پە شیمان بوومەوە و لەدلم نەبۆوە.هاتمەوەو دانیشتم.

لەولاشەوە کە من دەبەن بۆ سەربازخانە، کورەکان بەکیان دەچینەوە گەوەرو خەبەر دەدا بەمەحکومی کەگیراوم. یەکیشیان دوور ونیزیکی سەربازخانە، دەویستیْ وهەست رادەگریْ بزانیْ بۆکوێم دەبەن.مەحکومیش خێرا یەکێک دەنێریْ بۆ کن ناسری کوری جانگیراغای وخەبەری دەداتیْ کە گیراوم.

ئێواریْ درنگ، سەعات هەشت ئەفسەر هاتەوە.عەسکەر چوونە پێش و پاسپۆرتەکەیان دایە.منیش چوومە پێش. کەتەماشای پاسپۆرتی کرد، گوتی :« ئەوەتانْ بۆ هێناوە، پاسپۆرتی تەواوە.» گوتیان بۆ لای ئێران دەچوو.کابرا گوتی:« بۆکویْ دەچووی؟ »

خزمم لەو گوندانە بوو دەچووم سەریان بدەم

- نازا نی ئەم ناوچەیە بۆ بیانیان قەدەخەیە؟

- نەخێر نەمزانیوە .

- بگەرێوە بۆ ئەستەمبولْ.پاسپۆرتەکەی ویدامەوەو رۆیشت.

وەدەر کەوتین گوتیان دەبیٚبچینەوە کن بوزباشی. عبدالکەریم کە ئیمەی دیت، هات سواری کردین بۆ سەیتەرە.عەسکەرەکان گوتیان : گوتوویانە با بروا، بچیتەوە ئەستەمبولٚ. ئەمجار داوای پارەی دەکرد و دەیگوت هیچ نەبیٚ، هەزار لیرەم بدەنیٚ. هیچمان نەدایەو گەراینەوە.

لەو بەینەدا، ناسر کە خەبەری گرتنم دەزانیٚ، دەچێتە گورهانی ژاندارمەری سەر سنوور ، ناوی منی دەداتیٚ و دەلٚیٚ لەگەبەوەڕ گیراوە.ژاندارمەری داوا لە سەربازخانە دەکا کە ئازادم بکەن. ئەوانیش دەلٚێن: کەسی ئیرانی نەگیراوە، یەکی ئەفریقایی بوە ناردوومانەتەوە ئەستەمبولٚ.

ئیمە کە گەڕاینەوە تاریک داهاتبوو،بەپشتی سەربازخانەدا باماندا‌وە، چووینە گوندیک، لە بەر دەرکی مالٚیک ماشینی راگرت ، دووکەسی بانگکرد،جانتاو ساکیان هەلٚگرت و بەپێیان بەپشتی سەربازخانەدا لەولای سەیتەرە،چووینەوەسەر جادە و عبدالکەریمیش بەماشین بەجادە دا هات و گەیشتەوە ئیمە، ..٥لیرەم دا بەکورەکان و سوار بووم چووینە گوندی باسان. بەدرخانی برازای جانگیراغا گوتی ناسر وەدوای ئیوە کەوتوە. زۆری پێنەچوو ناسریش پە یدا بۆوە.سوار بوین چووینە گوندی (بلوکیٚ) مالٚی برایمی بابی مەحکومی.کە چووین عبدالحمید لەویٚ دانیشتبوو.کەئیمەی بینی، راست بۆوە،دەستی کردە ملم و دوو کەس لەویٚ بوون هەریێکەی ..٥ لیرە ی دانیٚ و گوتی ئەوە سە دەقەی ئەو بەلآیە بی کە لە سەرمان لاچوەو تۆ نەجاتیت هاتوە. ئەگەر گیرابای چووبامە عاسمان و هاتبامەوە، دەیانگوت من بەگرتنم داوی.

هەر ئەو شەوە ولآخیان ساز کردن و ناسری کوری جانگیراغا بەدوو چەکدارەوە لەگەلٚمان هات تا خانک کە بنکەی پێشمەرگەی لێبوو.چووین لەدەرگاماندا، بەزۆری راستمانکردنەوە. زۆریان بەسەرداهاتم کەوا

بێ‌کیشک و نۆبەدار نوستوون. ناسر گیرنەبوو گەڕایەوە.عبدالحمید رۆی، گوتی ئێستا دێمەوە.دوای تاریک هاتەوە، کیسەخەوێکی ئەفسەری زۆر شازی بۆهێنابووم. گوتی: بیووره،من دەبێ بڕۆم تاریکو روونی بەیانی بگەمەوە دەروازەی ورمێ، نۆرە کێشکی ئەو پاسدارانەدەبێ کە لەگەڵیان رێککەوتووم.هاتوو چۆی‌خۆم هەر دەکەم، بۆهەموو خزمەتێک ئامادەم.

عبدالحمید رۆی،منیش لە کیسەخەودا لێی نوستم تا بەیانی.رۆژی٤/١١/٩٨٢ولاخێکیان بۆهێنام و دووپێشمەرگەیان ڕەگەڵ خستم بۆ(گۆلی شێخان) لە ناوچەی برادۆست.نیوەرۆ میوانی برادەرا نی تەشکیلات و پێشمەرگەبووم.مەلای گوندی و چەند کەسیتر هاتنەلام، دانیشتنێکی خۆش و باسی وەزعی ناوچەو گلەیێکی زۆریان لە برای بە ڕپرسی تەشکیلاتی حیزبی هەبوو بەناوی(بۆزە)کەگۆیا لە خەڵکی دەداو حەبسیان دەکاو دەسبەندی قەپانی لێداون.دوای نیوە ڕۆ ولاخێکی سواریان هێنا و دووپێشمەرگە کەوتینەرێ بۆ گەڵی‌بەردەرەشی لەگوندی (بانی) لای کاک ئۆمەری قازی.کاتێک گەیشتینێ بەفر دەباری.کاک ئۆمەر سەری لە پەنجەرە هێنابوەدەرێ، تەماشای بەفری دەکرد.کە چاوی بەمن کەوت گوتی : «ئەی... ئەوانە ی لە ئوورووپا دێنەوە دەڵێن کاک‌کەریم ماڵوحاڵی هەیە، هیچیان راست ناکەن، ئەگەر هیچ رووناکاییت شک بردبایە،بەو زستانە ی نە دە هاتیە وە. ئاخر بەو بەفر و زستانە لە چی دەگەرێی؟.هاتەدەرێ و چاک و خۆشی و چوونە ژوورێ ودەستمانکرد بەقسەو باسی خۆمانەو یادی رۆژەکانی شەری سێ‌مانگە کە پێکەوە لە دەورووبەری مەهاباد مابووینەوە و رێبەرانی قەومیش لەحەوت بستوان ئاوابیوون.

رۆژی ٥/١١/٩٨٢نامەیێکم نووسی بۆکومیتەی ئەراپرت کە خە بەریدا بەدەفتەری سیاسی کەوا گەیشتومەوە (بانی).دوای چەند رۆژ

دەفتەر خەبەری نارد کە بچمەوە بۆدەفتەری سیاسی.

رۆژی ٨/١١/٩٨٢ کاک عەلی کاشفپورلە دە فتەری سیاسی دەکەڕاوە هاتەلای ئێمە.باسی شەڕەکانی‌لای میراوی و رێگای سەردەشت پیرانشاری بۆ گێڕاینەوە.هەر ئەو رۆژە دایکی رەحیم خەنی(ئەو پێشمەرگەی کەکاتی رۆژ[illegible]م لە شەڕی سۆما شەهید ببوو)هاتبوە بانی. نەمزانی بەو زستانە بۆچی لە شنۆیەڕا گەیوەتە گەڵی بەردەرەشی. لەگەڵ کاک ئومەر چووین سەری بدەین. پیرێژنێک بەناوی (حەلیم کەوا رەسمەکە ی لەم کتێبەدا دەبینری) سەرەخۆشیم لێکرد و بەخێر هاتنمان کرد، پورحەلیم گوتی :« ئێمە شانازی بەرەحیم دەکەین کە لە رێی حیزبدا کوژراوە. کوری من نە کوژ راوە، نەمردوە، ئەو هەر دەمێنێ. کوردستان ئازاد بێ،کورەکانی دیکەشم بەقوربانی بن».

١٤/١١/٩٨٢ ناسری کوری جانگیراغا پە یدا بوو.کەسێکی لەگەڵبوو بەناوی (چەکز)گۆیا لە بنەماڵەی گەیلانیزادە وخانەوادەی نەهری بوو. چەکز لە ئەمریکاوە هاتبوو، لەگەڵ فەرماندەی هێز و بەر پرسی تەشکیلات سرت وخورتی بوو. ئەوەی پاشان لە سرت و خورتی ئەوان و مەست و بۆچوونی خۆم بۆم دەرکەوت، چەکز هاتبوە توورکیا و چوو بوەعیراق و هاتبۆوە توورکیا و جانگیراغای دیبوو.لە عیراق چەکی بۆ جانگیراغا وەرگرتبوو، بەلام دەبوایە لە رێگای حیزبی دیموکراتەوە چە ک بگاتە جانگیراغا.( ئەوە هەست و بۆچوونی خۆمە و رک و راست هیچم دەستگیر نەبوو، ئەوەندە نەبێ نامەیەکی بۆ درکتور قاسملو نووسی، دای بە فەرماندەی هێز.کورێکی ژیر و وریا، لە سەر ئەو باوەڕە بوو کە :ئەمریکا زۆر لە حکومەتی خومەینی نارازی نیە.چونکە دەیەوێ هێزەکانی چەپ بەدەستی خومەینی لە بەین بەرێ، بەتایبەت سەبارەت بە لێدانی کومونیزم لە ئێران، دەیەوێ جارێ حکومەتی خومەینی بمێنێ.

لەو کاتەدا دەفتەری سیاسی خەبەریدابوو کە هێزی نحو بنێرێ هێندێ، چەک و قوزرخانە بۆ شیمال بەرێ. بەو زستانە لە بارەبەر زیاتر ڕێگای تر نەبوو.شانسی من دەمتوانی لەگەڵ ئە م کاروانە بگەمەوە دەفتەر.نیزیکەی ٢٠ بەرزە ولاخیان ساز کرد و پێشمەرگە و ئێوارەی ١٦/١١/٩٨٢ لە گوندی بانی‌یە وە کە وتینەرێ. بەفرێکی زۆر، سەرمایەکی بێ‌ڕەزاو سەیاقە. لەگوندی خانەگی لە بنکەی پێشمەرگە نانمان خوارد و شەو کەوتینەرێ.تادەهات سەرما هێرشی دەهێنا.گەیشتینە سەر جادەی ورمێ ـ مەرگەوەر،لە سەر بارگینی خۆم پێڕانەدە گیرا، دابەزیم لە سەر جادە دەستم کرد بەراکردن بەڵکوو تۆزێ گەرم بمەوە، بە لاّم فایدەی نەبوو، هەموو بەدەنم دەلەرزی.دیتم زۆر لە برادەران هاتوونەخوارو لەحاڵی مندان. بریاریاندا لەگوندی(دۆڵی‌پیسیان)لادەین و تۆزێ خۆگەرم کە ینەوە.منیان لەگەڵ دوو پێشمەرگە بردەماڵی (تەمۆ)ی.پێنج کەس لە ژوورێکی پچوکدا خەوتبوون. پیرە پیاوێکی ڕووخۆشی ڕەزا سوک لە جێدا کەوتبوو، دە یانگوت نەخۆشە.کوڕێکی دیکەی بەژن‌وماڵ لە دیوێکی دیکەدابوو.زۆر بەگورجی جێیان کۆکردنەوە، کورەیان تێهاویشت و گەرمیان داهێنا. من دەلەرزیم و ئارامم نەبوو. لە پەنا کورە ڕاکشام، لێفەیەکیان پێدادام.خێرا جایان سا ز کرد، نانیان دانا ،هەڵواو پە نیریان هەبوو.تۆزی هاتمەوەسەر خۆ، چایێکم خواردەوە، هەستام ڕەسمێکی ماڵەکەم گرت. دایکی کورەکان کە ژنێکی بەرێز و ڕەنگ ژن دیاربوو،گوتی: « ئەی بەقوربانت بم، جانەوە نەخۆشە وادەکا، ساخ بوویایە چیدەکر د!!»

لەگەڵ خاوەن ماڵەکە دەستم کرد بەقسان وراستم کردەوە.حەبێکم دایە،گوتم متفەڕکە چاک دەبیەوە. کوری خاوەن ماڵەکە گوتی لام وایە تۆ لە لاقانڕا سەرمات دەبێ، با جووتە گۆرەویەکت بۆ بێنم.گۆرەوی هێنا ،

بەکەیفێم نەبوون. گوتم: زۆر سوپاس، نامەوێن.زۆری هەوڵدا، گوتم کاکی خۆم گۆرەویەکان جوان نین، دەپێیان ناکەم.دایکی گوتی:« تۆ ئەوە سەرما دەتبا،لەجوانی دەگەرێی».دابچوو لە بەغدانەکەی من جووتە گۆرەویەکی بۆ بێنە.گۆرەوی هێنان،تەنک، نەرم، جوان چنراو، لاسکیان بە کاموایەکی سەوز شکاکی چنرابوو.گوتم گەلێک سوپاس، دەڵێی گۆرەوی سەیدانن.کورەکەگوتی: دایکم سەیدە.گوتم لە بەر خاتری دایکت دەپێیان دەکەم. گەلێک پێکەنین، دەبوایەبڕۆین ولەو پەنا جادەیە مانەوەمان نەدەکرا. پێشمەرگە وەکۆبوون،سەعاتی دووی دوای نیوەشەو کەوتینەرێ.بەفرێکی زۆر، سەر مای دوای نیوەشەو، تاریک، رێگایەکی هەوراز ونەدیار.لای بەیانی بە نارەحەتی گەیشتینە گوندی(کشپیلە).پێشمەرگە بلاو بوون، منیان لەگەڵ دووبرادەر بردەماڵی عەلی.کەمێک شەوی مابوو، رابوون، دیوەخانێکی قەرشکراوی خاوێن، کورەیان تێهاویشت و گەرم داهات. سەماوەریان هێنا،نان وپەنیریان دانا، گەلێک رووخۆش و میهرەبان. دوای چاخواردنەوە، جێیان ڕاخست و من خەوتم.بەیانی درەنگ هەستام، ژنەکە سەماوەرونانی هێنا و هەر خۆی ئەو کارانەی دەکرد و هیچ پیاو دیارنەبوون.ئاخرەکەی پرسیم :«ئەدی کوا، کاک عەلی دیار نیە؟».گوتی:« بەیانی زوو لەترسان رەویە، چۆتە ورمێ.مرۆڤایەتی نەماوە، مرۆڤێ گوندی گەلێک رەوینە». بۆ فراوینێ، نانێکی باشی ساز کردبوو.گوتی بنێرە هاڤاڵی تە بێن لێرە نان بخۆن. ناردم چوارپێنج برادەری دیکەش هاتن، کاتی رۆیشتن نردوێک نان و پەنیری پێچایەوە و بەدوعا وپارانەوە بەرێیکردین.

دوای نیوەرۆ بەرووناکی کەوتینەرێ. بەفرێکی زۆر وڕێی نەشکاو، بەزەحمەت بە دیوی (گەزنەکێش)دا سەرکەوتین. تازەتاریک دادەهات گەیشتینە گوندی و چووینە ماڵ (ئەمینی)ئامۆزای حەمەدەمین

چیچۆی.ئەمین کاتی خۆی هاتبوە مەهاباد و یەکترمان ناسی.گەلێکی بەخێر هێناین و نەیهێشت پێشمەرگەکان بلاو بن .مەلای گوندیش کەبەرپرسی رێکخراوی حیزبی بوو، بەخۆو کومیتەیەوە پەیدابوو.مەلاشم ناسیەوە، فەقیێ بوو تازە ببوە مەلا.دانیشتنیکی ئەوەندە خۆش و دۆستانەبوو، هیلاکی رێگای لە بیر بردبوومەوە.لە بەرانبەر فیداکاری و دڵسۆزی ئەو خەڵکە نیشتمانپەروەرەدا، هیلاکی رێگاو شەکەتی سیفری رووتە.

دوای نانخواردن و حەسانەوە، چاوساخیان رەگەڵ خستین بۆ سەر چەمی باراندوز، دەبوایە بێ بوار، بەلارێدا لە چەمی وەپەڕین.دوای نیوەشەو گەیشتینە گوندی کانیسپی حەسارێ.پێشمەرگەی هێزی نحۆ شارەزابوون، چووینە ماڵی برای زیرۆبەگی هەرکی.درنگ لە خەوێ رابوو، وەپێشمانکەوت بۆ دیوەخانێ،کە مێک دوورتر لە ژووری نوستن. نەیهێشت بلاو بین، ولاخەکانیان تاقەت کردو هەموو لە دیوەخانێ کۆبووینەوە. بەو شەوە ی سەماوەریان هێنا و میواندارییەکی پیاوانەیان کرد.بریاریاندا کە رۆژێک لەوێ بمێنینەوە و بحەسێینەوە. هێندێ لە کورەکان دۆست و ناسیاریان هەبوون، بلاو بوون.لای چێشتانێ، مەلاحەمەدەمینی مەلای گوندی پە یدابوو.پیاوێکی خوێندەوار و تێگەیشتو ونیشتمانپەروەر. دەیگوت لە سولەیمانی لە خز مەت مامۆستا مەلا محەمدی شەڵماشی دەرسمان دەخوێند، دەمانزانی تۆ دێیە لای مامۆستا ،جارێک بریارماندا بیینە لات، تاهاتین رۆیشتبووی. مامۆستا بۆ فراوین داوەتی کردم.یەک لەو مەلایانەبوو کە مرۆ لە خزمەتیدا نەک هەر وەڕەز نەدەبوو، بەڵکوو حەزیشی دەکرد.

ئێوارێ کۆ بووینەوە تەگبیر لە رێگا بکەین. لە بەر بەفری زۆر بەلارێیاندا دەرچوون نەدەکرا.دەبوایە بەگەڵی قاسملوودا، بەسەر جادەی

ورمێ ـ شنۆدا بڕۆین و تا دەگەینەماڵی حاجی محمدی چپانێ لانەدەین.لەگەڵی قاسملو زۆر بەخێرایی تێپەڕین، جادە بەفری لێ نەبوو،نیوەشەو گەیشتینە گوندی حاجی محمدی چپانێ. گوندەکە وەچۆڵان دەچوو. بێجگە لەماڵی حاجی کەسێتری تێدا نەبوو. حاجی محمدیش خۆی گیرابوو.چووینە بەر دەرگا، دوودەروازەی گەورە، هەرچەندی لە دەرگا دەدەین ،کەس جواب ناداتە وە و دەنگ نیە.ئاخرەکەی من بەتوندی گوتم ئێرە وێرانە،کەس جواب ناداتەوە؟

کوری حاجی لە،ژوورێ بانگی کرد و گوتی: ئەرێ ئەوە کەریمی حسامی نیە؟

ـ راست خۆیەتی، بەلاّم دەرگای لێ ناکەنەوە.

دەرگای کردەوەو هاتەدەرێ، گوتی: « داوای لێ بووردن دەکەم. لە وە تی بابم گیراوە، بەشەو یا بەرۆژ پاسدار بەسەرمان وەر دەبن و دەست دەکەن بەماڵ پشکنین.بۆیە بەشەو ناوێرین دەرگا بکەینەوە. »

بەگورجی وڵاخیان بردنەژوورێ، تفاقیان دانێ،خۆشمان لە سالۆنێکی گەورەی فەرشکراو دانیشتین و سەماوەر و نان زۆر زوو ساز کران.کەوتینە راوتەگبیران چبکەین.؟! مانەوەمان لەو گوندە مەترسی هەیە، دەڕۆین دەبێتەرۆژ و دیسان خەتەرە. کوری حاجی گوتی ئێرە ماڵی خۆتانە، بەلاّم کەم رۆژ هەیە کە لە کانی سپیەوە، پاسدار و جاش نەیەنە ئێرە. قەت لەخۆمان ئەمین نین.دوای گۆرینەوەی بیرورا بریارماندا بڕۆین. بەو شەرتەی بکەوینە سەر تیرەگە شاخی نێوان دووریەی دەشتەبێل و دۆلێ .

تاریکو روونی بەیان کەوتینەرێ.بەفر زۆربوو، ئەوانەی شارەزابوون، وەپێش دەکەوتن و جاریوابوو رێیان ون دەکرد. تازەتاو لە سەرانی دەدا، لەدەشتەبێل نەدیو بووین.لە دۆلێکی هەتاو گرتوو،راوەستاین جۆیان دابە

ولاٌخان و لە سەر بەفریٚ گۆیا بحەسێینەوە.من تافمی تراشم هێنا دەر و دەستم کرد بەریشتاشین.دوای حەسانەوەی ولاٌخەکان کەوتینەریٚ. یەک دووجار حاسیەدەبووین و دەگەڕاینەوە. بەزەحمەت کەوتینە سەر تیرەگەشاخی پشتی دووریەی کە بارنی کردبوو بەفری لیٚ نەمابوو.ولاٌخەکان رادەکێشران، هێندیٚ جار دەکەوتینە دیوی دووریەو بنکەی ئەرتەش و پاسداران دیار دەبوو.گورج ئاوای ئەم دیوە دەبووینەوە کە هەلٌدێر بوو. لە سەر ئەو تیرەگە شاخە لە پڕ بارگینێکی زۆر چاک و بەکار وەعەرزی کەوت و تا دەورەماندا بزانین چیەتی، بوو بەسەدەقەی سەری برادەران و پشووی لیبڕا. سەرجلەکەی ئەویش بوو بەسەر بارێک و جەنازەمان بەجیهێشت.لای نیوەرۆیە، بەدیوی حەلٌبیٚ دا کەوتین، بەر رۆژ و رەش وهەتاوێکی گەرم.داگەڕاینەخواریٚ،لە داوێنی چیا کانیەکی خۆشی جوان بوو بە مەکۆی دانیشتن و حەسانەوەمان. لە بەر تاویٚ هەرکەس لە جێیک لێی تخێلٌ بوو.زۆری پیٚنەچوو دووشوان مەریان هێنا سەر کانی. بەیەکیانم گوت :دەبیٚ بچیەوە گوندی، نامەیەکت دەدەمیٚ.بیبەی، لەو سەری تیٚرێک جۆ بۆ ولاٌخەکان بێنی. زووش بگەرێیەوە.شوانی کورد پیاوانە ئامادەیٚ خۆی راگەیاند. شوانیەکەی تر ئاگری کردەوەو دەستیکرد بە چا لێنان. نامەیەکم نووسی بۆ ئامۆزاکەم کە بە مەسئولی حیزبی رابگەیێنیٚ، نان و جێشتی ٢٠ کەسی بە هێریاندا بنێریٚ و بەو شوانەشدا تیٚرێک جۆ بنێرن. شوان سواری کەرێبوو، دەتگوت دولٌدولٌی ئیمامی عەلیە.بۆچی من نامەم نووسی و خۆم کردە ڕیشسپیٚ؟ لە تەشکیلاتی ورمیٚ هەتیوێکیان کردە بەر پرسی برادەران بەناوی داود. هەتیوێکی زۆر بلٌیٚ، کاتی خۆی کاک جەلیلی گادانی دیتبوویەوە و کرابوو بەئەندامی کومیتەی شارستان و ئەندامی دەستەی راپەڕاندنیش.دوابەش کیژێکی هەلٌگرتوو خۆی تەحویلداوە. لە رێگا

لەگەڵ داودی بەشەڕ هاتن و کەمی مابوو بیکوژن.ئیتر کەس جوابی نەدەداوە. ئەوانیتر پێشمەرگەی هێزی ئحزی بوون و لەم لایە کەسیان نەدەناسی. بەناچاری ریشپیەتیان بەستۆی مندا بریبوو.

زۆری پێ‌نەچوو شوان بەتێڕێک جۆوەیەیدا بۆوە.توورەکەیان وەسەر وڵاخان خست و بەدوای واندا چوار شێرەکچی(شەنگەبێری)بە کوڵەنان و قابڵەمە چێشتی گۆشت و برنجەوە پەیدابوون. بێریانە ئاگریان کردەوەو چێشتیان گەرم کردەوەو دەستکرا بەخواردن و بوو بەسەیرانێکی خۆش.دوای نیوەرۆ درنگ ئەوان گەرانەوە، ئیمەش تاریک داهات، چووینە گوندی، دەبوایە ئەو رۆژە لە حەڵب و کۆیکان بمێنینەوە. بە یانی کوڕی ئاموزاکەم ناردە نەغەدە هێندێ شتی پێویستی بۆ کڕیم و هاتەوە.

ئێوارەی ٩٨٢/١١/٢١ لە حەڵبیێ کەوتینەرێ، بەکاموس و پێبەجگدا ، لاڕێ تێ‌هەڵبووین بۆ ئاڵیاوێ.

لە بانی کاک ئۆمەر کوڕێکی مەهابادی ناسیاری خۆی لەگەڵ ناردمەوە کە لە سندوس بینێرمەوە نەغەدەو بچێتەوە مەهاباد.نەگەیشتبووینە گوندی پێ‌بەجگ، لە جۆگەی چیانەی بەو شەوی تاریک و سارد دەئاوێ کەوت و هەموو لەشی تەڕ بوو.ئیتر ڕۆیشتنی نەدەکرا.ئاشناو دۆستێکی کۆنم لەگوندی پێ‌بەجگ هەبوو، لامداو لە خە وم هەستاندن، قەمسەلەیەکی زۆر جوانم لەتورکیا کڕیبوو، دامێ دەبە رێکرد و بە ماڵە برادەرەکەم گوت، جلەکانی بۆ وشک کەنەوەو بیبەنە نەغەدەو بینێرنەوە مەهاباد.باشبوو کوڕ گەیشتبۆوە مەهاباد و دوای سێ‌مانگ قەمسەلەکەی بۆ ناردبوومەوە .

لە ئاڵیاوێ لاماندا، ویستمان بپرسین داخوا بنکە ی پاسداران لە قارنێ هەیە یان نا. ؟گوتیان لە قارنێ نەماون، بەڵام بنکەیان بردۆتە گوندی گەڵوانێ. رۆیشتین لە پەنا قارنێ پێشمەرگە راوەستان، من لە

گەڵ دوو پێشمەرگە چوومە نێو گوندی ماڵە محێدین سەکری، کادرێکی حیزبی بوو.لە دەرگام دا کەدە نگی ناسیم، پیاوانە دەرکەوت و گوتم گیر نابین، پێشمەرگەم لەگەڵن ودەبێ تێپەرین.چوو دووبرادەری هێنان وەپێشمان کەوتن تا لەگوندی گەڵوانیان تێپەراندین و بەدۆڵی پشتی گەڵوانێدا تێهەڵبووین.کە بەنێو گوندیدا رت دەبووین، بوو بەچەقولوری سەیان، پاسداریش کردیان بەتەقە، ئێمە دوور کەوتبووینەوە، کە سەگێک دەوەری، ئەوانیش تەقەیان دەکرد.پاش ١٢سەعات رێگا برین، بەسەر گوندی شاوەلەدا شۆر بووینەوەو چووینە بنکە ی پێشمەرگە،جەعفەری بایزیدی سەر لق و بەر پرسیان بوو.کورێکی ژیر و تێگەیشتوو،پێشمەرگەخۆشیان دەویست. لە وێ ئیتر من لە کاروان هەڵبڕام.ئەوانیان دامەزراند، جەعفەر نەیهێشت بچمە هیچ کوێ، لە ماڵی ئەوان مامەوە.رۆژانە دەچوومە نێو پێشمەرگەکان و یا ئەوان دەهاتنەلای من.جاروبار دەچوومە مزگەوت،چەند برادەری تە شکیلاتی نەغەدە لە شاوەلێ بوون جاروبار دەهاتنەلام و کاک عومەر کاشان یەک دووجار داوەتێکی کوردانەی کردین.

لە نێو خەڵک و نێو پێشمەرگە، ئەگەربەدڵسۆزت بزانن،فێری زۆر شت دەبی و ئەزموونی بەنرخت دێنە دەست و دەتوانی ئەگەر بتەوێ دەرسیان لێ وەر بگری.ئەم خەڵکە نەخوێندەوار و سادەو رەمەکی و فیداکارە، چەندە 'مامۆستایەکی ژیر وزانای ژیانی واقیعی کۆمەڵایەتین نێو کۆمەڵانی خەڵک وتێکەڵی لەگەڵ ئەم خەڵکەگیاتفیدایە' و ( زۆرجار فریودراوەو وفریوخواردوە ) مەدرەسەیەکی گەورەی ژیانی سیاسی و کۆمەڵایەتیە.لەو سەفەرەدا ل رادەبەدەر لە کەلێن وقوژبنی هەڵسوکەوت وسرت وخورت وباس و دمەتەقەی خەڵک و برادە رانی حیزبی رپێشمەرگە، لەزۆرشت ئاگاداربووم‌کە نەدە زانراوباسی نەدەکرا.

دوای چەند رۆژ میرزا مەحمود هات و بردمیە مالی خۆیان، مالە میرزامەحمودی وەک خانەقا هەمیشە پڕبوو.خەڵکی گوندی داوایان کرد کە لە مزگەوت لە سەر بارودۆخی سیاسی ولآت و بزووتنەوە ی کوردو دەوری هێزەسیاسیەکانی کوردستان قسەبکەم. ئەمە لەلایەک، لەلایەکی تر مەلاعەولاْ گوتبووی نابێ بەناوی حیزب قسەبکەی . چونکە بەرگی وتاردان و ئاخافتن و دەربڕینی بیرورا لە حیزبی دیموکراتدا هەر بەبەژن وبالأی ئەندامانی دەفتەری سیاسی بڕابوو، کەسیتر هەقی نەبور لە نێو خلْکدا باسی سیاسەت بکا.

ئەندامانی کومیتەی ناوەندی وبەر پرسی تەشکیلاتەکانیش لە بەر راپەراندنی کاروباری ئیداری لەگوێن خکومەت، بەوەی رانەدەگەیشتن بچنە نێو خەلک و روونیان کەنەوە. من ویستی خەڵکم پێ لە فەرمانی وشکی بێتام پێ گرنگتر بوو، پاشانیش خەلک داوای لێکردبووم، نەک حیزب.

رۆژی ٩٨٢/١١/٢٧لە مزگەوتی شاوەلێ کە پربوو لە خەڵک و پێشتر رایانگەیاندبوو،.لە سەر سیاسەتي غەیرەئینسانی و غەیرەئیسلامي حکومەتی ئێران و ئەرکی خەڵک لە بەرابەر سیاسەتی رێژیمدا و یارمەتی بە هێزی پێشمەرگەو بەحیزب و بەکەسوکاری شەهیدان و بە پوچەلْکردنەوەی تەبلیغاتی رێژیم،بەدرێژی قسەم کرد و پێشوازیەکی گەرم لەقسەکانم کرا.

رۆژی ٩٨٢/١١/٢٩ لەگەلْ عومەرکاشانی و کوری حاجي چووینە کانی بداغ و لە وێوە لەگەلْ مراد کرمانجی شەهید چووینە گە رگولی خواری.

٩٨٢/١٢/١ کادرەکانی ناوچەی شنۆ داوایان کرد دانیشتنێکمان هەبێ و لە سەر دەنگدانەوەی بزووتنەوەی کورد لە دەرەوە، باسیان بۆ

بکەم. پرسیارێکی زۆریان کرد و بەگوێرەی تواناو کە زیانیشی بۆ پەزی، نەبێ وەلامم دانەوە. دانیشتنێکی گەلێک خۆش و بەکەلک بوو.رۆژی دوایی پێشمەرگەیەکمان نارده گوندی شێلمجاران، لیباسەکانم لە ماڵە سەرهەنگ قادری بۆ بێنێتەوە. پێشمەرگە بەدەستی بەتاڵ گەڕایەوە،چونکە لیباسەکانی منیش وەک شتومەکی خۆیان لەگەڵ دەی مەنگوڕان بە جێ مابوون و ئێستاش نەمزانی چی‌یان بەسەر هات. بەفر دەرەتانی سەفەری بڕیبوو، لە ماڵی کاک رسێن کرمانجی مامەوە. بێجگە لە خزمەت و میوانداری و رووخۆشی گەورەو پچوکی‌ئەو ماڵە ، بوونی کاک مراد ورەفاقەت و هاو بیری ئەو،خانە گیری کردبووم. رۆژی٢/١٢/٩٨٢ لە سەر بنچینەی بیستن وبینینەکانی ئەو سەفەرم، ئەم نامەیەم بۆ دەفتەری سیاسی نووسی کە وا لێرەشدا بلاو دەکرێتەوە.

دەقی نامەکە:« بەرێز دەفتەری سیاسی ح.د.ک.ا.سلاوێکی برایانە.هیوادارم بەسەر تەنگوچەڵەمەکانی رۆژدا سەرکەون.لەگەڕانەوەمدا لەکاری تەشکیلاتی و پێشمەرگەدا هێندی کەموکوڕی و ناتەواریم هاتەبەر چاو کە چارە سەا!ر نە کردنیان بۆ بزووتنەوە زیانێکی زۆری دەبێ، بۆیە بەپێویستم زانی بیروڕای خزمتان پێڕابگەیێنم.هیوادارم بۆ چارەسەر کردنیان هە نگاوی جیددی باوێژن.

١ـ شیمالی کوردستان وە ک لە خەودابێ وایە.لە کاتێکدا دوژمن هە موو هێزو فشاری خستۆتەسەر ئەملابە، شیماڵ دەستی لە سەر دەست داناوەو چاوەڕوانە ئەگەر دوژمن پەلاماریان بدا، ئەوانیش تەقەیەک بکەن و ئەگەر زۆریشیان بۆ هات بکشێنەوە و دوژمن لە جێگای ئەوان پێگەدامەزرێنێ.بەشێکی زۆری ناوچەی برادۆست بەم شێوەیە گیراوەتەوە.بەنەزەری من شەری قورس و بەربەرەکانی پێویستە بخرێتە ناوچەی شیمال، بەتایبەت ناوچەی عەجەم تشین.چونکە ئەگەر بەراستی

لەو ناوچەیە شەر بکرێ،دێهاتی عەجەمان دەکەوێتە بەر پەلامار، ئەوەدەم ئەوان فشار بۆ ڕێژیم دێنن ودەیکەنە هەراو دەربڕینی بێزاری لە شەڕی داسەپاو.نەتیجەی تاکتیکی شەڕێ غەڵەتی ئێمە وای لێهاتوە کە دێهاتی عەجەمان بەئاسوودەیی بژوون و کوردستانی ئێمەش وێران و خەڵکەکەشمان ئاوارەو دەربەدەربێ.پێویستە شیماڵ لەو ماتوو بێدەنگیە بێتەدەر وشەڕ بخرێتە مەڵبەندی عەجەمان.

٢ـ مەسەلەی بەرێکردنی ئە فسەرو عەجەمی هەلاتوو، بەقاچاخی شیمالی گرتۆتەوەو لەتام چۆتەدەر.باندی خەڵک بەرێکردن بەشێوەی مافیا تەنانەت هێندێ وردەرێکخراوی سیاسیشی گرتۆتەوە.جارویاریش ئەگەر بە ١٠هەزار تمەنیک چاوی بەرپرسەکانی حیزب بنووسێنن و یا پێشمەرگە بەقاچاخی پاشقولیان بداو بەرێیان کا . لە کاتێکا لام وایە ئەم مەسەلەیە پێویستە لەلایەن هێزەکانی حیزبەوە کونترۆڵ بکرێ و دەتوانن لە باری سیاسیەوە کەلکی لێ وەرگرن.خۆئەگەر نەشکرێ پێشی ئەم جەرەیانە بگیرێ، یا حیزب ئیستفادەی ماددی لێ بکاو داهاتێکی بەرچاوی لێ دەست دەکەوێ.

٣ـ ئەوەی بۆم دەرکەوت و لە نێو کادر وئەندامانیدا باسی دەکرا، لە ناوچەی شیماڵ، بەتایبەت لە سۆماو برادۆست، تەشکیلاتی حیزبی نیەو ئەوەی ئەم نێوەشی لە سەرە، تەنیا کاری ئیداری شکایەت و سزادان وخەڵک بێزار کردن بەرێوە دەبات.وەزعی هێزی نحو زۆر شپرزەیە. کارم بەوەی نیە کە لە دوورەوە چۆن گوزاریشتان بۆ دەنووسن.بەدەیان پێشمەرگە بۆ حەوتوونک دەچنە مەرەخەستی و بە درو مانگ نایەنەوە.بەدەیان پێشمەرگە لەمەقەرەکان بێکار، بێ فێرکردن و خوێندن، کەوتوونەوە، تەنانەت ئاوردووش بۆ خۆیان ناهێنن.لە ڕێگادا،لە چەند گوندان خەڵک و تەنانەت کادری تەشکیلاتیش هاواریان بوو کە

پێشمەرگە بەخۆرایی لەگوندان دەسووڕێنەوە.نموونەی زەبتوڕەبت هێزی نحۆ ئەو کاروانەیە کە بۆ بردنی چەک و تەقەمەنی هاتوە.لە ڕێگا چەند جار خەریکبوون بەتفەنگ لێک بدەنو کەس جوابی مەسئولی نەدەداوە.

٤- وەزعی تەشکیلاتی حیزبی لە ڕێکخراوی شنۆیەش زۆر تەواو نیە.لام وایە دەبێ پتر گرنگی بە کار و تێکۆشانی تەشکیلاتی بدرێ.

٥ـ وەک برادەرانی کادری تەشکیلاتی نەغەدە وچەندکەسی دۆستی حیزب باسیان دەکرد،وەزعی تەشکیلاتی نەغەدەش تەعریفێکی نیە.هەموویان لایان وابوو لە هەر شوێنێ پێشمەرگە نەبێ، تەشکیلاتی حیزبیش نیە.بۆ نموونە باسی مانگی هێرش و دیفاع دەکرا.لەو مانگەدا تەشکیلات لە باری تەبلیغات و هاندانەوە یەک هەنگاوی تاویشتوە.مەسئولەکان نەچوونە گوندەکان و خەڵکیان روون نەکردۆتەوە.ئەوەخۆی وریایی خەڵک و دراکەوتوویی تەشکیلاتی حیزب دەگەیێنێ، چونکە ئەگەر ڕێبەرایەتی حیزب مەسەلەیەکی موشەخەس دەکاتە ئەرکی ڕۆژی تێکۆشانی حیزبی، پێویستە هەمو بەدەنەی حیزب کار ی جیددی لە سەر بکەن.بۆیە بەپێویستی دەزانم لەم وەزعە ناسکەدا یەک دوو ئەندامی دەفتەری سیاسی لە ناوچەکانی کوردستان بسووڕێنەوەو قسە بۆ خەڵک بکەن و مەترسی سە قامگرتوویی دەسەلاتی ڕژیم بۆ کۆمەلانی خەڵک روون کەنەوە.مەلاکان دەبوایە ئەم ئە رکە بەجێ بگەیێنن، بەلام زۆربەی مەلاکانی کوردستان بەداخەوە لە بێلایەنی و خۆ ماتکردندا ن و لە ئاست چارەنووسی نەتەوەکەیان بێ مویالاتن. تۆ بڵێی حیزب لەم بارەبەشدا کەمکاری نەکردبێ؟.جا ئەگەرمەلاکان نایکەن وتەشکیلاتەکانی حیزبیش هیچیان دەباراندا نیە، با ئەندامانی دەفتەری سیاسی ماوەیەک وازلە ئەمرونەهی بێنن ولە نێوخەڵکدا بسووڕێنەوە.

٦ ـ خەبەری پەرینەوەی دەفتەری سیاسی وچۆلکردنی ئەوبەرە زۆری

نیگەران کردم.لام وایە دەکرا ئەم زستانە برادەرانی دەفتەرلە ناوچەی لاجان وسندوس لە نێو خەڵکدا بمێننەوە.ئەم دوور کەوتنەوە بۆتە هۆی کزبوونی روحیەی خەڵک وبۆ هەڵسوڕانی کاروباری حیزبیش تەنگوچەڵەمەی پێکهێناوە.من لام وایە ئەگەر رێبەرانی حیزب بتوانن بەباشی وەلامدەری رووداوەکان بن، هێزی ئەساسی ولەبن نەهاتووی خەڵک و پێشمەرگە هەرماوە.تەنیا دەبێ سەرپەرشتی جیددی بکرێ و تە نیا بەوەرگرتنی چەند راپۆرتی ناراست سەرینی خاترجەمی لە بن سەری نەنێن.لەم سەفەرەبۆم دەرکەوتوە کە راپۆرتەکان زۆریان تەواو نین و تەنانەت ئەو خەبەرانەی بۆ رادیۆش دەنێردرێن، زۆریان راست نین و بلاویش دەکرێنەوە.لەم بوارەدا پێویستە دیقەت بکرێ وپرستیژی رادیۆ نەیەتەخواری.

لە سەر رووناکایی ئەم نووسراوەیە و دیتن‌و بیستنی رووداوەکان ئەم چەند پێشنیارەی خوارەوەتان پێشکێش دەکەم.:

١- بەناردنی چەند کەس لە ئەندامانی رێبە رایەتی وەزعی شیمال لەم وەستان و ناهومێدی و دەست لەسەردەست دانانە، بێننەدەری وبیان بزوێن وقورسایی شەر بخەنە شیمال وبەتایبەت ناوچەی عە جە مستان

٢- سەبارەت بەدیسیپلین و زەبت ورەبتی پێشمەرگەهەنگاوێکی جیددی باوێژۆری‌رێنیشی بەرەلایی‌وسووڕانەوەی بێ جێ بەتوندی بگیرێ.

تەشکیلاتی حیزبی لە جیاتی کاری ئیداری وکوێخایەتی با خەریکی رێکخستن و پتەوکردنی ریزەکانی حیزب و پەروەردە ی سیاسی ئەندامان بێ و با کاری شکایەت و کێشەی خەڵک بەشوراکان بسپێرن.

٣- ئەفرادی لێزان وناسراو دیاری بکەن لە مزگەوتەکان تەبلیغات بکەن و خەڵک لە سەر سیاسەتی حیزب و درندەیێ حکومەت روونکەنەوە.تەنیا تەکیە لە سەر رادیۆ بۆ تەبلیغات وەلامدەری هەلومەرجی ئەمرۆی

بزووتنەوە نیە.

٤- پێشمەرگە لە سەرانسەری کوردستان لە حاڵەتی دیفاع و چاوەدێری هێرشی دوژمن بێتەدەر ڕیکەوێتە حاڵەتی پەلامار دان و لێدان و ماندوو کردنی دوژمن و تاکتیکی شەڕی پارتیزانی بەتەواوی ڕەچاو بکرێ.

٥- وەزعی هێزی بەرگری ڕێکوپێکتر بکرێ.واتە با گرانایی بەرگری و کێشک و چوونە جەبهەو شەونخوونی هەر لە سەر شانی فەقیروهەژاران نەبێ.گوندیی واهەیە ٤٠ .. ٥٠ماڵە، تەنیا سێ چوار کەسی فەقیر ونەدار ونیشتمانپەروەر لە بەرگریدان.دەولەمەند و مەڕدارەکان لەخەو وئیستراحەت دان وتەنانەت تفە نگیش ناکڕن و یارمەتی فەقیرەکەش نادەن.بۆ کابرای مەڕدار پاسدار و حیزب فەرقی نیە.لام وایە دەبێ هێزی بەرگری لە ڕێگای کرینی چەک بە دەوڵەمەندەکان و یارمەتی بە فەقیرەکانی هێزی بەرگری و یا هێنانی هەتیوی مەڕدارەکان بۆ بەرگری، بەهێز بکرێ.با تەشکیلاتەکانی حیزب دەست لە دەوڵە مەند پارێزی هەڵبگرن.

٦- بۆم دەرکەوت زۆر ئەندامی لێهاتووی حیزب، لە بەر هێندێ هۆی هەق یاناهەق دانیشتوون.حیزبی ئێمە لەم هەلومەرجە ناسکەدا،پێویستی بە هەموو کەسێکی نیشتمانپەروەر هەیە کە بڕوای بەسیاسەت و ڕێبازی حیزب هەبێ.لام وایە پێویستە دەفتەری سیاسی بەرابەردووی تێکۆشان وهۆی دانیشتنی ئەوانەدا بچێتەوەو بانگیان کاتەوە.

بەکورتی بەگەڕانی ناوچەکان و چوونی نێو خەڵک و نیزیکی لەکادر و پێشمەرگە،گەلێک کەموکوڕی دەبینرێن وبە سە رنجدان و تێکۆشانی ڕێبەرایەتیش چاریان دەکرێ.

لە بارەی خۆمەوە ئێستا گەیشتوومەوە لاجان و بەفری زۆر وهیلاکی ڕێگا دەرەتانی ئەوەی بڕیوە جارێ بتوانم بگەمەوە دەفتەر،بەتایبەت لە

سایەی تێکۆشانی برادەرانی رادیۆ کاری رادیۆ لە سەر من پەکی نەکەوتوەو هیچ وەزیفەیەکی دیکەشم نیە.بەلاّم هەر کارێکی دیکەش لە هەر شوێنێک پێم بسپێرن، بەشاتازیەوە ئەنجامی دەدەم. لەگەڵ هەڵکەوتی دەرەتانیش بۆ دەفتەر دەگەڕێمەوە.

سەر کەوتنتان ئاواتە خوازم ٦١/٩/١١» کەریمی حسامی.

لە سەر داوای خەڵک رۆژی ١٩٨٢/١٢/١. لە مزگەوتی گەرگوڵ لە سەر هەڵوێستی کزەڵۆکی مەلایان سە بارەت بە بێدەنگیان لە ئاست جنایەتەکان رێژیم لە کوردستان و بلاّو کردنەوەی هێندێ خەبەری بەدرۆ ودەنگۆ، قسەم کردو داوام لە خەڵک کرد کە پێتر یارمەتی بەپێشمەرگەو هێزی بەرگری بکەن.

لەگەرگوڵ بووم،تاهیری کوڕی موساخانی زەرزا وحەیدەری کوڕی مەحمودی هەمزەئاشەوانی بەو بەفر وسەرمایە،پەیدا بوون. لە شنۆیەرا هاتبون، دەیانگوت:«دیپلۆمان وەرگرتوە، بۆ ئەوەی لە زانستگا وەرمانگرن دەبێ بچینە سەربازی، ئێمەش نامانەوێ سەربازی بکەین.هاتووین حیزب بمانێرێ بۆ دەرەوە دەرس بخوێنین.» گوتم چۆن شتی وادەبێ، ئێوە تازە دیپلۆمتان وەرگرتوە، هاتوون داوادەکەن حیزب بتان نێرێتەدەرێ، بخوێنن، لە کاتێکا سەدان لاوی دیپلۆمە ئەوە چەند ساڵە هاتوونەدەرێ و لە رێکخراوی لاوان ونێو حیزب و ئینتشاراتدا کاردەکەن، نۆرەیان وەبەر ناکەوێ بچن بخوێنن.ئەگەر ناتانەوێ بچنە سە ربازی، وەرنە نێو حیزب، کار بکەن، ئەگەر نۆرەتان هات،حیزب دەتانێرێ.پاشان گوتم من هیچم بەدەست نیە، بەلاّم جوابتان رەنگە هەر ئەوەبێ. هەر ئەو رۆژە گەڕانەوە بۆشنۆیە ، نازانم چی یان بەسە ر هات درنگتر بیستم کە لە ئوتریش دەخوێنن.

رۆژی ۱۲/۱۲/۹۸۲ لەگەڵ کاک وسێن کرمانجی چووسە گە رگوێلی سەری، بنکەی تەشکیلاتی نەغەدە. برادەرانی تەشکیلات زۆر بەخۆشی پێشوازیان کرد. دوای سێ رۆژان چوومە مەحمەشەو ناردم حوسێنی خوارزام هات. رۆژی جومعە لە نوێژی جومعەدا بەشداریم کرد و دوای تەواو بوونی جومعە، لە سەر سیاسەتی رژێم و پێویستی یارمەتی بەحیزب و پێشمەرگە وتارێکم دا. ۲۶/۱۲/۹۸۲ مەلامحەمدی خزری و سەعدون هاتنەلام، مەلامحمد ... ۲ تمەنی دامێ کە سەعات بکڕم، سەعاتی خۆم بەخشیبوو، بێ سەعات مابوومەوە. برادەرانی تەشکیلاتی نەغەدە بەڵێنیاندا کە نامیلکەی (مەسەلەی کورد لەپارلمانی سوید) چاپ بکەن. بەڵام کاغەزیان نەبوو. حوسێنی خوارزام ناردە گوندی زوڵمابات لای مەشهەدی برادەرم کە کاغەزم بۆ پەیداکا. مەشهەدی خۆی هات، ۲ بەستەکاغەز و سندوقێکی سێو هێنابوو، رۆژێکم لە کن گیربوو، گەڕایەوە. حاجی زاهیری کوری حاجی مەلاش چوو لە مەهاباد ٤ بەستەکاغەزی بۆ هێنام.

رۆژی ۳/۱/۹۸۳ لەگەڵ حاجی مەلای ڕەحمەتی و مەلامحەمدی عوسمانی وبرادەرانی پێشمەرگە چووینە گوندی مەمەلیان. سەرەخۆشی سەیدبرایمی کادری حیزب، دایکی عەمری خودای کردبوو. لە مەمەلیان بێجگە لە سەرەخۆشی بەدیداری دۆست وئاشناو جیرانی قەدیم شادبووم. لە مەمەڵیان لەسەر نێکۆشانی حیزبی دەرکرابووم، خەڵکی وێ لە جیرانەتی من بیرەوەری خۆشیان هەبوو. لە مزگەوت داوایان کرد کەلە سەر بارودۆخی وڵات و بزووتنەوە قسان بکەم، ناچار دەبوایە بە پێچەوانەی ئەمری مەلاعەوڵای حەیاکی بجزوومەوە. هەستام و ئەوەی دەمزانی و دەبوایە بیڵێم، پێشکێشم کرد.

۵/۱/۹۸۳ لەگەڵ ماموستا مەلامحمدی عوسمانی گەڕاینەوە بۆ

گەرگولی سە ر ی.٣ برادەری پیشمەرگە کاغەزەکانیان بەکۆڵی هەلگرت بۆ گەرگولی، بەچ زمانێک وبەکام پێنووس سوپاسیان بکەم نازانم.هەروەها سوپاسی برادەرانی تەشکیلاتی نەغەدە، کە بەخێرایی نامیلکەیان چاپکرد و کەوتەبەر دەستی خوێنەرانی بەرێزی کورد و باشیش فرۆشرا.

بەفر وسەرمایەکی سەخت وهاوتشینی برادەرانی تەشکیلاتیش کە لە من بێکارتر بوون، گەرم وخەمرەوێن‌بوو.سەردانی جاروباری مەلاقادری گەرگول و پێکەنینە سەیر وشیرینەکەی لەگەڵ قسە خۆ شەکانی و داوەتکردنی جاروباری کوردەواری تۆڵە ی سەرمای زستان وبێکاری دەکردەوە.

تەشکیلاتی نەغەدە بێجگەلە من میوانی دیکەشی هەبوون، مەحمودی ئەردەهالی، لەگەڵ دووسێ برادەری (چەپیخوار)ی ئازربایجانی هاتبوونە گەرگول ولەکن تەشکیلاتی نەغەدەگیرسابوونەوە ، بەناوی تێکۆشانی سیاسی، هەرچی کتێب و نووسراوە ونامیلکەی دژی سۆڤیێتی وەگیریان کەوتبوو لەگەڵ خۆیان هێنابوو.من سەبارەت بە دۆستایەتی و برایەتی لەگەڵ حەسەنی ئەردەهالی کەماوەیەک پێکەوەلە زیندان ببووین و لە لە سالەکانی.٧دا بەداخەوە کاتی گەڕانەوەی لە عیراقەوە، شەهید کرابوو، ڕێزێکی زۆرم‌لە مەحمودی دەگرت.

خێزانی مەحمودی ژنێکی خوێندەواری تێکۆشەر، لەگەڵ دوو منداڵی ٦ .٧ ساڵە تووشی ئەم دەربەدەریە ببوون. کە من چووم منداڵەکان نەخۆش بوون دایکیان لە ڕادە بەدەر نارەحەت و پەرێشان بوو. دوو ڕۆژ بوو پلەی گەرمای بەدەنیان دەچۆە سەرو ئارەقەیان دەکرد. حەب و شەربەتیان دابوونێ بەڵام فایدەی نەبوو. دایکیان دەهات و دەچوو هەراسان هاواری دەکرد. گوتم خانم من هێندێ دەرمانی زۆر باشم پێیە، بە تایبەت بۆ سەرما بوون وئەم جورە نەخۆشیانە. بەلام بۆیە دەتگم نەکردووە

دەرمانەکان هەموویان دەرمانی ولاتی سۆسیالیستین. خۆ مەحمودئاغاش دەرمانی ولاتی سۆسیالیستی نادا بە منداڵەکانی خۆی. خانم هاواری کرد و بە فارسی گوتی: «محمود غلط میکند، من بجەهایم میمیرند. تورا خودا آقای حیسامی، محمود غلط میکند». مەحمودیش گوتی: «کورە کاک کەریم جا وەختی ئەوەیە. ئەوەم بە گژدا دەکەی، برۆ دەرمانەکانی بۆ بینە».

گوتم: مەحمود چاک ٥٠٠گ.ر کەوترری دەرفەتە با بەخانم بە کوتانت دەم. تۆزێ بە گاڵتەمان رابواردو دەرمانەکانم بۆ هێنا. تۆزێک بوو دەبوایە لە ئاودا بیتوێنێتەوەو بیخۆنەوە. دەرمانەکانی بردن و رۆژی دوایی تازە لە خەو هەڵدەستاین دایکیان هات و بە خۆشی گوتی: «هاتوم سوپاست بکەم. منداڵەکان نیوەشەو داوای خواردنیان کرد شیرم دانێ نیستا هەستاونەوە». منیش زۆر خۆشحاڵ بووم و لەگەڵ مەحمود ئاغاش گاڵتەکەمان بەردەوام بوو.

رۆژی ١٩٨٣/١/١٢ کاک مراد کرمانجی شەهید لە دوام هات چووینەوە گەرکولی خواری. کاک رەحیمی محەمەدزادە لە پلینۆم گەرابۆوە، هێندێ باسی پلینۆم و وەزعی حیزبی بۆ کردین. هەرچەند من میوانی ماڵە کاک وسێن کرمانجی بووم، بەڵام شەو لە ماڵە کاک رەحیمی قەلێکمان لە عەرزی دا و شەونکی خۆشمان رابوارد. کاک رەحیم لە بارەی شێوەی خەباتی نهێنی و پێک هێنانی تەشکیلاتی نهێنی لە شارەکاندا پرسیاری زۆری کردن و باسێکی خۆشمان هەبوو. رۆژی ١٩٨٣/١/١٤ لەگەڵ کاک رەحیم و مراد کرمانجی چووینە کانی بداخ و لە سەر داوای رێکخراوی ناوچەو خەڵکی گوندی لە مزگەوت لە سەر باروودۆخی ولات و رەوتی بزوتنەوە قسەم بۆ خەڵک کرد. لە پر خەبەریان هێنا کە قادری عەبدی و سەید عەزیز هاتوونە گەرگول و چاوەروانی منن.

ئێمە شەو نەمانتوانی بچینەوە گەرگول، سبەی تا ئێمە گەیشتینێ ئەوان ڕۆیشتبوون و ئیتر هەر ئەو ڕۆیشتنە بوو نەمدیتنەوە. شەو لە مالی کاک ڕەحیمی محەمەدزادە میوان بووم. بەرپرسی تێکۆشانی نهێنی شاری شنۆ هاتبوو. لە بارەی شێوەی کاری نهێنی لە نێو شاردا ئەوەی دەمزانی ڕێنوێنیم کرد. ڕۆژی ١٩٨٣/١/١٦ برادەرانی تەشکیلاتی نەغەدە نامەیان بۆ ناردبووم کە بۆ دووی ڕێبەندان بچمە لای ئەوان لەگەرگولی سەرێ. ڕۆژی دوایی دەگەڵ کاک مرادی چووینە گەرگولی سەرێ. ڕۆژی دووی ڕێبەندان خەڵکی بەشەرەفی گەرگولێ وەک ڕۆژی جێژنەکانی ئایینی سفرەیان هێنا بۆ مزگەوت و بە خڕی بەشداریان کردبوو. مەلا قادری گەرگولێ ئەو پیاوە قسە خۆش و باشە تەواوی ڕۆژ لە مزگەوت نەبزوت. قوتابیەکان بەرنامەیەکی جوانیان بەرێوە برد. لە سەر گرنگی دامەزرانی کۆماری دیموکراتی کوردستان و ئەرکی ڕۆژی خەڵک وتارێکی دوورو درێژم پێشکەش کرد. نامەم بۆ کاک ڕەحیمی تووسی کە پێشمەرگەم بۆ ئامادە بکا تا بچمەوە دەفتەری سیاسی.

ڕۆژی ١٩٨٣/١/٢٣ پێشمەرگەی هێز هاتنە گەرگول دەبوایە بۆ دەفتەری سیاسی بچن. بڕیارمدا لەگەڵ ئەوان بڕۆم. شەو بەفرێکی زۆر باری و لە سەفەرەکەیان پەشیمان بوونەوە. ڕۆژی ١٩٨٣/١/٢٩ لەگەڵ چوار پێشمەرگە لە گەرگولەوە بەرەو ئالان کەوتمە ڕێ. بەفرێکی زۆرو زستانێکی سارد و تووش. برادەرانی گەرگولێ تا دەرەوەی گوندی بەرێیان کردم. بە تایبەت کاک مراد کرمانج پێیدا دەگرت کە بەو زستانە نەڕۆم و تا بەهارێ لەوێ بمێنمەوە. دەفتەری سیاسی تیلگرافی کردبوو کە بچمەوە دەفتەر. نیوەڕۆ لە کن کاک عەولای حەسەنزادە لامدا. زۆرم ئیسرار کرد کە لە مالێ دانەنیشێ و لە حیزبدا کار بکا. بە تایبەت تەشکیلاتی شنۆش داوایان لێ کردبوو کە لە کارو باری

ڕێکخراوەدا بەشدار بێ. لە گلەیی و ڕەخنەی بەجێ و قسەکانی دیار بوو کە ئامۆژگاریەکانی من فایدەیان نیەو ناتوانێ لە حیزبدا کار بکا. لە گوندی خوروونج لامدا، کراس و پانتۆلێکم بە درووندا، دوایە بۆیان ناردبومەوە دەفتەر. شەو چووینە گوندی گرداسێ. کە چووینە ڕێکخراو بێجگە لە کوڕێکی ١٣-١٤ ساڵە کەسی لێ نەبوو. هۆدەیەکی سارد کوڕەکە دەیگوت نەوت نیە، کادرو مەسئول لە گوندیدا بلاو ببوون و ئەو کوڕەشیان لەوێ دانابوو. چووینە ماڵی کەریم قەیتەرانی، باسی تا کرێ چەندیان ڕێز لێگرتین. ڕۆژی دوایی گەیشتینە گوندی تورژەلە، چووینە ماڵی کاک مستەفای ڕەمەزانی. ئەگەر هەموو بەرگی بیرەوەریەکانم بە سوپاس لە زەحمەت و جوامێری و فیداکاری ئەم خەلکە زەحمەتکێش و دلپاکە ڕەش کەمەوە هێشتا کەمم نووسیوەو ناتوانم هەقی خۆیان بدەمێ. لە ماڵی کاک مستەفا نەخۆش کەوتم. بەلام خزمەت و دلسۆزی ئەو ماڵە ئاوەدانە بێ درکتور دەرمان چاکیان کردمەوە. ڕۆژی دوایی چووینە گوندی میشە دێ، لە بنکەی پێشمەرگە لاماندا چایکمان خواردەوە ئەو پێشمەرگانەي لە گەرگولێ کاک ڕەحیم لەگەلی خستبووم، گوتیان: ئێمە بە پەلەین و دەبێ زووتر بگەینە برایم شێخالی. برایم شێخالی کوڕێکی لێهاتوی ژیرو خاوەن بڕوا، کوڕە جوتیارێکی هەلکەوتوو، لە ئالان بە فەرماندەی هێز لە هەوشار دیاری کرابوو. خەبەری دابوو لە هێزی ئەفشینەوە چوار پێشمەرگەی بۆ بنێرن کە خەلکی یەک ناوچەو ناسیارن و لەگەلٚ خۆی بیانباتە هەوشار. لای خۆی ئەوانە پێشمەرگەی شا ز بوون کە لەگەلٚ من هاتبوون. گوتیان دەبێ ئیجازە بدەی ئێمە دەڕۆین و بەجێت دێلین. گوتم: ئەگەر ئیجازە بە من بێ نابێ بڕۆن چونکە ئێوەیان لەگەلٚ من ناردوە. ئەگەر خۆشتان دەڕۆن خواتان لەگەلٚ. دەستیان دایە تفەنگان و ملی ڕێیان گرت. برادەرانی بنکەی میشەدێ دوو پێشمەرگەی

دیکەیان ساز کردو کەوتینە رێ شەو چووینە گوندی کانی خەلیل ماڵە خدر جوندی. رۆژی دوایی کەوتینە رێ نیوەرۆ لە گوندی گارگێ لە ماڵی مەلا مەحمودی لامان‌دا. مەلا مەحمود زۆری هەوڵدا کە گیر بین و نەرۆین. وانەوەستاین چوینە گوندی هەرمێ. ماڵە سەید رەسوی بابی گەورە لەوێ بوو. لە ماڵی سەید رەسوی لامدا، خۆی لە ماڵ نەبوو. ماوەیەک دانیشتین و حەساینەوەو شەو چووینە گوندی میرەسێ ماڵە عەولاغای. کاک سمایل و کاک هەمزە لە ماڵ بوون. رۆژی دوایش نەیانهێشت برۆین، دانیشتن و باس و حەسانەوەو میوانداریەکی شازی مەنگورانە.

رۆژی ١٩٨٣/١/٣٠ لە میرەسێ وەرێ کەوتین کاک هەمزەو دوو کەسی‌تریش لە کورەکانی وان لەگەڵمان هاتن. بەفرێکی زۆرو رێگایەکی ناخۆش و نەشکاو گەیشتینە گوندی کوران. برادەرانی لەگەڵم بوون دەگەران کە ماڵێکی حەسار گەورە بدۆزنەوەو لێی لادەین و نان‌و چایەک بخۆین. گەورە کچێک سەری لە پەنجەرەیەک هێنابوە دەرێ، لێم پرسی ئەرێ ئەو ژورەتان هیچی لێ راخراوە دەتوانین لادەین؟

– فەرموون، ماڵێ خۆتانە، وەتاخەو راخراوە. ئیتر هەموومان چووینە ژورێ. لە کوردەواری نەبێ لە کوێی دنیا خاوەن ماڵ بە دیتنی پێنج شەش میوان شاد و گەشکەدە بێ و بە رووخۆشی پێشوازیان لێ‌دە کا. کە چوومە ژوور بێ ئەوەی من خاوەن ماڵ بناسم، کابرا هەر راست بۆوەو گوتی: «ئەی.. خۆ ئەوە کاک کەریمە.» چووینە وەتاخێ. گورج سەماوەر هاتە ژوور، گوتیان مەلا حەسەنی رەستگارو سەید حەسەنی هاشمیش لێرەن و ئەوە لەماڵە فلان کەسن. گوتم لە دوایان بنێرن بێنە ئێرە. زۆری پێ نەچوو مەلا حەسەن و سەید حەسەن و مەلا رەسوڵ و سمکۆ پەیدا بوون. چاک و چۆنی و ماچ و بەخێر هێنان و دوای حەسانەوەو نانخواردن چووینە گوندی

کاولان کە رێکخراوی ناوچەی لێ بوو. سمکۆ ئەو دەم بەرپرسی رێکخراو بوو. رۆژی ١٩٨٣/٢/٤ چووینە گوندی کاولانی سەرێ ماڵی مەلا رەسولی پێشنماز. شەو سەرهەنگ قادری و چەکۆ و سمکۆ و سمایلی بایزیدیش هاتن. میوانداری ماڵی مەلا رەسوی وەک هەموو کاتێک لە کەبابی قەلەوە بگرە تا ویسکی هەموو شت بە پێی فیلان بوو. رۆژی دوایی گەراینەوە کاولان و یەک دوو رۆژ نەیانهێشت برۆم. کاولان ببووە بازاری ئەم ناوچەیەو ناوەندی سەوداو کرین و فرۆشی شتو مەکی گەرمێن و کوێستان. بێجگە لە رێکخراو قاچاخچی وڵاتیشی لێ کۆ ببۆوە. ئێمە لە کاولان بووین خەبەری شەهید بوونی خدرە سوری هات. یەکێک لە سەرلقە هەڵکەوتووەکانی پێشمەرگەی هێزی پێشەوا . سەرەخۆشیان لە کیتکەی دانابوو. سمکۆ گوتی:«دەبێ لەگەڵم بێی بۆ سەرەخۆشی». سوار بووین چووین. ناکرێ قەت لە بیر بچێتەوە کاتێک بابی هەستاو گوتی:«دوو کورم ماون شانازی دەکەم ئەگەر ئەوانیش لە رێگای کوردستاندا بچن». خدر کوری سێیەمی بوو کە شەهید دەکرا. من هەستام لەگەڵ سەرەخۆشی و سوپاسی ئیرادەو خۆراگری بابی خدرە سووری، لە سەر سیاسەتی دژی ئیسلامی رژیم قسەم کرد. دیارە سمکۆش وەک بەرپرسی رێکخراو وتارێکی‌دا و هێندێ قسەی جوانی کردن. دوایە برایانی پێشمەرگەی بنکە داوایان کرد بچمە لایان. لە سەر دەنگدانەوەی بزوتنەوەی کوردو سیاسەتی حیزبی دیموکرات گەلێکیان پرسیار کردو وڵامم دانەوە. دوای نیوەرۆ لەگەڵ سمکۆ گەراینەوە بۆ کاولان.

رۆژی ١٩٨٣/٢/٥ لەگەڵ کاک مەلا حەسەنی رەستگار بە ماشێن گەیاندیانینە کەڵەکاوێ. لەوێ ساک و جانتام دا بە برادەرێکی خەڵکی مەلا شێخی کە لە قاوەخانەی قولەسمۆرە بیاندا بە چایچی تا خۆم دەچم.

دوایە لەگەڵ مەلا حەسەنی دوو وڵاخمان پەیدا کردن سوار بووین تا لە هەورازی زمزیران سەرکەوتین. لەسەرەو ژێری دابەزین و بە پێیان داگەڕاینە خوارێ. مەلا حەسەن دەستی پێکرد لە بارەی ناتەواوی و کەم و کوری نێو حیزب و تەشکیلات. لام وایە ئەودەم خۆشی ئەندامی دەفتەری سیاسی بوو. پاشان هاتە سەر سیاسەتی حیزب لە بارەی بزوتنەوەو پێوەندیەکانی دەرەوە. مەلا حەسەن گوتی: «کاک کەریم هاتوومە سەر ئەو باوەڕە دوکتور قاسملو دەروەست(تعهد)یکی هەیە کە حیزب بۆلای رۆژئاوا بەرێ. هەموو کردەوەکانی وا ویدەچن و بە قسەش شتێکی دی دەلێ». گوتم باشە کومیتەی ناوەندی و دەفتەری سیاسی دەوری چیە؟ گوتی: «هەی هو خۆت نایانناسی». پاشان گوتی: «باشە تۆ لەو سەفەرەی دەرەوە کارێکت نەکرد، شتێکت هەڵنەکراند، ئەو تەواریشانە بۆ وا خۆیان گێل کردوە، کورە بە تەمای بەعس بین تێدا دەچین». گوتم: من سەفەری تایبەتیم کردوە. لە کاتی رۆیشتندا مەلا عەولا پێی گوتبووم: «برادەران گوتوویانە بە ناوی حیزب قسان نەکەم». روون بوو مەلا حەسەن چی دەگوت بەڵام لێ زیاد کردو گوتی: «چاکە چاک خۆت چت لێ هەڵگراندوە». دیار بوو مەلا حەسەن دەیزانی من سەفەری مۆسکۆم کردوە بەڵام دەری نەدەبری. تا گەیشتینە قاوەخانەی قولە سمۆرە باسێکی قوڵ و شیرنمان هەبوو. لە قاوەخانە چایمان خواردەوەو کیف و جانتامان وەرگرتەوەو کاروانچی سواری کردین لە گوندی جبەرەند لامانڕدا. تووشی مەلا حەسەنی شیوەسلێ بووین لەگەڵ پۆلێک پێشمەرگە. هەوایکی سارد، بەفر دەباری، پێشمەرگە وەپێشمان کەوتن لە چۆمی پەرینەوە لای نیوەشەو گەیشتینە گوندی هەڵوێ. رۆژی ١٩٨٣/٢/٧ وڵاخیان بۆ پەیدا کردین شەو هاتینە مەزرا. دوو رۆژ لە مەزرا لە لایەن برادەرانی رێکخراو مامەوە شەوانە بە جۆرابێن رامان دەبوارد. شورای گوندی دۆلەتو سێجار

نامەی بۆ رێکخراو نووسیبوو کە سەرباز چوونە گلەزەردە، بەڵام کەس جوابیشی نەدابوونەوە. رۆژی ١٩٨٣/٢/٩ لەگەڵ کاک کەریم حەداد چووینە قاسمە رەشی. دوکان و بازارێکی قەوخاو ئاوەدان و هەرچی ویستبات لێی وەگیر دەکەوت. لە وێوە چووینە گوندی وەردێ میوانی کاک سەعید کوێستانی بووین. کورەکانی دبکەی تەشکیلاتیش هاتبوون. داوایان کرد کە بچمە بنو خلێف و لە رێکخراو قسەیان بۆ بکەم. برادەرانی یەکیتی نیشتمانی هاتن، دانەیەکم لە نامیلکەی (مەسەلەی کورد لە پارلمانی سوید) بۆ مامجەلال نارد. رۆژی دوایی برادەرانی کومیتەی شارستانی سەردەشت ئەم نامەیەی خوارەوەیان بۆ ناردبووم.

«هاورێی خۆشەویستمان کاک کەریمی حیسامی.

پاش سلاوێکی گەرم هەر وەک قەرارمان بوو کە تەشریف بێنی بۆ بنکەو قسەمان بۆ بکەی. جا ئێستا لە سەر ئەو قەرارە چاوەروانیتان دەکەین. پێشەکی سوپاستان دەکەین. بە حورمەتەوە. لە لایەن برادەرانی کومیتەی شارستان. ک.ج ١٣٦١/١١/١٢»

دوای ئەو نامەیە ناچار شەو چوومە بنو خلێف کۆبوونەوەیەکی گەورەیان ساز کردبوو. بێجگە لە برادەرانی رێکخراوو پێشمەرگە خەڵکی گوندیش زۆریان بانگ کرابوون. لە سەر وەزعی سیاسی و درندەیی رژیم و سیاسەتی بەرگری حیزب و دەنگدانەوەی بزوتنەوەی کورد لە دەرەوە بە درێژی قسەم کرد. پرسیارێکی زۆریان لێکردم بە گوێرەی توانا ولامم دانەوە. رۆژی ١٩٨٣/٢/١٢ لە بنو خلێف-ەوە لە گەڵ دوو پێشمەرگان چوومە بێوران و میوانی حەمەدەمینی مەلا عەزیزی بووم. رێز و میوانداری باسی ناکرێ، چەند کەس لە کادری حیزبی و مامۆستای مەدرەسەکان لەوێ بوون. یەک دوو برادەری یەکیتی نیشتمانیش میوان بوون. شەوێکی پر باس و خۆشمان رابوارد. هەر یەکەی نامیلکەیەکیشم

بە دیاری پێشکێش کردن. بەیانی دوو پێشمەرگەی ساز کردو بە رێگایەکی هەورازو ناخۆشدا، بە پێش بنکەی پاسدارانندا لە قرچی تێپەرین و چووینە گوندی قەلەرەشە، پێتەختی کۆنی (عومەرپاشای سۆسنی). گوندێکی خۆش ئاوەدان، گوندێکی ١٥٠مالی. لە بنکەی پێشمەرگە لامانندا ویستم بچم سەری کوێخا عومەری بدەم. گوتیان فایدەی نیە. کەس ناناسێ و قسەکانی لە سەر یەک نین. زۆر پیر بووە. دوای نانخواردن لەگەڵ دوو پێشمەرگەی‌تر چوینە خوارێ بۆ رێکخراوی بازار لەم دۆلە ئەوەی سرنج راکێش بوو دارچنار بوو. لە قولایی دۆلی دەرماناوێ چنار بە بەرزایی چیا هەلچوبوون و لەگەڵ لوتکەی شاخ رکەبەریان کردبوو. لە رێکخراوی بازار برادەرێک بە ناوی سالحی حاجی حوسین خەلکی گوندی دەرماناوێ هاتە رێکخراو. هەروا قسەمان دەکرد گوتی: «من دەنگی تۆم لە رادیۆ بیستوە. شریتێکم هەیە دەنگی تۆیە لە مەهاباد قسە دەکەی. برادەرانی رێکخراو گوتیان ئەوە فلان کەسە. پێوە تووسا دەبێ بچینە مالی ئێمە. چووینە نێو گوندی ئەو پەری رێزو میواندارییان بەرێوە برد. کیژێکی پێنج شەش سالەی هەبوو بە ناوی تومری، هاتەوە سەرمای بوو رەش هەلگەرابوو، لێمان پرسی لە کوێ بووی؟ گوتی لە «لێنیشکە»ی بووم. من مات بووم: لێنیشکە! گوتم باشە ئەگەر بتانەوێ بچن لێنیشکەی بکەن دەلێن چی؟ گوتی: «دەلێن با بچینە: «لێنیشکێنێ» واتە: چاوگەکەشم دیتەوە. لێنیشکێن ئەوەیە کە دەچن لە هەورازێکی لە بەفرێ دەنیشن و دێنە خوارێ. لە دەفتەری یادداشتەکانم نووسیومەوە.

بەیانی رۆژی ١٩٨٣/٢/١٣ بە هەورازی بەقورێ گیراوی (زەرتکدا) وەسەر کەوتین بەلام چ وەسەر کەوتن، پشومان لێ برابوو. ئەمجار چوونە خواریشی لەم هەورازە ناخۆشتر بوو لە سەرکەوتن. دوای نیوەرۆ

گەیشتینە بیتووشێ. دوای سەفەرێکی حەوت مانگ و بیست و یەک رۆژ لە خوارەوەی بیتوشێ لە ئالان گەیشتمەوە دەفتەری سیاسی. کاتێک من رۆیشتبووم ناوەندی ح [illegible] ەولانەوە لەناوچەی مەهاباد بوو. ئێستا لە ناوچەی ئالان لە سنوری کوردستانی عیراق دەمدیتنەوە.

# پاشکۆ

گەلاڵەی (خود گەردانی) حکومەتی ئیسلامی ئیران کە لە ژمارەی رۆژی ١٩٧٩/١٢/٢.ی رۆژنامەی ئیتیلاعاتی چاپی تاراندا بلاو کراوەتەوە.

الف ـ حقوق : ١ ـ مەرزەبانی، سیاسەتی دەرەوە ، بازرگانی و گومرگ ، بەرنامەرێژی ئابووری سەرانسەری ، تەنزیعی بو دجەو مالیات ، پۆست وتێلگراف ، رێگای ئاسن و هەوایی ودەریایی ، سەنعەتی قورس و نەوت وگاز ، لە دەسەلاتی دەوڵەتی ناوەندی دادەبن.

تەواری کاروباری مەحەللی ، بەرنامەی ئاوەدانی ناوچە ، پەرەپێدانی ئابووری وکشت وکاڵ ، پەروەردەوفێر کردن ، دەرمان ولەشساخی ، رێگاو بان وخانوبەرەو ئاوەدانی ، چاپەمەنی و بلاو کردنەوە لەدەسەلاتی ناوچەی خودکەردان دادەبن.

٢ ـ کار بەدەستی ئیدارەکانی ناوچەی خودگەردان بە پێشنیاری شورای ناوچە و پەسند کردنی وەزارەتخانەکان لەخەڵکی ناوچەدەبن. بەلام ئەو کاربەدەستانەی کە ئەرکی کاروباری ناوەندی یان لە ئەستۆیە، بەپێشنیاری وەزارەت و پەسند کردنی شورای ناوچە دیاری دەکرێن. ئوستاندار وفەرماندار بەپێشنیاری وەزارەتی نێو خۆ و پەسند کردنی شورای ناوچە دیاری دەکرێن.

٣ ـ کارمەندی دادگاکان لەلایەن شورای ناوچەوە پێشنیار دەکرێن و پاش پەسند کردنی دەوڵەت دەست بەکار دەکەن. بە لام حوکمی دادگاکان لە

دیوانی بەرزی کیشوەر دا دەسکاری دەکرێنەوە.

هێزی ئینتزامی پۆلیسی شارو گوند لە خەڵکی ناوچە پێک دێت. سەرۆکی ژاندرمەری و شارەوانی بە پێشنیاری وەزارەتی نێو خۆ و پەسندی شورای ناوچە دیاری دەکرێن. کاروباری تری ناوچە وەک مارەو تەلاق و شەرع و داب و رەسمی ئابینی کە لە چوار چێوەی قانونی ئەساسی دەرنەچن لە دەسەلاتی شورای ناوچەی خود گەردان دادەبن.

ناوچەی خودگەردان هەقی هەیە جگە لەو بەشەی کە لە بودجەی گشتی وەریدەگرێ، لە ناوچەشدا مالیاتی پێویست وەرگرێ. لە دابەشکردنی بودجەی دەوڵتیدا، بەشی زیاتر بدرێ بە ناوچە دواکەوتوەکان بۆ ئاوەدانکردنەوەیان.

لە ناوچەی خودگەرداندا خوێندنی زمانی قەومی، وەک کوردی ،ئازەری و بلوچی لە کلاسی یەک هەوراز لەگەڵ زمانی فارسی دەبێ. نامە نووسین بەهەر تک زمانی ناوچەیی و فارسی رەسمی دەبن. بەلام نامەی نێوان ئیدارەکانی دەوڵتی بەفارسی دەبن.

لە هەر ناوچەیەکدا زانکۆیەکی زانست و فەننی دادەنرێ کە دەرسەکان بەزمانی فارسی دەبن. لقێکی کولتور و ئەدەبیات بە زمانی قەومەکانی ئیرانی دادەنرێ. لە زانستگای تارانیش کورسیەکی زمانی قەومەکانی ئیرانی دادەنرێ.

رادیۆ،تەلەڤیزیۆن لە هەموو ناوچەکان سەر بەمەرکەز دەبن. بەلام سەعاتی زیادیش بۆ بەرنامەی ناوچەکان دادەنرێ.چاپەمەنی و رۆژنامە بەزمانی مەحەللی ئازاد ولە دەسەلاتی ناوچەی خود گەردان دادەبن.

ب ـ ئەرکەکان:

١ ـ هەموو ناوچەکانی خود گەردان بۆ پاراستنی سەربەخۆیی و تەواویەتی خاکی ئیران و یەکێتی میللی ئیرانیەکان تێدەکۆشن.

٢ ـ ناوچەی خودگەردان بۆ یەکێتی میللی گشت قەومەکانی ئیرانی لە هەموو هۆکارێک وەک حیزب و رێکخراو وئەنجومەن کەلک وەردەگری. قانونی ئەساسی دەوڵت چاوەدێری دەکا ، کاربەدەستانی ناوچەی خودگەردان لە بەرا مبەر قانوندا بە بەر پرس دەناسێ. لە بارەی نەزم و فەرهەنگ و بارودۆخی ئابوری، دەوڵەتی ناوەندی ئاگادار دەکا.سەرباز دەدا بۆ خزمەتی لەشکری، بەڵام لە ناوچەی خودگەردان خزمەتی سەربازی دەکەن. ئەو پەری دەرەتان و کارسانایی بۆ هاتوروچۆی ئەرتەش و پێداویستیەکانی پێکدێنێ. »

پاش بڵاو کردنەوەی ئەم گەڵاڵەیە کومیتەی ناوەندی دوای لێکدانەوەو هەڵسەنگاندنی هاتە سەر ئەو باوەڕە کە لە راپۆرتی کومیتەی ناوەندی دا بۆ کۆنگرە بیروڕای خۆی لە سەر نێوەرۆکی گەڵا لە ی دەوڵەت دەربڕێ.

لە راپۆرتی کومیتەی ناوەندی دا بۆ کۆنگرەی چوار گوتراوە:

« کەم و کوری بنچینەیی ئەم گەڵاڵەیە لەوەدایە کە بوونی خەڵکە کانی ستەم لێکراوی ئیران و ستەمی نەتەوایەتی دانی پێدا نەهاتوە و بە ژێر لیچەوە کراوە. ئەم گەڵاڵەیە بە مەبەستی لابردنی ستەمی نەتەوایەتی لە بواری سیاسی و ئابوری وکولتوری پێشنیار نەکراوە، بەڵکوو مە بەستی ئەوەیە هێندێ دەسەڵاتی کاروباری نێو خۆ بدرێ بە ئوستانەکان. عەیبێکی دیکەی ئەم گەڵاڵەیە ئەوەیە کە ئیستیلاحی داهێنراو نامفهومی خودگەردانی لە جێی ئیستیلاحی مفهومی زانستی خودموختاری دادەنێ. دیارە لەم گەڵاڵەیەدا هێندێ خاڵی لە بار و بەلام تەنگەبەرکراو بەر چاو دەکەون. وەک : بە رەسمی ناسینی زمانی کوردی،ئەسپاردنی نەزمی نێو خۆ بە شوراکان. حیزبی ئێمە لە سەر ئەو باوەرەیە کە ئەم گەڵاڵەیە کاتێک دەتوانێ بکرێتە بناخەیەک بۆ وتووێژ، کە بە پشتیوانی گەڵاڵەی ٢٦ مادەیی دەستەی نوێنەرایەتی خەڵکی کورد

ئیسلاحاتێکی بنەرەتی تێدا بکرێ. حیزبی ئێمە لە سەر ئەو باوەڕەیە کە بە نیەتی پاک و بە بۆچوونی بەر پرسانە و دان نان بە مافی خودموختاری خەڵکی کوردستان،بە لێکدانەوەی هەرتک گەلاڵە دەکرێ بگەینە رێک کەوتن. ئێمە لامان وایە رێک کەوتنێکی ئەوتۆ پێویستە لە سەر ئەم ئەسلانەی خوارەوە دامەزرێ :

١ - خەڵکی کوردستان لە چوارچێوەی سەر بەخۆیی و تەواویەتی عەرزی وڵاتی کۆماری ئیسلامی دا مافی نەتەوایەتی خۆی بە شکڵی خودموختاری وەردەگرێ و ئەو مافەش لە موتەممەمی قانونی ئەساسی دا تومار دەکرێ.

٢ - کوردستانی ئێران هەموو ئەو ناوچانە دەگرێتەوە کە زۆریەی دانیشتوانی کوردن.

٣ - کوردستانی خودموختار خاوەنی شورایەکی سەرانسەریە کە بە هەڵبژاردنی نهێنی راستە خۆ هەڵدەبژێردرێ و دادەمەزرێ.

٤ - شورای سەرانسەری کوردستان دەستەی ڕاپەڕاندن(هیات اجرائی) بۆبەرێوە بردنی کاروباری ئابوری و ئیداری و کۆمەڵایەتی و کولتوری و ئینتزامی نێو خۆ هەڵدەبژێرێ.

٥ - زمانی کوردی لە کوردستاندا بە رەسمی دەناسرێ.نامە نووسین لە نێوان ئیدارەکانی ناوچەو دەولەتی و ناوچەکانی دیکەی وڵات دا بە زمانی فارسی دەبێ.لە قوتابخانە سەرە تاییەکاندا خوێندن بە زمانی کوردی دەبێ.دوای ساڵی چوارەمی سەرەتایی بە فارسیش دە خوێنرێ.لە پۆلی ناوەنجی و خوێندنی بە رزدا هێندێ لە دەرسەکان بە زمانی کوردی دەبن .

٦ - بەرێوە بردنی تەواوی کاروباری ئینتزامی بە دەست ئورگانەکانی خودموختار دەبێ و ئەرتەش نابێ دەست لەو کارانە وەربدا.

حیزبی ئێمە لەسەر ئەو باوەڕەیە کە لە چوار چێوەی کۆماری ئیسلامیدا

گوڵجاندنی ئەم ئەسڵگەلەی سەرەوە دەرەتانی تەواوی هەیە و نەک هە ر لە گەڵ تەواویەتی عەرزی ئێران ناتەبایی نیە، بەڵکوو دەبێتە هۆی پتەو بوونی بناخەی یەکێتی خەڵکەکانی ئێران و سەر بە خۆیی نیشتمانی ئێمەو مەسەلەی کوردستانیش چارە سەر دەکا .»

ئەو بەشەی بیرەوەریەکانم لێرەدا کۆتایی پێدێنم و ئەگەر تەمەن مەودا بدا لە بەرگی هەشتەم دا خوێنەری بە رێزی کورد لە گەڵ بەشێکی دیکە لە ڕووداوەکانی بزووتنەوەی کورد و ژیانی ئاوارەیی و خەباتی سیاسی و فەرهەنگی لە دەرەوەی وڵات شارەزا دەکەم.

## بەرهەمە کانی نووسەر

١ - کاروانێک لە شەهیدانی کوردستانی ئێران
٢ - وەلامێک کوردی و فارسی
٣ - لە دەوری رێکخراوی لاوانی حیزبی دیموکرات کۆ بینەوە
٤ - رەخنە لە سەر کتێبی حوسێنی مەدەنی
٥ - رێنوێنی شەری پارتیزانی
٦ - چەند قسەیەک لە گەڵ ( خەبات)
٧ - کورد و فەرهەنگی بێگانە
٨ - لێکۆڵینەوەی « کورتە باسێک لە سەر سوسیالیزم» کوردی و فارسی
٩ - تایبەتی کونگرەی شەشەم
١٠ - کۆماری دیموکراتی کوردستان یا خود موختاری ؟
١١ - یادی هێمن
١٢ - لە پێناو چی دا ؟
١٣ - یادانەوە
١٤ - کڕ و کاش
١٥ - لە بیرەوەریەکانم : بەرگی ١، ٢، ٣، ٤، ٥، ٦، ٧،

## ئەو بەرهەمانەی نووسەر کردونی بە کوردی

١ - دایک -- ماکسیم گورگ
٢ - ژیان و کردەوەکانی لینین
٣ - ئەفسانە کوردی‌یەکان - رودینکو
٤ - زەوی پچوک - برێژنێف
٥ - مەسەلەی کورد لە پارلمانی سوید
٦ - کۆمەلە چیرۆکێکی هەلبژاردە لە ئەدەبی بێگانە
٧ - یاسای بنچینەیی ئابوری سوسیالیستی

٨ - حەمە چکۆڵ ( ئینجە مە مە د ) یاشار کەماڵ
٩ - ئوسولی سەرە تایەکانی فەلسەفە - ژۆرژ پولستیر
١٠ - نامەی گوللە باران کراوەکان
١١ - ئازادی یا مەرگ - کازانتزاکیس
١٢ - رەوشی کوردان - مێژووی بابان و ئەردەلان

## بیرخەرەوەیەک

لەگەڵ داوای لێبووردن لە خوێنەرانی بەڕێز
تەواوی نامە و دۆکومێنتە دەستخەتەکان کە لە نێو
کتێبەکە دانووسراونەوە، بۆ چاپ بە پاشکۆی کتێبە
کەوە لکێنرابوون. بەداخەوە چاپخانە بە بیانووی
ئەوەی کە دەرناچن (وگویا کاری خۆیان عەیبدار
ناکەن) وەلای نان و بە ناچاری بێ ئەسڵی نامە و
دەستخەتەکان بەرگی حەوتی بیرەوەریەکانم بڵاو
دەبێتەوە. بەو هیوایە بەرگی هەشتەم بە پوختتری
بە شێکڵی دیکەی ڕووداوەکانی کوردستان و
ژیان و تێکۆشانی نووسەر لە دەربەدەریدا
ڕوون کاتەوە.

کەریم حسامی
سێپتامبری ١٩٩٢